# دیوانی

# خانای قوبادی



کۆکردنەوە و لێکۆڵینەوەی
کاروان عوسمان خەیات (ڕێبین)

پێداچوونەوەی
ئیدریس عومەر مەحموود

٢٠١٦

دیوانی

# خانای قوبادی



کۆکردنەوە و لێکۆڵینەوەی

**کاروان عوسمان خەیات (ڕێبین)**

پێداچوونەوەی

**ئیدریس عومەر مەحموود**

٢٠١٦

سرشناسه : عثمان خیاط، کاروان، ۱۹۸۶ - م.
عنوان و نام پدیدآور : دیوانی خانای قوبادی/ کوکردنەوە و لیکولینەوەی کاروان عوسمان خەیات (ریبین)؛ پیداچوونەوەی ئیدریس عومەر مەحموود.
مشخصات نشر : سنندج: شوان، ۱۳۹۴.
مشخصات ظاهری : ٥٦٠ ص.
شابک : ۹۷۸-٦۰۰-٥۹٤١٦-۰-۷
وضعیت فهرست نویسی: فیپا
یادداشت : کردی.
موضوع : خانای قبادی، قرن ۱۲ق -- نقد و تفسیر
موضوع : شعر کردی -- قرن ۱۲ق. -- تاریخ و نقد
شناسه افزوده : محمود، ادریس عمر، ۱۹۸۴ - م.
رده بندی کنگره : ۱۳۹۴ ۲۳ع۲۴۳آ/۳۲۵۶PIR
رده بندی دیویی : ۹/۲۱فا۸

نشر شوان

**ناسنامەی کتێب**

**ناوی کتێب:** دیوانی خانای قوبادی

**کۆکردنەوە و لێکۆڵینەوەی:** کاروان عوسمان خەیات (رێبین)

**پێداچوونەوەی:** ئیدریس عومەر مەحموود

**بەرگ:** شا ریکلام

**تایپ و نەخشەسازی:** کاروان عوسمان خەیات (رێبین)

**پێداچوونەوەی رێنووس:** جوتیار نەریمان

**وێنەی رووبەرگ:** بەدیع باباجان

**تیراژ:** ۲۰۰۰ دانە

**نرخ:** ۱۲۰۰۰ دیناری عێراقی

**نرخ:** ۳۰۰۰۰ تومان

**چاپ:** یەکەم ۲۰۱٦

**ژمارەی سپاردن: لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردن (۱۱۱۰)ی ساڵی (۲۰۱٦)ی پێدراوە**



**بڵاوکار: ئێران، سنە، شەقامی شوهەدا، کتێبفرۆشی نیشتمان، تەلەفوون:**

**+۹۸۸۷ ۳۳ ۱۷ ۲۱ ۱۱٥    +۹۸۸۷ ۳۳ ۱۷ ٥٥ ۲۱۰**

## پێشکەشە بە :

دایک و باوک و خوشك و براکانم؛

هاوسۆز و خۆشەویستم؛

هاودەنگ و هاوڕێیانم؛

ئەوانەی لە پێناوی وشەی کوردیدا خوێنی خۆیان بەخشی؛

گەل و نیشتمانم؛

ئەو خۆشەویستانەی وشەی خۆشەویستی کوردییان لەلام خۆشەویستتر کردووە.

# ناوەرۆك

# سوپاس و پێزانین

سوپاس و پێزانینی تایبەتیمان بۆ کاک سالّح سلێمان، سەرۆکهۆزی قوبادییەکان و نەوەکانی، بە تایبەتی کاک جەمالی کوڕی، لە دوای ئەوەی "بەشێك لە دیوانی خانای قوبادی" کەوتە بەردەستی خوێنەران، ئەم پیاوە هەمیشە لە ڕووی ماددی و مەعنەوییەوە لە خەمی خانادا بووە و هاوکاریی پرۆسەکەی کردووە. لە هەر جێگەیەکدا وشەیەك، بەلّگە و کاغەزێکی لەسەر قوبادییەکان و خانا و نەوەکانی بەرچاو کەوتبێت، بەدەستی خستووە و نوسخەیەکی بۆمان ناردووە. سوپاسی تایبەتی دەکەم و هیوادارم خوای گەورە نموونەیان زیاد بکات.

# کورتکراوەکان

لەم دیوانەی خانای قوبادیدا هەنگاوێك پەیڕەو کراوە، ئەویش لێکدان و بەراوردکردنی چەند شیعرێکە لە چەند سەرچاوەیەکی جیاوازدا، بۆیە بەپێویستم زانیوە کە ناوەکان کورت بکەمەوە و ناوی کەسەکان یان سەرچاوەکە بە کورتکراوەیی بنووسم، ئەو سەرچاوانەیش بریتین لەمانەی خوارەوە:

| ناوی نووسەر یان سەرچاوە | کورتکراوەکەی |
|---|---|
| موحەممەد عەلی قەرەداغی | مع |
| کەشکۆڵی شێخ عەبدولمۆئمین | شع |
| گوڵزاری کوردستان | گوڵ |
| مناجاتهای جاویدان ادب کردی | مونا |
| کەشکۆڵی هەردەوێڵ کاکەیی | هرد |
| مامۆستا عوسمان هەورامی | هەور |
| مامۆستا کەمال نووری مەعرووف | کم |
| موحەممەد ڕەشید ئەمینی- پاوە | مپ |
| نەجمەدین مەلا | نج |
| ئیبراهیم باجەلان و هەردەوێڵ کاکەیی | بر و هر |
| حاجی میرزا موحەممەدی سەقەتی | مح |
| ڕۆژنامەی ژین | ژی |
| حەدیقەی سوڵتانی | حد |

# پێشەکی

ئەگەر چاوێك بە مێژووی ئەدەبی کوردیدا بخشێنین و بە چاوێکی بێلایەنانە و بێ میللیگەرایی لە زمان و ئەدەبیاتی کوردی بڕوانین، هەر وەکو چۆن یەکێك لە ڕۆژهەڵاتناسەکان دەڵێت: کورد هەموو شاعیرن. بڕوام وایە ئەمە زۆر لە ڕاستییەوە نزیکە، چونکە پاراویی وشەی کوردی و ئەو ئاواز و موسیقا و کێش و سەروا و بڕگانەی لە وشەی کوردیدا بە سەرجەم شێوەزارەکانەوە دەبینرێت، لە کەم زماندا هەیە، هەر بۆیە خانای قوبادی دەڵێت:

**ڕاستەن مەواچان فارسی شەککەرەن**
**کوردی جە فارسی بەڵ شیرینتەرەن**

ئەوە زۆر ڕاستە زمانی فارسی زۆر شیرینە و خاوەنی وشەگەلی زۆر جوان و ناسکە، شیعری بەرز و شیرین بەو زمانە نووسراوە، بەڵام ئەوەی خانا هەستی پێ کردووە ئەوە بووە، زمانی کوردی بە گشتی لە ڕووی ئاواز و فۆنەتیك و لایەنەکانی زمانەوە هەرچۆنێك لێیی بڕوانیت و بتەوێت کشی بێنیت، وەکو هەویرێکی بەپێز وایە و هەر جۆرە شیرینی و نانێکت بوێت دەتوانیت لێی دروست بکەیت.

لە ساڵانی حەفتادا کاتێك خوسرەو و شیرینی خانای قوبادی لە قەبارەیەکی گەورەدا کەوتە بەر دیدەی خوێنەران، چەند نووسەرێکی ئەو کاتە لەوانە مامۆستا هێمن موکریانی بابەتیان لەسەر نووسی و بڵاویان کردەوە، ئەمە زیاتر بووە هۆی ناساندنی خانا و دوابەدوای ئەوە، تاکوتەرا هۆنراوە و داستانەکانی خانا دەردەکەوتن و لە ڕۆژنامە و گۆڤارەکانی ئەو دەمەدا بڵاو دەکرانەوە. ناکرێ ئەوەیش لەبیر بکەین کە پێش ئەوان کەسانی وەکو پیرەمێرد، گیوی موکریانی و حوسێن و حوزنی، هەروەها ڕۆژنامەی کوردستانی ساڵانی شەست،

تاکوتەرا بابەتیان لەبارەوە نووسیوە، بەڵام زیاتر لە نیوەی دووەمی ساڵانی حەفتا بە دواوە زیاتر ناوی خانا کەوتە ناوانەوە.

لێرەدا دەمەوێت ئەوە بڵێم پرش و بڵاویی شیعرەکانی خانا و بێنازیی دیوانەکەی، وای لە من کرد کە هەوڵی کۆکردنەوەی تەواوی هۆنراوەکانی بدەم و کاتێکی زۆری بۆ تەرخان بکەم، لە هەمان کاتیشدا هەندێك لە دۆستانم چەند جارێك ئەوەیان پێ ڕاگەیاندووم کە کارکردن لەسەر ئەم شاعیرە بە هەر شێوەیەك بێت سەختە و ماوەیەکی دوور و درێژ و کاتێکی زۆری دەوێت، بەڵام بێ گوێدانە ئەو ماندووبوونە و ئەو ماوە زۆرەی پێوەی سەرقاڵ بووم، توانیومە ئەنجامێك بەدەست بهێنم، کە جێی دڵخۆشیی هەموو لایەك بێت. ئەم دیوانە پێشتر بە ناوی "بەشێك لە دیوانی خانای قوبادی" بڵاوکرایەوە. لەبەر ئەوەی هەندێك هەڵە و کەموکورتیی تێدابوو، هەروەها چەندین بەڵگەنامە و شیعری تری خانا هەن لە دیوانەکەدا نەبوون. دوای ئەوەی بە دەستمان گەیشتن، بە هەوڵ و تەقەلای ئەو دڵسۆزانەی لە خەمی دیوانەکەدا بوون، بەباشمان زانی جارێکی تر دیوانی خانا بە شێوەیەکی ڕێکوپێك بڵاو بکەینەوە.

کارکردن لەم دیوانەدا بە چەند بەش و شێوەیەك بووە و هەر بەشێکیش تایبەتمەندیی خۆی هەیە:

جگە لەوەی هەموو ئەو بەڵگەنامە و دەستنووس و کەشکۆڵ و لاپەڕە تاکوتەرایانەی لەملا و لەولا دەستمان کەوتووە، هەندێك سەرچاوەی زارەکی و نووسراویشمان بە دەست هێناوە کە لە جێگا و کاتی خۆیدا سوودیان لێ وەرگیراوە.

لەم دیوانەدا بۆ ڕاستکردنەوەی ناوی خانا و ژیاننامەکەی، سوود لە سەرجەم ئەو نووسین و وتراوانە وەرگیراوە کە دەستمان کەوتوون، هەر یەکەیان لە جێگەی خۆیدا بە ئاماژەوە خراوەتە ڕوو. هەر لە سەرەتاوە تەواوی کەشکۆڵ و دەستنووسەکان ناوی کورتکراوەیان بۆ دانراوە. ناوی خانایش لەم دیوانەدا بە پشتبەستن بە کەشکۆڵ و

بەڵگەنامەکانی سەردەمی ژیانی خۆی و دوای خۆی پشت ڕاست کراوەتەوە و ڕوون کراوەتەوە کە خانا ناوی چییە و کوڕی کێیە و لە چ هۆزێکە. خانا لە چەند شوێنێکدا بە جوانی لەسەر ناسناوی خۆی و بنەماڵە و هاوڕێ و مەعشووق و کارەکانی خۆی دوواوە، هەر هەموو ئەوانە بۆ ساخکردنەوەی لایەنە شاراوەکان کەڵکیان لێ وەرگیراوە، هەندێك جاریش بۆ ژیاننامەی شاعیر گەڕاوینەتەوە بۆ داستانە شیعرییەکانی خانا خۆی و لەوێدا هەندێك زانیاریی بەکەڵکمان وەرگرتووە.

هەر لەم دیوانەدا باسی هاوڕێکانی خانا و مەعشووق و بەرهەمەکانی خانا خراوەتە ڕوو، جگە لەوەیش باسی تەکفیرکردنی خانا، مەزهەبی خانا و بەندکردنیشی کراوە و هەموو ئەوانە بە بەڵگەوە خراونەتە ڕوو.

ئەو دەستنووس و شیعرانەی دەستمان کەوتوون، هەموویان بەراورد کراون و لە پەراوێزدا خراونەتە ڕوو، هەڵبەتە هەندێك هۆنراوە هەن تەنها یەك نوسخەمان لێیان دەست کەوتووە، ئەو نوسخانەیش یان ناتەواو بوون، یان نووسەرەوەکانیان کۆلکە خوێنەوار بوون، بۆیە لە هەندێك جێگادا بڕگە زیاد کراوە یان کەم کراوە، یاخود لەنگی لە چەند نیوەبەیتێکدا بە ڕوونی دیارە. ئێمە ناچار بووین ئەو شیعرانە بەبێ دەستکاری لە دیوانەکەدا چاپیان بکەین. دەستکارینەکردنیان تەنها لەبەر ئەوە بووە کە تەنیا یەك نوسخەمان لە بەردەست بووە. هەندێك جار ئەو کێشانە ڕێگەی ئەوەیان تێدا بووە بە ئاسانی چارەسەر بکرێن، ئێمەیش بەپێی توانای خۆمان گرفتەکەمان چارەسەر کردووە، هەندێك کات چەند نوسخەیەکمان لە بەردەست بووە، بەڵام بە هەموویانەوە هۆنراوەیەکی بێکەموکورتیی لێ دەرنەهاتووە. بۆ ئەم جۆرەیان دەبێ چاوەڕوانی نوسخەی تر بکەین تا ئەو کێشانە چارەسەر بکرێن.

خانا وەکو شاعیرێکی لێهاتوو یەکێکە لەو شاعیرانەی تیلنیشان و وەرگێراو و تێهەڵکێشی زۆر بەکار هێناوە، ئێمەیش بۆ دەرخستنی ئەو لایەنانە پەراوێزێکی زۆرمان داناوە.

خانا جگە لە شیعری کوردی، شیعری عەرەبی و فارسییشی هەیە، ئەو شیعرە عەرەبی و فارسییانەیش وەکو بەشیك لە دیوانەکە هێنراون. کارێکی تر لەم دیوانەدا کاری فەرهەنگۆکە، تیایدا هەوڵمان داوە بەشێك لەو وشانەی دیوانی خانا دەربهێنین و مانایان لێك بدەینەوە، لەگەڵ ئەوەیشدا ئەوە ڕوون کراوەتەوە کە وشەکە سەر بە چ زمانێکە، پێویستە ئەوەیش بخەینە ڕوو کە لە هەندێك جێگەدا دوو نیشانە دانراوە بۆ ئەو وشانەی هاوبەشن.

لە کۆتاییشدا وێنەی بەشێك لەو دەستنووس و بەڵگەنامانە خراوەتە ڕوو، هەروەها ئەو سەرچاوانەیش کە سوودیان لێ بینراوە، هەموویان خراونەتە ڕوو. هیوادارم ئەو هەوڵ و ماندوبوونەی لەم دیوانەدا دراوە، جێگای بایەخ بێت و نرخی ئەوەی هەبێت لە ئاست کەسێکی وەکو خانای قوبادیدا بێت کە خاوەنی ئەو هەموو شاکارە گەورەیەیە. بەو هیوایەی لە داهاتوودا کاری گەورەتر بۆ ئەم شاعیرە گەورەیە ئەنجام بدەین و ئەو بەرهەمەیش لە ناو زمان و ئەدەبیاتی کوردییدا جێگای خۆی بگرێت و وەکو سەرچاوەیەکی باوەڕپێکراوە سوودی لێ وەربگیرێت. لە کۆتاییدا دەڵێم لە کەموکورتیمان ببورن، بەو هیوایەی لە داهاتوودا قەرەبووی هەر کەمتەرخەمییەك بکەمەوە کە لەم دیوانەدا هەبێت و بەرچاو بکەوێت.

کاروان عوسمان خەیات (ڕێبین)

تاران/ ٥-١٢-٢٠١٥

# خانای قوبادی

## لە نێوان پەیامی سیاسی و پەیامی کولتووریدا[1]

**مامۆستا جەعفەر**

### بەرهەمی زۆر و بایەخپێدانی کەم

خانای قوبادی، یەکێکە لە شاعیرە گەورەکانی گەلی کوردستان کە لە سەدەی هەژدەیەمی زاینیدا ژیاوە. ئەو ئەگەرچی لەناو شاعیرە کلاسیکییەکاندا، پڕبەرهەمترین شاعیر و وەرگێڕ و نووسەرەوەی "شیرین و خوسرەو"[(1)] و "یوسف و زلێخا"[(2)] و "لەیلا و مەجنوون"[(3)] و "سوڵتان ئیبراهیم و نۆش ئافەرین"[(4)] و... هتد، بەڵام مەخابن زانیاریی ئێمە، دەربارەی ژیان و سەردەم و بەسەرهات و شێوەی بیرکردنەوە و جیهانبینیی ئەم شاعیرە مەزنە، هەر زۆر کەم و پەرشوبڵاو و نازانستییە. هەر بۆ نموونە: ئێمە تەنانەت ساڵی لەدایکبوون و کۆچی دوایی نازانین، هەروەها بە دڵنیاییەوە ئەوەش نازانین ئایا ژنی هێناوە، یان ڕەبەن و بێخێزان و ماڵ و باڵ بووە؟

ئێمە ئەگەر دەربارەی مێژووی ژیان و سەردەمی شاعیر، هیچ بەڵگە و دۆکۆمێنتێکی ئەوتۆمان بە دەستەوە نەبێت کە ڕاستەوخۆ تیشک بخەنە سەر هەندێك لاپەڕەی نەزانراوی ژیان و بەسەرهاتی ئەو، ئەوە دەبێ ڕێگایەکی تر بدۆزینەوە و سەرلەنوێ کێوماڵی کتێبخانە گشتی و تایبەتەکانی تاران و کرماشان و سنە بکەین و هەر سەرنج و تێبینییەك لەسەر "خانا" یان یەکێك هاوڕێکانی تۆمار کرابوو، ئەوە کۆبکرێتەوە. سەرچاوەیەکی تری زانیاری لەسەر بیر و جیهانبینیی "خانا" بەرهەمە ئەدەبییەکانی خۆیەتی کە زانیاری و ئاماژەی پەرشوبڵاو و ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆی تێدا کۆکراوەتەوە. ئەو کاتێك

---

[1]. ئەم بابەتەی بەڕێز مامۆستا جەعفەر لەبەر ئەوەی بابەتێکی گرنگ و بەبایەخ بوو، دوای پرسوڕا بە بەڕێزیان، ڕێگەی پێداین وەکو پێشەکیی ئەم کتێبە بڵاوی بکەینەوە. (ئامادەکار)

شاکارەکانی نیزامیی وەرگێڕاوە، لە زۆر شوێندا پەراوێزێکی بۆ خۆی جێ هێشتووە و بە مافی خۆی زانیوە لە هەگبەی ڕۆژگاری خۆیەوە، چەند بەیتێك بهۆنێتەوە و لەگەڵ شیعرەکانی شاعیری مەزنی گەنجەدا تێکهەڵکێشی بکات.

چەند مانگێك لەمەو پێش، نووسەری چالاك و لاو، کاروان عوسمان خەیات (ڕێبین)[٥] بەشێك لە دیوانی "خانای قوبادی"ی بڵاوکردەوە و ئەم کارەی کاکە ڕێبین سەرەڕای ماندووبوونی زۆر و دۆزینەوەی چەندین شیعری بڵاونەکراوەی شاعیر، بەڵام هێشتا بابەتەکە تێر نەبووە و پرسیارە بنچینەییەکان وەڵام نەدراونەتەوە. کاك ڕێبین و کاك ڕێبینەکانی تر، تا هەوڵێکی باشتر و بەرفراوانتر و قووڵتر نەدەن بۆ بڵاوکردنەوەی بەشە بڵاونەکراوەکانی تری دیوانی شاعیر، ئێمە بە دەوری تەوەرەکانی گومان و دڵنیانەبوونەوە هەر گێژ دەخۆین.

گریمان نووسەر و لێکۆڵیارانی ئەمڕۆ و سبەی لە گەشتی گەڕان و پشکنیندا بەناو مەلۆ و شارا و خەرمانی بەرهەمەکانیدا بەخت یاریان نەبوو و هیچی نوێیان چنگ نەکەوت، ئایا دەبێ هەروا دەستەوئەژنۆ بە دیار پرسیارە بزێوەکانەوە دانیشن و چاوەڕوانی بارانی ڕەحمەت بکەن؟

بێگومان ئێمە شانبەشانی گەڕان و پشکنین و هەڵکۆڵین، هەڵگەڕان و داگەڕان، دەبێ سەدان جاری تر تێکستە بڵاوکراوەکان بخوێنینەوە و نێوان دێرە نەنووسراوەکان بە ڕوونی ببینین و بزانین شاعیر لە قووڵاییی دڵەوە، لە ڕێگەی بەکارهێنانی "ڕەمز" و "ئاماژە" و "میتافە"وە چۆن ویستوویەتی پەیامی خۆیمان پێ بگەیەنێت؟

**شیرین و خوسرەو**

بەشێك لە نووسەر و مێژوونووس و لێکۆڵیاران پێیان باشە لە گشتەوە بۆ پشك بڕۆن، بەشێکی تریان پێیان باشە لە پشکەوە بۆ گشت بڕۆن. ڕاستە تا ئێستا سێ بەرهەمی وەرگێڕان و ڕۆمانە شیعرێك و بەشێك لە دیوانی "خانای قوبادی" بڵاوکراونەتەوە بەڵام بەخت یار نەبووە بەشێکی تر لە کارەکانی، ڕێگەی خۆیان بۆ دونیای چاپ و بڵاوبوونەوە

بدۆزنەوە، بەڵام کارکردن لەسەر "گشت" و هەموو بەرهەمەکان بەو ئاسانی و سادەییە نییە، چونکە هەر هەموو بەرهەم و کار و ژیاننامەی شاعیرمان لە بەردەستدا نییە و ئێمە هێشتا لە سەرەتای پرۆژەی دۆزینەوە و بڵاوکردنەوەی کارە ئەدەبییەکانی شاعیرین.

ئێمە لەبەر کۆمەڵێك "هۆ" و تەکنیکی کار و نووسین دەربارەی شێوازی بیرکردنەوە و تێگەیشتن و ئاستی ڕووناکبیری و جیهانی شاعیر، یەکێك لە بەرهەمەکانی شاعیرمان وەکو نموونە هەڵبژارد، ئەویش ڕۆمانە شیعری "شیرین و خوسرەو"ە. ئەم کارە ساڵی نووسینی تۆمار کراوە و چەند جارێك بڵاوکراوەتەوە و ژمارەیەك دەستنووسی لە کتێبخانەکانی کوردستان و ئێران و ئەورووپا دەست دەکەوێت.

ڕەنگە لەچاو کارەکانی تری "خانا"دا کەمترین دەستکاری کرابێت لە لایەن ناسیخەکانەوە، ئەوەش لایەنێکی پۆزەتیڤ و دڵنیاکەرەوەیە تا ئەو ڕۆژەی کۆنترین تێکستی شاعیرمان دەست دەکەوێت.

### ساڵی نووسینی ڕۆمانە شیعرییەکە

ڕاستە زانیاری لەسەر ژیاننامەی شاعیر دەگمەن و کرێن و قاقڕە و بە هەر لایەکدا پەل بهاوێژرێت، هیچ پووش و پەڵاشێك لە دەمەداسی لێکۆڵیار گیرنابێت، بەڵام سەر لاپەڕەکانی "شیرین و خوسرەو" لێوانلێوە لە زانیاری لەسەر شاعیر و شێوەی بیرکردنەوە و تێگەیشتنی ئەو. هەر بۆ نموونە: خانای قوبادی لەسەر هەمان ڕێچکەی شاعیرانی کلاسیك ساڵ و مانگی نووسینەوەی "شیرین و خوسرەو"ی بە شیعر نووسیوە:

ئــــەو ڕۆ کــــە خــــامەی عەنبەر شەمامە
وەش بۆ کــــەرد چە موشك ئینشای ئەی نامە
تــــــــەئریخ هیجــرت (ختم المرسلــین)
موتیع دیــوان شــــەرح شــــەرع و دین

رۆژی دووشـــەمـــــە بی (ذی حجــە الحــرام)
هەزار و پــــــەنجا و یـــەکسەد و سێ تـــەمام

شاعیر بە نووسینی ساڵی وەرگێڕان، یان نووسینەوەی "شیرین و خوسرەو" بە کوردی کە ساڵی (١١٥٣) کۆچیی یاداشت کردووە، ئەمەش بەگوێرەی ڕۆژژمێرەکانی "گرێنڤیل" بەرانبەر ساڵی (١٧٤٠ز) دەوەستێت. تۆمارکردنی ئەم ساڵە گرنگییەکی یەکجار زۆری هەیە بۆ تێگەیشتنی سەردەم و ژیاننامە و هەڵوێستی شاعیر و کۆدە شاراوەکانی ناو شیعرەکانی. ئەم زانیارییە دەکرێت وەکو ئەڵقەیەکی ناوەندی دەستی پێوە بگیرێت و بۆ بەراورد و بەراوردکاری سوودی لێ وەربگیرێت. ئێمە لە بەشە جیاجیاکانی ئەم نووسینەدا بۆ سەر ئەم خاڵە دەگەڕێینەوە کە شاعیر لەناو "شیرین و خوسرەو"دا جێگەی کردۆتەوە.

**نیزامیی گەنجەوی**

ئێمە ئەگەر بمانەوێت، بە جوانی لە "خانای قوبادی" تێ بگەین، دەبێ پێشتر بە کورتی لەسەر حەکیم نیزامیی گەنجەوی (٥٣٠-٦٠٨ک) بەرانبەر (١١٣٥-١٢١١ز) چەند دێڕێك بنووسین و بزانین ئەم شاعیرە مەزنە کە کاریگەریی لەسەر ئەدەبی تورکی و عەرەبی و هیندی و ئەڵمانی و کوردی و... هتد زۆر بووە، چەند کاریگەریی لەسەر خانای قوبادی هەبووە؟

بێگومان کاریگەریی نیزامیی گەنجەوی[٦] لەسەر زۆربەی شاعیرە کوردەکان قووڵ و فراوان بووە، هەر کەسێك شیعری ئەحمەدی خانی، نالی، مەولەوی و حاجی قادری کۆیی بخوێنێتەوە، ڕادەی ئەو کاریگەرییە بە زەقی و زۆریی دەبینێت.

لە ئەدەبی فارسیدا حەکیم نیزامیی گەنجەوی خاوەنی (خمسەء نظامی گنجوی)یە کە شاکارەکانی بریتین لە (مخزن الأسرار، لیلی و مجنون، خسرو و شیرین، هفت پیکر، اسکندر

نامە). دیارە هەر شاکارێك لە شاکارەکانی نیزامی دەیان کتێب و لێکۆڵینەوەیان لەسەر نووسراوە و بۆ زۆر زمانی زیندووی ئەم جیهانە وەرگێڕدراون و کاریان لەسەر کراوە.

نیزامی، ئەگەرچی شاکارەکانی لەسەر خواستی ئەم شاو ئەو میر هۆنیوەتەوە و پاداشتی بەنرخی پێشکەش کراوە، بەڵام شاکارەکانی لە زۆر شوێندا بانگەشەن بۆ دادپەروەری و ئازادی و سەربەستی و تا ڕادەیەك بانگەشە بۆ ڕۆشنگەری و ئاوەزگەرایی و ڕاشناڵیزم، دەکەن.

یەکێکی وەکو محەمەد سەعید ئەردوبادی (١٨٧٢-١٩٥٢) کە نووسەری ڕۆمانی (خاتون گنجە)[٧]یە و لەژێر ئەم ناونیشانە سەرەکییەدا ناونیشانی دووەم نووسراوە (زندگی نظامی گنجوی) کە ژیاننامەی نیزامیی وەکو ڕۆمان تێدا نووسراوە.

ڕۆماننووس هەوڵی داوە بۆ سەردەمی نیزامی بمان گێڕێتەوە و ڕووداوەکان لە ڕوانگەیەکی سیاسی و ئایدیۆلۆجییەوە بخاتە بەرچاو. نووسەر، بۆ چنینی تانوپۆی ڕۆمانەکە، پشتی بە شیعر و ژیاننامەی شاعیر بەستووە و پاڵەوان و کەسایەتیی ناو ڕۆمانەکە هەمان ئەو کەسایەتییانەن کە هاوچەرخی نیزامی بوون. ڕەنگە یەکێك لە ڕەخنەکانی من لە کارە مەزنەکەی ئەردوبادی ئەوە بێت کە نەیتوانیوە بێلایەنی و سەربەخۆیی ئایدیۆلۆجیی خۆی بپارێزێت. ئەو لە هەندێك بڕگەدا بە خۆی و تێڕوانینی ئایدیۆلۆجیی کۆمۆنیستیی ڕووسی- ئازەربایجانییەوە بۆ دەربار و کووچە و کۆڵانەکانی گەنجە گەڕاوەتەوە و سەدەی دوانزەیەم و سەدەی بیستەمی لێ تێکەڵاوبووە و دروشم و تێگەیشتن و چوارچێوە ئایدیۆلۆجییەکانی سەدەی بیستەمی بۆ بن ئاسمانی سەدەی دوانزەیەم گواستۆتەوە. شاعیری گەورەی جیهانی، لەسەر حەز و ئارەزووی کادیرێکی پارتی کۆمۆنیست، داس و چەکوش دەخاتە سەرشان و داکۆکی لە مافی مرۆڤ و چەوساوەکانی ئاران و گەنجە و بردع دەکات.

محەمەد سەعید ئەردوبادی هەر لەبەر ئەوەی خۆی یەکێك بووە، لە کادیرەکانی پارتی کۆمۆنیستی ڕووسی (لقی ئازەربایجان) کاتێك شۆڕشی ئۆکتۆبەر (١٩١٧) بەرپا کراوە تەمەنی نزیکەی (٤٥) ساڵ بووە. ساڵی (١٩٤٦-١٩٤٨) ئەم ڕۆمانە مێژوویيەی نووسیوە. واتە پاش جەنگی جیهانیی دووەم و تێکشکانی بەرەی فاشیزم. لە لووتکەی پەرەسەندنی ستالینیزم و سیحری ئایدیۆلۆجیای کۆمۆنیستی- ستالینیدا ئەم کارە نووسراوە. ئەم زەمینە و هەلومەرجە سیاسی و کولتوورییە، هانی ئەردوبادیی داوە نیزامیی گەنجەوی وەکو پێشەنگی خەباتی چینایەتی وێنا بکات و لە هەندێك بەشی ڕۆمانەکەدا نیزامی داهێنەری (بیری نەتەوەیی، ئازەریچێتی و تورکچێتی)یە. شانبەشانی مەهەستیی گەنجەوی بە زمانی ئازەری شیعریان نووسیوە و لایەنگری ئەوە بوون فەرهەنگی ئازەری ببوژێنرێتەوە و قۆناخی پاشکۆبوونی کولتووری و نووسین و خوێندنەوە بە زمانی فارسی و عەرەبی بەرەو کۆتایی بەرن و سەردەمێکی نوێی کولتووریی ئازەری پەرە پێ بدرێت. ئەگەر ئەمە پەیام و بیری گەنجەوی بووبێت، یان لەسەر بنەمای سیحری خوسرەو و شیرین و (لیلی و مجنون) و (یوسف و زلیخا)و... هتد ناوی ڕۆیشتبێت، دەبێ خانای قوبادی لەژێر کاریگەریی کام پەیام و هەڵوێست و بیر و تێگەیشتن دەستی دابێتە کاری وەرگێڕان و نووسینەوەی هەموو، یان بەشێك لە شاکارەکانی نیزامی؟ بە داخەوە ئەوەی تا ئێستا چاپ کراوە و بڵاو کراوەتەوە تەنیا "شیرین و خوسرەو، لەیلا و مەجنوون و یوسف و زلێخا"یە و ئێمە نازانین ئاخۆ ئەو شاکارەکانی تری نیزامیی وەرگێڕاوە؟ یان تەنیا هەر ئەم سێ شاکارەی وەرگێڕاوە و هیچی تر. ئەم سێ بەرهەمەی "خانا" بە داخەوە بە شێوەیەکی زانستی و بێ کەموکورتی بڵاو نەکراونەتەوە تا ئێمە بتوانین هەڵسەنگاندنی بابەتی بۆ کارەکان بکەین و لەگەڵ کارەکانی نیزامیدا بەراوردیان بکەین و بیروباوەڕ و تێگەیشتنی ئەو دەستنیشان بکەین.

هەر بۆ نموونە، هەر شاکارێکی نیزامی لە سەر بنەمای (٢٥-٣٠) دەستنووسی سەدەی حەوتەم تا دوانزەیەمی کۆچی ساخ کراونەتەوە. کەچی کارەکانی "خانای قوبادی" لە سەر

بنەمای یەك دوو دەستنووسی سەدەی نۆزدەیەم و بیستەم ساخ کراونەتەوە و چاپ کراون. مامۆستا محەمەدی مەلا کەریم ئەوەی بۆ گێڕامەوە: "پاش بڵاوبوونەوەی "شیرین و خوسرەو" پێنج دەستنووسی "شیرین و خوسرەو"م پێ گەیشت، بەڵام نەم پەرژایە سەر ئەوەی بەراوردیان بکەم و کاریان لەسەر بکەم" من پرسیاری ئەوەم لێ کرد: "ئەی ئەم پێنج دەستنووسە چییان لێ بەسەر هات؟" ئەو گوتی: "نازانم! باوەڕکەم هەمووی فەوتان!".(٨)

**نیزامیی گەنجەوی و خانای قوبادی**

فروسمان بە بەرهەمی شاعیرێك، یان نووسەرێکەوە بەرهەمی ڕێکەوت نییە و کوتوپڕ سەرهەڵنادات، بەڵکو بەرهەمی پرۆسەی پەروەردە و فێربوون و ژینگەی کولتووری و ناسنامە و ئەزموون و خۆناسین و خۆناساندنە. ئێمە هەر لەخۆمانەوە شیعرەکانی شاملوو، یان گوێتە ناخوێنینەوە و شەیدای نابین. هەر لەخۆمانەوە دەست نادەینە دیوانی گۆران یان ڕۆمانێکی حسێن عارف. تەنانەت لە بواری فەلسەفە و بیر و ڕەخنەی ئەدەبییشدا، خوێندنەوەی بەرهەمی هەر نووسەرێك هۆکارەکەی ئەوەیە، هەر کەسە دەیەوێت خۆی بدۆزێتەوە و لە خۆی تێ بگات. پیاوێکی سۆفی ئەگەر فارسی باش بزانێت، بە شیعرەکانی مەولانا جەلالەدینی ڕۆمی سەرمەست دەبێت و خۆی لەبیر دەچێتەوە. مامە سۆفی ڕەنگە لە شیعرەکانی "نەزار قەبانی" یان "ڕەنج سەنگاوی" هیچ چێژێکی ئەوتۆ وەرنەگرێت.

لە دەوروبەری ساڵی (١٧٤٠ز) خانای قوبادی دەستی داوەتە وەرگێڕان یان بە کوردیکردنی داستانەکانی نیزامیی گەنجەوی کە تا ئێستا شیرین و خەسرەو، یوسف و زلێخا و لەیلا و مەجنوون بە چاپ گەیەندراون. ئەوسا وەکو ئەمڕۆ نەبووە، لەسەر داوای دامەزراوەیەکی فەرهەنگی، یان سیاسی زنجیرەیەك کاری ئەدەبی یان سیاسی وەربگێڕدرێت. ئێمە نازانین "خانا" لە کوێ ژیاوە و پەیوەندیی لەگەڵ دەسەڵاتی سیاسیی ئەو ناوچەیەدا چۆن بووە؟ ئایا دەسەڵاتی سیاسیی کوردی پێویستی بە وەرگێڕانی شاکارەکانی نیزامی

بووه؟ یان (خان خانان) خۆی حەزی لەوە بووە شان بداتە بەر ئەرکێکی فەرهەنگیی گرنگ و گەورە؟

ڕاستە لە نێوان سەردەمی نیزامیی گەنجەوی و سەردەمی خانای قوبادیدا شەش سەدەی ڕەبەق هەیە و هەردووکیان لە یەك جیا دەکاتەوە، وێڕای ئەو جیاوازییەش، شاعیری گەورەی کورد ئەوەندە شەیدای ئەزموون و بەرهەمەکانی شاعیری گەورەی گەنجە بووە، کاتێکی زۆری بۆ وەرگێڕان و کارکردن لەسەر شاکارەکانی ئەو تەرخان کردووە.

**ئەزموونی خانی و خانای قوبادی**

بۆ ئەوەی لە ئەزموونی نووسینی ڕۆمانی شیعری، یان چیرۆکی شیعری بە باشی تێ بگەین و بە تایبەتی ئەزموونی ئەحمەدی خانی لە نووسینی "مەم و زین"دا، دەبێ بۆ میتۆد و ڕێبازی "نیزامیی گەنجەوی" بگەڕێینەوە.

ئەو لە نووسینی شاکارێکی وەکو خوسرەو و شیرین سوودی لە شانامەی فیردەوسی (٩٣٥-١٠١٥ز) وەرگرتووە، ئەو بە "حکیم" ناوی دەبات:

**حکیمی کــاین حکــایت شــرح کــردەست**
**حــدیث عشـــق از ایشـــان طرح کــردەست**
**چـــــو در شست او فتـــــادش زنـــدگانی**
**خدنگ افتادش از شست جـــوانی (ص٣٢)**

فیردەوسی بە کورتی ئاماژەی بۆ چیرۆکی خوسرەو و شیرین دەکات، لە کاتێکدا تەمەنی شەست ساڵ بووە و قۆناخی کەفوکوڵی لاوێتیی تێپەڕاندووە. ئەم ئاماژەیە لە ڕووی دەروونییەوە زۆر گرنگە، چونکە نیزامی لە تەمەنی چل و شەش ساڵیدا و پاش مردنی "ئافاق"ی هاوسەری، ساڵی (٥٧٦ك) بەرانبەر (١١٨٠ز) ڕۆمانە شیعرییەکەی خوسرەو و شیرینی نووسیوە.

لەوە دەچێت نیزامی تەنیا بیرۆکەی خوسرەو و شیرینی لە فیردەوسی وەرگرتبێت، بەڵام بۆ خۆی تەکنیکی داڕشتنی نوێی داهێنابێت. واتە لە دەوروبەری گەنجە و ئاران و بردع داستان و ئەفسانە و بەیت و بالۆرە باو بووبێت و ئەم لە پیر و بە ساڵاچووانی شارەکەی و کەسوکاری، چەندین جاری بیستبێت و لەبەری کردبێت و لە سۆنگەی خوێندنەوەی شانامەدا بایەخ و گرنگیی بۆ دەرکەوتبێت:

بیـــــاضش در گـــــزارش نیست معروف
کـــــه در بردع ســـوداش بـــود موقوف
ز تـــــــــاریخ کهنســـالان آن بـــوم
مـــرا ایـــــن گنج نامــــه گشت معلـوم
کهنســــالان ایـــن کشـور کــــه هستند
مـــــرا بر شقه این شغل بستند (ص٣١)

ئەم ســێ بەیتــەی ســەرەوە بەڵگــەن لەســەر ئــەوەی داســتانەکە، وەکــو بەشــێك لــە میتیۆلۆجیای ئەو ناوچەیە هەبووە و ئەم، سەرلەنوێ بۆ پەیامی خۆی بـەکاریهێناوە و لـە چوارچێوەیەکی نوێدا دایڕشتووتەوە. ئەمە هەمان ئەو میتۆدەیە کـە ئەحمـەدی خـانی لـە "مەم و زین"[٩]دا پەیڕەوی کردووە. پێش ئەحمەدی خانی، بێگومان بەیتی "مەم و زین" و "مەمی ئالان" لە زۆر ناوچەی کوردستاندا باو بووە. نەوە بۆ نەوە، دەماودەم بـۆ یـەکتریان گێڕاوەتەوە و شەوانی دوور و درێژی زستانیان پێ بەسەر بردووە و بـەهای ئـەخلاقیی لـێ وەرگیراوە و ئەرکێکی پەروەردەییی گێڕاوە. دیارە خـانی شـاکارەکانی نیزامیـی بـە جـوانی خوێندۆتەوە و تێگەیشتووە، بەڵام نەیویستووە کوتومت لاسـاییی بکاتـەوە و شـوێن پێـی هەڵبگرێت و لە سێبەری شای شاعیرانی ئێراندا، دەنگ و ڕەنگی خۆی بزر بکات و هیچی

بۆ نەمێنێتەوە. بێگومان ئەو دەیتوانی خوسرەو و شیرین وەکو خانا وەربگێڕێت، یان دووبارە بینووسێتەوە. خانی کەسێك نەبووە دڵی، بە داهێنانێکی بچووك ئاو بخواتەوە.

ئەو بە قووڵی کارەکانی نیزامیی خوێندۆتەوە و شارەزاییی تەواوی لە تەکنیکی دارشتنەوەی داستان و ئەفسانە و بەیت و میتیۆلۆجیادا پەیدا کردووە. پاشان "خانی" ئامرازی چیرۆکی شیعری تەنیا بۆ چیرۆکەکەی خۆی بەکار نەهێناوە، بەڵکو بۆ ئامانجێکی سیاسی و فیکری و ئەخلاقی. یەکێك زۆر شارەزای "خوسرەو و شیرین"ی نیزامی و "مەم و زین"ی خانی نەبێت، نازانێت دووەم لەژێر کاریگەریی یەکەمدا نووسراوە، چونکە لە لایەکەوە داستانێکی کوردی (مەم و زین یان مەمی ئالان)[١٠] کراوەتە بنەمای شاکارەکە، لە لایەکی ترەوە سەردەمی سیاسیی خانی، هەر زۆر لەناو چیرۆکە شیعرییەکەدا ڕەنگی داوەتەوە.

خانای قوبادی قوتابخانەیەکی جیاواز و ڕێچکەیەکی تایبەتی هەڵبژاردووە. ئەو شوێنپێی خانیی هەڵ نەگرتووە و دیارە مەبەستی بووە زۆربەی شاکارەکانی نیزامی وەربگێڕێت و هەر ئەوەندەی بۆ بمێنێتەوە کە وەرگێڕێك بێت کە کارەکانی نیزامیی کورداندووە و بەگوێرەی تێگەیشتن و دەستەڵاتی خۆی، دەستکاریی تێکستەکانی کردووە و لە چێژ و ئارەزووی خوێنەری کوردی ئاشنای کردووە.

ڕاستە ئەو بە وەرگێڕ دادەنرێت، بەڵام ئەم سەد لە سەد خۆی بە دەقەکانەوە گرێ نەداوە. لە هەندێك بڕگەدا، دووسەد بەیتی کردۆتە دە بەیت، لە بڕگەی تردا دوو بەیت کراوەتە چوارسەد بەیت. سەرەڕای ئەمەش، گیانی کوردەواری و بە تایبەتی هەورامانی سەدەی (١٨)ی پێوە دیارە و ئەمەش جۆرێکی ترە لە هونەری وەرگێڕان.

**دیاردەی خۆناسین و پێناسەی بیری نەتەوەیی**

لای بەشێك لە نووسەر و مێژوونووسانی کورد، ڕەچاوکردن و بەدیکردنی جۆرێك لە جۆرەکانی سۆز بۆ گەل و نیشتیمان، یان شانازیکردن بە نیشتمان و سەروەرییەکانی میر و

گەورە پیاوانەوە، یان شانازیکردن بە ڕەسەنایەتی و جوانیی زمانی کوردییەوە، هەر یەکسەر لای ئەوان یەکسانە بە چەکەرەکردن و ڕسکانی "بیری نەتەوەیی". دیارە هەر کەسێك دەتوانێت بە ئارەزووی دڵی خۆی پێوەر و پێناسە بۆ ناسیۆنالیزم بدۆزێتەوە و مێژوویەکی دەستکرد بۆ بیری نەتەوەییی کوردی دروست بکات. بەڵام ئایا ئەو پێناسە و پێوەرە لەگەڵ "کاتیگۆری" و پێوەر و پێناسەی ناوەندە ئەکادیمی و زانستییەکانی ڕۆژئاوادا دەگونجێت؟

ئەم پرسیارە وڵامەکەی ئاسانە و پێویست بەوە ناکات ڕێسەکەی ئەوان بکرێتەوە بە خوری و مرۆڤ دەتوانێت خۆی لە سەرئێشە بپارێزێت. لە نێوان نووسینی مەم و زین -کە ساڵی هەزار و شەست و یەکی کۆچی، بەرانبەر (١٦٩٤ز)ی لەسەر نووسراوە- و شیرین و خوسرەو -کە ساڵی هەزار و سەد و پەنجا و سێی کۆچی بەرانبەر (١٧٤٠ز)ی لەسەر نووسراوە- کەمتر لە نیو سەدە، لەدایکبوونی ئەم دوو بەرهەمە لە یەك جیا دەکاتەوە. ئەحمەدی خانی هەر وەکو لە پێشەکیی مەم و زیندا دەردەکەوێت، مرۆڤێکی شارەزا و بەئەزموون و خاوەن بیروبۆچوون بووە. نزیکایەتیی ئەو لە دەزگای دەستەڵات و بەڕێوەبەرایەتی و فەرمانڕەوایەتیی میرنشینی بایەزیدەوە، بایی ئەوە یارمەتیی داوە جێگە و شوێنی کوردستان لەسەر نەخشەی ململانێی زلهێزەکانی ئەو سەردەمە بە ڕوونی ببینێت و چارەسەر بۆ کێشەی کوردان پێشنیاز بکات.(١١)

ئێمە لەبەر ئەوەی زانیاریی وردمان لەسەر ژیانی سیاسی و پلەی کۆمەڵایەتی و ئابووریی خانای قوبادی زۆر کەمە، بۆیە ناتوانین بە ئاسانی ڕاڤەکاری بۆ مۆتیڤەکانی ئەم شیعرەی خوارەوە بکەین:

ڕاستەن مواچان: فارسی شەکەرەن،

کوردی جە فارسی بەڵ شیرینتەرەن

**پەی چێش نە دەوران ئەی دنیای بەدکێش**
**مەحظووظەن هەرکەس بە زوبان وێش؟...**
**مەعلوومەن هەرکەس بە هەر زوبانێ،**
**بواچۆ نەظمی جە هەر مەکانێ،**
**وێنەی عروسان زێبای موشك چین،**
**بکەرۆش جە حوسن عیبارەت شیرین،**
**خاریج جە مەعنی نەبۆ مەضموونش،**
**کریابۆ چون شیعر (جامی) مەوزوونش،**
**جە لای خیرەدمەند دڵپەسەند مبۆ**
**شیرینتەر جە شەهد شیەی قەند مبۆ**
**جە عەرصەی دنیای دوون بەدفەرجام،**
**بە دەستوور نەظم (نیظامی) تەمام،**
**بە لەفظ کوردی، کوردستان تەمام**
**پێش بوران مەحظووظ، باقی (والسلام)....**

کاك حەکیمی مەلا ساڵح ئەم شیعرەی بە کرمانجیی خواروو کردۆتە پەخشان. ئێمە بەبێ دەستکاری ئەم کۆپلەیە دەخەینە بەرچاوی خوێنەری ئازیز. واتاکەی:

*"ڕاستە دەڵێن زمانی فارسی شەکرە، بەڵام کوردی لە فارسی شیرنترە، بۆچی؟ چونکە لە دەورانی ئەم دنیا هیچ و پووچەدا هەر کەس بەزمانی خۆی شاد و بەختیارە. دیارە هەر کەس بە هەر زمانێ و لە هەر شوێنێك بێ هۆنراوەیەك بڵێ، وەکو بووکە جوانە بۆنخۆشەکانی وڵاتی چین، عیبارەتەکەی بەشێوەیەکی شیرین برازێنێتەوە و ناوەرۆکەکەی بێ واتا نەبێت و وەکو شیعرەکانی مەولانا (جامی) ڕێکوپێك و کێشدار بن، لای خەڵکی ژیر و هزرڤان ئەچەسپێ بە دڵەوە بەشێوەیەك کە لە شیلەی شەکر شیرین تر دەبێ، لە گۆڕەپانی*

*دنیای هیچی بەد ئەنجامدا لەسەر شێوازی شیعری (نیظامی) بە واژەی کوردی هەموو کوردستان ئەم کارەم تەواو کرد تاکو پێی دڵشاد بن و ئیتر سڵاو".* (١٢)

لەم شیعرانەدا جگە لەوەی لە سەرەتاوە پلە و پایە، قورسایی و کێش بە زمانی کوردی دەدات، لە کۆتاییشدا ئەوە دەدرکێنێ کە لە کارەکەیدا شوێنپێی (نظامی)ی هەڵ گرتووە.

خانا بە زەقی شانازی بە زمانی کوردییەوە دەکات و پێی وایە کوردی لە فارسی شیرینترە. *"لەبەر چی لە دەورانی ئەم دونیای بەدکێشە، هەر کەسێك بە زمانی خۆی بەختەوەرە؟...*" کەواتە تێگەیشتنی خانای قوبادی بۆ بایەخ و کارێگەریی زمان، سنووری زمانەوانی و بەراورد لە نێوان زمانەکاندا تێ دەپەڕێنێت. زمان لای ئەو ئامرازێکە، لە هەر سەردەمێکدا بێت، هەر کەسێك لەگەڵ زمانەکەی خۆیدا خۆی بە بەختەوەر دەزانێت. ئەو بە زیادەڕۆیی لە شانازیی خۆهەڵکێشان، گیانی خۆبەزلزانین و لووتبەرزیی فارسەکان تێ دەپەڕێنێت کە پێیان وایە: "فارسی شەکرە"، زمانەکانی تر لەچاو فارسیدا هیچ نین. ئەو دەڵێت: ئەوە ڕاستە کە دەڵێن "فارسی شەکرە"، لای من کوردی لە فارسی شیرینترە. ئەمە قسەی کەسێك نییە فارسیی نەزانیبێت، یان تۆزێك فارسیی زانیبێت. ئەو فارسیی هەر زۆر بە باشی زانیوە، ئینجا لە فارسییەوە چەندین شاکاری وەرگێڕاوە و ویستوویەتی لە ڕێگەی وەرگێڕانەوە فەرهەنگی کورد فراوانتر بکات.

ئەم لە ڕێگەی بەکوردینووسین خۆی لە فارس جیا دەکاتەوە و جەخت لەسەر زمانی خۆی دەکات کە لە فارسی شیرینترە، بەڵام بۆچی شاعیر لە نیوەی یەکەمی سەدەی (١٨)ی زاینیدا، سەرنجی بۆ لای زمان و کولتوور دەچێت نەك بۆ ئامرازەکانی ململانێی سیاسی؟ لەوە دەچێت خانای قوبادی لەم قۆناخەی تەمەنیدا پلەیەکی ئیداری، یان وەزیفیی بڕیاردەر و گرنگی بە دەستەوە نەبووبێت. ڕادەی ئاگایی کولتووری و شانازیکردن بە زمانەوە، دەتوانێت وەکو بەلگەیەك سەیر بکرێت کە شاعیر کۆمەڵێك پەیوەندی و ڕایەڵی لەگەڵ

جیهانی سیاسەتدا هەبوو. پلەوپایەی کۆمەڵایەتی و ئابووری،[١٣] یارمەتیی داوە لەوە تێ بگات ئەو کوردە و بە زمانی کوردی دەدەوێت و دەنووسێت و ئەم زمانە هیچی لە زمانەکانی تر کەمتر نییە.

بەڵام شاعیری گەورە بۆچی لە جیهانی سیاسەت خۆی نەبان دەکات و نایەوێت تێگەیشتن و تێڕوانینی سیاسیی خۆی دابڕێژێت و داکۆکیی لێ بکات؟ خانی پلە و پێگەیەکی ڕاوێژکاری و دیپلۆماسی و مۆنۆپۆلی سەرجەم کاروباری نووسین و (مراسلات) بە دەستەوە بووە و لەچاو زۆربەی شاعیرانی پێش خۆی و پاش خۆی پێگەی ئابووریی بەهێزی هەبووە.[١٤] ئاست و ئاگاییی سیاسیی"خانا" زۆر بەرز بووە، بەڵام ئەو نەیویستووە پەیامێکی سیاسیی ڕاستەوخۆی هەبێت و دەری بڕێت. تەنیا جەختی لەسەر لایەنی فەرهەنگی و ئەدەبی کردووە. ئەم کۆپلەیە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی شاعیر چەند ئاگای لە ئەدەبی گەلانی تر بووە و زانیویەتی چۆن هەریەکە شانازی بە زمانەکەی خۆیەوە دەکات.

کەوابێ، ئێمە دەبێ لە داهاتوودا بە دوای ئەوەدا بگەڕێین کار و پیشەی خانای قوبادی چی بووە؟ ئەگەر ئەو شاعیرێکی ڕووناکبیر و خوێندەوار بووە، دەیتوانی شیعری خۆی بنووسێت و لەسەر یارە چاومەست و ئەگریجە خاوەکان دیوانێك بنووسێت، بەڵام ئەم شاعیرێکی ڕووناکبیری خاوەن پەیامێکی گەورە و خەونێکی مەزن و پرۆژەیەکی کولتووریی قووڵ بووە. مرۆڤ ئەگەر شتێك نەبێت، هەر لەخۆوە پەلاماری بەردێکی زل نادات. من تەنانەت مەسەلەی گرتنەکەی بۆ جیهانی سیاسەت دەگێڕمەوە نەك بیروڕا و باوەڕی دینی کە دواتر لەسەری دەدوێم.

قوبادی شیعرەکەی بە(لفظ)ی کوردی و بۆ هەموو کوردستان نووسیوە، بۆئەوەی ئەوان بە نووسینە کوردییەکان بەختەوەر بن. شاعیر، سەرجەم وڵاتی کوردستانی لەبەرچاو گرتووە نەك ناوچەیەکی دیاریکراو. هەر وەکو چۆن شەرەفخانی بەدلیسی لە شەرەفنامەدا، لە گۆشەنیگایەکی کوردستانییەوە مێژووی خوێندۆتەوە و بە مووکێش داوە تێکچڕژاوەکانی

مێژووی کوردی خستۆتە سەر یەك، قوبادییش زمانی کوردی دەکاتە پێوەر و ڕێنما و بنەمای پەیامی کولتووریی خۆی کە ئاراستەی سەرانسەری کوردستانی دەکات.

سەرەڕای ئەوەی ئەو خۆی بە شاعیرێکی خاوەن پەیام داناوە، هەست دەکرێت کە شاعیر بە دەست هەلومەرجی ژیانەوە نالاندوویەتی: "پەی چێش نە دەوران ئەی دنیای بەدکێش؟..". ئەو دەورانەی ئەو تێی کەوتووە، بە بەدڕەفتار (بەدکێش) وەسفی دەکات کە هەست دەکرێت ئەم بەیتە، هەر بە زۆرەملێ ئاخنراوەتە ناو کۆپلەکەوە و پەیوەندیی بە بابەتەکەوە نییە. کەواتە لە ناخەوە برووسکەیەك بەبێ ئاگایی و ویستی شاعیر، خۆی سەپاندووە و قەڵەمەکەی ناچار کردووە بنووسێت.

شاعیرێك ماوەیەك لە زینداندا بوویێت و لە بەیتە جیاجیاکاندا سکاڵای خۆی بەرز کردبێتەوە: "جە عەرصەی دنیای دوون بەدفەرجام" لێرەشدا سەرلەنوێ ئەم دونیایە، بە ئاخرشەڕ (بەدفەرجام) دادەنێت و ئەمەش هەر بروسکەیەکی تری دەروونی و لابەلایە، پەیوەندیی بە کرۆکی بابەتەکەوە نییە. کەواتە شاعیر شانبەشانی پەیامی کولتووریی خۆی، ویستوویەتی بورکانی نەفرەت بەسەر هەلومەرجی سیاسیدا ببارێنێت، چونکە بە ئارەزووی دڵی ئەو نەبووە. ئیدی ئەو پەیامی سیاسیی خۆی لە دوو تۆی پەیامە کولتوورییەکانی خۆی دەشارێتەوە.

پەیام و هەستی ئیتنۆ- ناسیۆنالیستیی خانای قوبادی لەچاو سەردەم و شاعیرانی سەرەتای سەدەی (١٩) هەر زۆر پێشکەوتووە و قەڵمبازێکی گەورەیە. ئێمە دەبێ بیروبۆچوونی قوبادی لەگەڵ سەرهەنگ ئەڵماس خاندا[١٥] بەراورد بکەین.

سەرهەنگ ئەڵماس خان و خانای قوبادی و میرزا شەفیعی کولیایی هاوچەرخ بوون و بە شیعر نامەیان بۆ یەکتر ڕەوانە کردووە. سەرهەنگ ئەڵماس خان، لە سوپای نادرشادا

(١٦٨٨-١٧٤٧ز) سەرهەنگ بووە و بەشداریی لە زۆربەی حەملە عەسکەرییەکانی ئەودا کردووە و پاش کوژرانی نادرشا، سەرهەنگ ئەڵماس خان "نادرنامە"[١٦] دەنووسێت.

نـــــەزمێ ژە نـــەبـــەرد نادر یاد کەریم
ڕۆحش ژە ڵلاڕەی لـە حـــەد شـــاد کەریم [١٧]

بێگومان ئەڵماس خان زانیویەتی کورد هەیە و ناوی بەبە و بلباس و باجەڵان و کوردانی قووچان دەهێنێت، بەڵام سەرزمان و بنزمانی هەر "ئێران"ە.

ژنـدەش شـــادیلغ و فـەتح شێران
کـــەردش چـراخـان نە ملك ئێران [١٨]

جگە لە گیانی "ئێرانچێتی" و تەرخانکردنی کتێبێك بۆ یادی شەڕ و شۆڕەکانی شایەکی کوژراو هەندێ جار دزێوترین دیمەن کە دیمەنی ئەنفالکردنی بەشێك لە کوردانە، بە ئەوپەڕی خوێن ساردییەوە بە شیعر دەهۆنێتەوە:

شێران ئێران دڵ نـــە قـــــەهر قــین
ڕشیان نــــە زەهـــار دەست وە تیغ کین
وەو تـــــەور ژە زەهـــار کەردشان دەمار
ســــەر نەبـــــان ســـەر لار لـە بان لار
دەمـــــــای قـــــەتڵ قــین داوەی دارگیر
دەست کـــەردن وە دیل وە وردە و ئەسیر
جۆجۆ جـۆش خـوون خێزیـــا ژە لافـاو
مـالا سەرو لـــەش چـوین لاف هـــالاو
ئێرانی ژە قـین قـــــەســـــەم ژە یۆردن
توخم زی حـــەیـــــــات ژە بەر نەکردن

**شیرین مـــەهوەشـــان شـۆخ باجەڵان**
**لـــولـــوزادە شوور تـــورك تـــــەڕ دڵان**
**وەخش والاپـــۆش گـــوڕین نـــە کوڵان**
**لەرزان لـــەرزانان زەڕین زەنـــگـــوڵان(١٩)**

ئەم کۆپلەیە تابلۆیەکە، شاعیر هونەرمەند بووایە فڵچەی بە دەستەوە دەگرت و ئەو دیمەنە سامناکەی دەخستە سەر تابلۆیەك سوپای میرنشینی باجەڵان بەرانبەر هێرش و پەلاماری سوپای نادرشا، تووشی شکان و هەرەس و دۆڕاندن دەبێت. سەدان کەس بە دیل دەگیرێت و بە ئەوپەڕی دڕندایەتی دەکوژرێن و لە کەللەی سەر قەڵا دروست دەکرێت و لاشەی لەسەر کەڵەکە دەکرێت. خوێن وەکو جۆگا هەڵ دەستێت. لایەنێکی تری تابلۆکە کە لە کاتی ئەنفالەکاندا دووبارە بۆتەوە: کیژە نازدارەکانی باجەڵان ڕادەستی ئەفسەر و سەربازی سوپای سەرکەتوو دەکرێن و چریکە و ناڵەیان دەگاتە عەرشی ڕەحمان.

**مۆتیف**

مەبەست لە وشەی مۆتیف (motive) ئەو هۆکار و پاڵنەر و هاندەرەیە کە ڕاستەوخۆ، یان ناڕاستەخۆ دەبنە هۆی ئەوەی کەسێك، یان گروپێك کردەوەیەك ئەنجام بدەن، یان تێکستێك، یان کارێکی هونەری بەرهەم بهێنن. لە جیهانی ڕۆژهەڵاتی کۆندا، لە سۆنگەی نەبوونی دامودەزگای چاپ و بازاڕی کتێب، نووسین لە سێبەری دامەزراوەکانی دەستەڵاتی سیاسی و ئایینیدا سەری هەڵداوە و گەشەی کردووە.

دەوڵەت و دامەزراوەکانی پێویستیان بە پیشەسازی و هونەری نووسین هەبووە بۆ ئەوەی کاروباری دەوڵەت بە باشی بەڕێوە بچێت و دەستەڵاتدار ناوی لە مێژوودا بمێنێتەوە و کردەوەکانی نەمرییان پێ ببەخشرێت. نووسەر لەسەر ئەوە خۆی ڕادەهێنا کە دەبێ پسپۆڕ

بێت و خۆی بۆ کاری نووسینی مێژوو (بۆ نموونە) تەرخان بکات. ژمارەیەکی زۆر کەم لە خوێندەواران توانیویانە لەم پیشەیەدا سەرکەتوو بن و ئەرکەکانیان بە باشی ئەنجام بدەن.

کەسێکی وەکو شەرەفخانی بەدلیسی،[٢٠] لە فێرگەی شاهانەی تایبەت بە شازادە و زارۆڵە و نەوەکانی شا توهماسبی سەفەویدا فێری خوێندن و نووسین بووە. ماوەیەکی یەکجار دوور و درێژ سەرقاڵی خوێندنەوەی کتێبەکانی مێژوو بووە و زۆر لە کاتی خۆی بۆ مێژووی کورد تەرخان کردووە و زانیارییەکی زۆری لەسەر شانشین و میرنشینە کوردەکان کۆکردۆتەوە. کاتێك بڕیار دەدات شەرەفنامە بنووسێت، دەزانێت بە دەستێك دوو کاڵەك هەڵناگیرێت، میرایەتی و نووسینی مێژوو لە یەك کاتدا پێکەوە ناکرێت. نووسینی شاکارێك بە گرنگتر دەزانێت تا خۆ تەرخانکردن بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری میرنشینی بەدلیس. هەر بۆ ئەوەی لە کارەکەیدا سەرکەوتوو بێت و هیچ شتێك هەودای بیرکردنەوەی نەپچڕێنێت، دەست لە فەرمانڕەوایەتی و دەستەڵات دەکێشێتەوە، خۆی بۆ نووسینی شاکارەکەی تەرخان دەکات. بێگومان شەرەفخان مۆتیڤی خۆی هەبووە لە نووسینی ئەم شاکارەدا و ویستویەتی بە سوڵتانی عوسمانی ڕابگەیەنێت کە میرنشینە کوردەکان چەند جیاواز و ناکۆك و ناتەبا بن، هەرهەموویان یەکێکن و لە باکوورەوە تا باشوور، لە ڕۆژهەڵاتەوە بۆ ڕۆژئاوا، لە گەورەوە تا بچووك، کۆن و نوێیان سەیری دەمی بنەماڵەی "ڕۆژکی" دەکەن.[٢١]

یەکێکی وەکو مەکیاڤیلی- هەرچەند ئەو لە نووسەرانی ڕۆژئاوایە، قسەی ئێمە لەسەر مۆتیڤەو بەم نموونەیە مەبەست ڕوون دەکەینەوە- هەروا بەبێ هۆکار کتێبی میری نەنووسیوە. دیارە مەبەستی ئەوە بووە بالادەستیی خۆی لە بواری زانیاریی سیاسی و ئەزموونی مێژوویی و کاری دیپلۆماسیدا بنوێنێت و بەرهەمێك لەم بارەیەوە بخاتە بەردەست یەکێك لە میرەکانی ئیتالیا. گومان لەوەدا نییە کە ئەو ویستوویەتی لەسەر لاپەڕەکانی کتێبێکدا توانا و هێز و کەسایەتیی خۆی بسەلمێنێت کە ئەو شایانی

پشتگوێخستن و پەراوێزخستن و دوورخستنەوە نییە و میرێکی سەرکەوتوو، پێویستی بە ئامۆژگاری و ئەزموونی کەسایەتییەکی کارامە و لێزان و شارەزای وەکو ئەوە بۆ ئەوەی سەری سووك بکات.(٢٢)

لەسەر لاپەڕەکانی شیرین و خوسرەودا، بە ئاسانی ئەوە دەخوێنرێتەوە کە خانای قوبادی پەیامێکی سیاسیی ڕوونی هەبووە و ئاراستەی میرێکی کوردی کردووە کە دیارە زمانی ڕەسمیی دەرباری ئەو میرایەتییە شێوەی گۆرانی بووە. کێشەکە ئەوەیە خانای قوبادی وەکو نیزامیی گەنجەوی مۆتیڤی نووسینەکەی نەنووسیوە و ناوی ئەو میرەشی نەهێناوە کە شاکارەکەی پێشکەش کراوە. با ئێمە هەنگاو بە هەنگاو دوای زنجیرەی بیرکردنەوەی شاعیر بکەوین و بزانین دەمان گەیەنێتە کوێ؟

کاتێك خانا بڕیاری وەرگێڕانی خوسرەو و شیرینی نیزامیی گەنجەوی دەدات، شاعیرێکی بالادەست و بەتوانا بووە و لە جیهانی شیعردا خاوەن دەنگ و سەنگ و ڕەنگ بووە، ئەگینا ئەو هەستەی لەلا دروست نەدەبوو کە "لەو دیوی پەردەی ئەسرار"ەوە سرووشێکی بۆ ڕەوانە کراوە کە شاکارەکەی نیزامی بۆ سەر زمانی کوردی وەربگێڕێت. هەر ئاماژەکردن بۆ سرووش نیشانەی ئەوەیە شاعیر چەند گیانی مەزنایەتی و شانازیکردنی هەبووە و چۆن سەیری خۆیی کردووە؟ سرووش لە مرۆڤەوە ڕەوانەی مرۆڤ ناکرێت، یان لە میرێکەوە ڕەوانەی شاعیرێك ناکرێت:

نـــاگا جـــە وەختێ مینـــای صوبحدەم
جە جام خورشید ڕەوشەن بی چـون چەم
جە پـــەردەی ئەسرار لامەکان مـــاوا
سرووشێ بـەی طەور بە گۆشم یاوا(ل١٥)

واتە: شایەك یان میرێك داوای ئەنجامدانی ئەم کارەی لە شاعیری گەورەمان نەکردووە، بەڵکو لەو دیوی پەردەی ئەسرارەوە لە کاتی بەرەبەیاندا، لەپڕ سرووشێکی ڕەوانە کراوە و لە سۆنگەی سرووشێکەوە شاعیر ناچاری وەرگێڕان بووە. بە هەمان شێوە، پەردەی ئەسرار لە لایەن مرۆڤەوە دەستی بەسەردا نەگیراوە و لە دەرەوەی بازنەی دەستەڵاتی ئەوە. پەردەی ئەسرار ئەو شوێنەیە کە دەستی کەسی پێ ناگات. لەوێوە سرووش بۆ خاوەنپەیامێك ڕەوانە کراوە:

واتن: هــەی شوعــەرای خۆش نەظم و شێوە
جــانشین قــەیس پــەی لــەیلا لێوە
چێش مەبۆ چۆن نەظم نیظامیی دوڕسەنج
بــە لــەفظ شیرین، بــەبێ لارە و لــەنج
جــە وەصف فــەرهــاد شیرین و پــەرویز
بــاوەری بــــە ڕەقص خامەی عەنبەر بێز
(ل١٦)

داوای سرووشە کە دیاریکراو بووە و ئاڕاستەی شاعیری "خۆش نەظم و شێوە" کراوە کە دیارە لە سەردەمی خۆیدا ناوبانگی بە شیعری دڵداری ڕۆیشتووە و شەیدای "لەیلا"یەك بووە. باری دەروونیی ئەم قۆناخە لە ژیانی شاعیر، لەگەڵ ناوەڕۆکی هەوەسبازی و دیمەنی ئیرۆتیکیی ڕۆمانە شیعری خوسرەو و شیرین دەگونجێت کە پەیوەندیی بە سەردەمی ئێرانی پێش ئیسلامەوە هەیە.

قوبادی پاش ئەوەی سرووشەکەی[٢٣] پێ دەگات و دەزانێت لە نێو دەیان شاعیری گەورەدا، ئەو لە "پەردەی ئەسرار"ەوە پەیامی بۆ دێت، ئیدی ئەو بە ئەرکی سەرشانی خۆی زانیوە شاکارەکەی نیزامی وەربگێڕێت و پێشکەشی کتێبخانەی دانا و گەورەپیاوانی کوردستانی بکات، ئەوانەش بە کەسانی خاوەن عەقڵ و دین ناو دەبات:

**وێنـــەی نیظامی صەیقـــەڵ دەر زەینم**
**بە سورمەی دانش ڕەوشـــەن کـــەر عەینم**
**تـــاکەی مـــــاجەرای شیرین و خـــەسرەو**
**سەنگتاشیی فەرهـــاد، سەرگوزەشت ئەو**
**باوەروون وە نـــەظم خـــاستەر جە گەوهەر**
**بـــە ڕەشح خـــامەی شۆخ بـۆ عـــەنبەر**
**جە لای عـــاقڵان صاحیب عـــەقڵ و دین**
**دانـــــا بزورگان کوردستان زەمین (ل١٤)**

خانای قوبادی ناونیشانێکی زانراوی لەبەرچاو بووە، بەڵام بە دیاریکراوی ناوی کەسی نەهێناوە. ناوی کەسێکی نەنووسیوە کە ئەو چاوەڕوانی ئەوەی لێ بکات بە گەرمی پێشوازیی لێ بکات و ئامێزی بۆ بکاتەوە. مرۆڤی خاوەنپەیام ئەوەندەی چاوی لە ژێدەری پەیامەکە و "پەردەی ئەسرار" و ڕەزامەندیی هزر و ویژدانی خۆیەتی، یەك لە دەی ئەوەش بیری لای دەستکەوتی مادی و بەرژەوەندیی تایبەت و دەستکەوت و قازانج نییە. ئامانجەکەی تا ڕادەیەك بە لێڵی دەمێنێتەوە:

**خاطرت جـــەم بۆ جـــەوهەریی لاڵسەنج**
**دانـای دورڕشناس، گـــەنجووری کژی گەنج**
**هـەر کـــەس وێنەی تۆ گەوهەر بارشەن**
**دانـــــا و بزورگان خـەریدارشـــــەن**

ستایشێکی زۆری خۆی دەکات و خۆی بە "دانای دورڕشناس" ناو دەبات و پێی وایە، یان سرووشی پشت پەردەی ئەسرار بەگوێی ئەویدا داوە کە هەر کەسێك وەکو ئەو "باری

گەوهەر" بێت، ئەوە کەسانی دانا و گەورە بە دڵنیاییەوە کڕیاری کاڵاکەی ئەون، چونکە ئەوان بەهای گەوهەرەکەی ئەو دەزانن و زۆر پەرۆش و چاوەڕوانن.

لە شیرین و خوسرەودا، ئەگەرچی ناوی هیچ میر و پاشا و گەورەپیاوێك نەهاتووە، بەڵام لە پشت گەردەلوولی ڕەوانبێژی و تەپوتۆزی گێڕانەوەی ڕووداوەکاندا، چەمکی "والی" و چەمکی "ویلایەت" بەدی دەکرێت کە ئاماژەیەکی ناڕاستەوخۆیە بۆ والیی ئەردەڵان. هەرچەند ئەو زەمانە لوڕستانیش والیی هەبووە، دووەمیان ئەگەرێکی لاوازە، چونکە خانا لە سنووری دەسەڵاتی ئەردەڵان و باجەڵاندا ژیاوە. سەردەمی نووسینی شیرین و خوسرەو ڕەنگە سەردەمی حوکمڕانیی "سوبحان وێردی خانی ئەردەڵان"[٢٤] بێت کە پێنج جار دەسەڵاتی لە دەست دەرکراوە. دوور نییە ئەمەش هۆیەك لە هۆیەکان بێت کە شاعیر بە لایەکدا خۆی ساخ نەکردبێتەوە، یان والی لەناو جەنجاڵی وەرگرتنی دەسەڵات و شەڕوشۆڕدا بووە و کاتی ئەوەی نەبووە پێشوازی لە شاعیری گەورەی ناوچەی ئەردەڵان بکات و شاکارەکەی بخوێنێتەوە و لە خۆیی نزیك بکاتەوە. دەسەڵاتی والی لەو کاتەدا، لەنێو لەپی مێردەزمەی ڕووداوەکاندا سەمای کردووە.

شاعیر ئەگەر لە دڵی خۆیدا، بیری لە دەسەڵاتێکی کوردی کردبێتەوە، ئەوە ئەو دەسەڵاتە، ئەو ڕۆژە، چارەنووسێکی نادیار چاوەڕوانی کردووە. ناکۆکیی ناوخۆ و دەستێوەردانی دەرەکی، سەرجەمی میرنشینەکەی لە ڕۆخی هەڵوەشاندنەوە و هەڵتەکاندن و ژێروژوور بوون نزیکتر کردۆتەوە. خانا دەنووسێت:

بەڵێ جە خانای عەطارید خامە
مونشیی وەصف زولف عەنبەر شەمامە
بە سەمع شەریف بشنەو حیکایەت
ئەر قەصدش خێرەن والیی ویلایەت

بـــــەجـــــای گوڵ زەمین مـــــاوەرۆ گـــەوهەر
ســــەنگ مبۆ بــــە لاڵ، خـــاکش بە عەنبەر
ئـــــــــــەر والی بێعـــــەدڵ شـەرارەتپیشـەن
بەدجینس، بـەدکار، دوور جـــە ئەندێشـــەن
وەڵگــــــەی مەملەکـــەت کەی مەعموور مبۆ
ئــــەیمەنی و ڕاحـــــەت جـــە خەڵق دوور مەبۆ
ل٢٨٣+٢٨٤

لەم پێنج بەیتەی سەرەوەدا ئەوە دەردەکەوێت کە شاعیر پیاوێکی سەربزێوی خاوەنهەڵوێست و چاونەترس و بوێر بووە، نەك بەرانبەر دەستەڵات سەرکز و چاوبەرەوژێر بووبێت.

ئەو پێی وا بووە: ئەگەر والی فەرمانڕەوایەکی دادپەروەر و مرۆڤێکی باش بێت، ئەوە لەبری گوڵ، گەوهەر لەسەر زەوییەکەی دەڕوێت و بەردی وڵاتەکەی دەبێتە لاڵ (لعل) و خاکیشی دەبێتە عەنبەر، بەڵام ئەگەر والی بەدکار بێت و خاوەن بیر و ئەندێشە نەبێت، میرنشینەکەی ئاوەدانی بەخۆیەوە نابینێت و خەڵکیش لێی بێزار دەبێت.

**دادپەروەریی کۆمەڵایەتی**

لایەنێکی گرنگی تێگەیشتن و پێداگرتن و داواکاریی قوبادی، جەختکردنەوەیە لەسەر عەدڵ و داد و ڕاست و ڕەوان ئامۆژگاریی دەستەڵاتدارانی کردووە کە دەبێ دادپەروەر بن و ڕێگە نەدەن زوڵم و زۆر بکرێت. ئەو لەسەر شانۆی ڕووداوی نێوان خوسرەو و دێهاتییەکان بۆ سەردەمی دەستەڵاتی هورمز و شازادەی جێنشین دەمان گێڕێتەوە و وەسفی دەستدرێژیی یەکێك لە پیاوەکانی خوسرەو دەکات کە هەڵسوکەوتێکی نا دادپەروەرانە و ستەمکارانە

بەرانبەر گوندنشینەکان دەکات. شاعیر ڕووداوەکە زەق دەکاتەوە و پێ لەسەر کێشەی دادپەروەری و ستەم و زۆرداری دادەگرێت:

ئــــــەسپش کشتزار موسلمانـــــان وەرد
غولامش قـــۆرەی دیهقان بـــە جەور بەرد
ئـــــەر ظولمێ وەی طەور بێگانان مەکەرد
شەهەنشا یـــانــــەش بـە غارەت مەبەرد
بــــەلێ هەی جەم قەدر فەرەیدوونیی شان
بــــەدوورەن جــە عەدڵ نەوەی نەوشیروان
هـــورمز ئێد شنــــەفت دەروونش جۆشا
جـــــە ڕووی عەدڵ و داد خیشمش خرۆشا
(ل٣٠)

شاعیر دەربارەی ڕووداوێك دەدوێت کە دوور نییە بەرهەمی خەیاڵسازیی خۆی بێت، لە چرکەیەکدا کە خوسرەو مەست و بێئاگا دەبێت، غولامێکی ئەسپەکەی بەرەڵلا دەکاتە ناو کشتوکاڵی جووتیاران، ئەوانیش سکالای خۆیان دەبەنە لای هورمز کە نادادپەروەری و زوڵمێکی گەورە لە لایەن غولامێکی شازادەی جێنشینەوە لەوان کراوە.

شا سزایەکی زۆر قورس بۆ کوڕەکەی خۆی دەبڕێتەوە و گوێ ناداتە ئەوەی کە تاوانبار کوڕەکەی خۆیەتی و زوڵملێکراو جووتیارێکی بێ پشت و پەنایە:

فـــــەرزەندێ وێنەی خــــەسرەو فــــــەرزانە
بکــــەریش وە پــــــەند سەرکۆنـــــەی تانە
جـــــە لای ســــــەلاطین سکـــــەندەرنەژاد
هــــــــەر بەی طەور مبۆ رەویەی عەدڵ و داد
(ل٣١)

گێڕانەوەی ئەم ڕووداوەی نێوان خەسرەو و باوکی، ئەوەندەی پەیوەندیی بە ڕۆژگاری خاناوە هەیە، ڕەنگە کەمتر پەیوەندیی بە سەردەمی چیرۆکەکەی خەسرەو و هورمزەوە هەبێت. لەوانەیە ئەرکی شاعیر ئەوە نەبووبێت سەرنجی خەڵك بۆ ستەم و زۆرداری و نادادپەروەریی ئەو سەردەمەی خۆی ڕاکێشابێت و ئەفسانەکەی بۆ مەبەستێکی سیاسیی شاراوە بەکار هێنابێت:

جـــــە لای ســــەلاطین سکـــەندەرنـــــەژاد
هـــــەر بــــــەی طەور مەبۆ رەویەی عەدڵ و داد
مــــــەعلـووم بـــۆ جـــــــە لای بزورگان دەور
هەرکەس عـــادڵ بۆ چـــون هــورمز بەی طەور
بــــــەرگوزیــدەی ذات حــــــــەیی ئـــەکبەرن
مەحفووظەن جـە نــار ئـــــەر ســـەد کافرەن
خـــانــــــــا بۆ وەســـەن زوبـــــاندرازی
کۆن ئـەو صاحیب عەدڵ تۆ پێش بنازیی (ل٣١)

دوابەیتی ئەم کۆپلەیەی سەرەوە، کرۆکی پەیامی سیاسی و کۆمەڵایەتیی شاعیرە. ئەو لەگەڵ خۆیدا دەدەوێت و پێی دەڵێت:

"بەسە زماندرێژی!" ئینجا پرسیارێك لە خۆی دەکات: "ئەو کەسە دادپەرەوەرە لەکوێیە کە تۆ پێی بنازیت؟" کاك موحەممەدی مەلا کەریم لە زۆر شوێندا هێمای پرسیار و نیشانەی سەرسووڕمانی داناوە و خاڵبەندیی ڕێکوپێکی کردووە کەچی پاش ئامرازی پرسیار (کۆن؟) نیشانەی پرسیاری فەرامۆش کردووە. ئەم پرسیارە هەروا لە خۆڕایی نەکراوە. شاعیر ویستوویەتی ئەوە بدرکێنێت کەسێکی لەبەرچاودا نییە شانازیی پێوە بکات، بۆ ناتوانێت

شانازی بە کەسایەتی، یان سەرکردەکەیەوە بکات؟ ئەو لەسەر نەخشەی سیاسیی کوردستان کەسێکی دادپەروەری (صاحب عەدڵ) بەرچاو ناکەوێت شایانی شانازی پێوەکردن بێت.

چەند بەیتێك پێشتر، بەم شێوەیە شاعیر ئاماژەی بۆ گەورەپیاوانی سەردەمی خۆی کردووە:

**مـــــەعلووم بۆ جـــــە لای بزورگان دەور**
**هەر کەس عادڵ بۆ چون هورمز بەی طەور**

ئەگەر دادپەروەر بن وەکو هورمز خوا لە ئاگر دەیان پارێزێت، ئەگەر سەد جار کافریش بن. گرنگ دادپەروەرییە لای شاعیر، نەك بڕواهێنان بە دین و ئیمان. لای خواش هەروایە، هەر کەسێك دادپەروەر بێت وەکو هورمز لە ئاگری دۆزەخ پارێزراو دەبێت. ئەو لێرەدا بانگەشە بۆ دادپەروەریی کۆمەلایەتی دەکات و داوای لە گەورە پیاوانی سەردەم کردووە لە شەقامەڕێی دادپەروەری لانەدەن. لەم خاڵەدا خانا لەگەڵ ئەحمەدی خانیدا یەك دەگرێتەوە کە هەردووکیان بانگەشەیان بۆ دادپەروەری کردووە.

زۆر پێویستە لە کۆتاییی ئەم برگەیەدا ئاماژەیەکی خێرا و تەمومژاوی لەبەرچاو بگرین کە بۆ خوێنەری ئەمڕۆی کورد تێگەیشتنی ئاسان نییە:

**ئەر چون نەسیمی مەکەنان پۆسم**
**هەرتا زیندەنان هـەر تۆنی دۆسم**

بۆ ئەم بەیتە، بەیتێکی داخراوە و تێگەیشتنی ئاسان نییە؟

خانا خۆی دەخاتە جێگەی "نەسیمی"یەوە، یان لەناو پێستی ئەودا خۆی دەدۆزێتەوە. با ئێمە پێشەکی بزانین نەسیمی کـێیە؟

عیماد ئەلدینی نەسیمی (١٣٦٩-١٤١٧ز) یەکێکە لە شاعیرە سوفییە گەورەکان و بە عەرەبی و فارسی و تورکی شیعری هەیە. بە یەکێك لە پێشەوا ناسراوەکانی ڕێبازی "حروفیە" دادەنرێت. ساڵی (١٤١٧ز) لە شاری حەلەب، لەسەر فەتوای پیاوە ئایینییەکانی

شام هەر بەزیندوویەتی پێستی دەگروون و پاشان پارچەپارچەی دەکەن. ئێمە ئەگەر زانیمان "حروفییەکان" ڕێبازێکی شۆڕشگێڕ بوون و دژی دەسەڵاتی سیاسی و ئایینیی سەردەمی خۆیان بوون و بۆ دادپەروەریی کۆمەڵایەتی خەباتیان کردووە، ئەوجا دەردەکەوێت خانای قوبادییش لە کام سەنگەردا بووە و بۆ ئەوەندە لەسەر عەدڵ و دادپەروەریی کۆمەڵایەتی جەخت دەکات؟

**دەستکراوە و دەستنووقاو**

خانای قوبادی شانبەشانی بانگەشە بۆ دادپەروەری و عەدل و گەورەیی، داوای کردووە کە فەرمانڕەوا دەبێ بەخشندە و دەستکراوە بێت:

بـــەڵێ هــــەر کەسێ صاحێب ئەندێشەن
عالی هیمەتـــەن، ســەخـــاوەت پیشەن
ئـــەر دەرکارتــــەن ســـەعد بۆ ئـەنجامت
چـــۆن بەعضێ بزورگ مـــەنشوور بۆ نـــامت
بـــا بــــەسەخاو مەیل، بە بەخشش خووت بۆ
کاففەی خـــاص و عـــــام هەر دوعاگووت بۆ
ئـــەمـــانـــەت فـــەرضەن، خەسیس گومڕاهـ
مــــەوانـــەش بزورگ ئـــەر مبۆ بـە شاهـ
پەی چێش؟ کە خەسیس چەم تەنگ چون گورگەن
چـــەم تـــەنگ خـــەسیس جە کۆ بزورگەن؟
حـــەق پـــەی ئێد بـەخشان بە تۆ ماڵ و گەنج
بدەی، ببـــەخشی بێ لار و بێ لــــــــەنج

خـــــۆ وێت مزانیی گــــەنج و مـــاڵ تەمام
بـــــەجـــا مانۆ ئـــاخر ســـەرئـــەنجام
قـــاروون کـــــە تـــــەپڵ گـــەنجش مەژەنیا
غـــەیر جـــــە ئاه سەرد چێش بەرد جە دنیا؟
ســـــا تۆیچ چۆن خـــەسرەو جام جەمشید جەم
مـــەرتـــەبــــــەی شاهـــیـــش ذەڕڕە نەبـــیی کەم
(ل٤٤٤)

دوابەیت ئاراستەی فەرمانڕەوای سەردەم کراوە "ساتۆش وەکو خەسرەو" مەبەستی کەسانی ناو چیرۆکە شیعرییەکە نییە، بەڵکو کەسانی ناو کۆمەڵی ئەوکاتەیە کە هاوچەرخی خانا بوون. ئامۆژگاریی ئەم بە کورتییەکەی ئەوەیە کە پیاوی دەستنووقاو ناتوانێت گەورە بێت.

پێیوایە پیاوی ڕژد و چرووك ئەگەر بوو بە "شا"ش ناتوانێت گەورە بێت. واتە: ئەو گەورەیی بە پلەوپایە و پۆستی سیاسییەوە گرێ نادات. گەورەیی دەستەڵاتدارێك بە دەستکراوەیی و بەخشندەیی و دەستودڵباشییەوە گرێ دەدات. دیارە خانا لەگەڵ دەستەڵاتدارێکی سووك و چرووك و دەستنووقاودا هەر زۆر بێزار بووە، بۆیە ئەوەندە زووخاوی هەڵ ڕشتووە.

شاعیر زۆر جار لە تێکستەکە دوور دەکەوێتەوە، هەر بۆ ئەوەی پێ لەسەر دادپەروەری و کۆتاییهێنان بە زوڵم و زۆر و چەوسانەوە دابگرێت. ئەو لە برگەیەکدا بەم شێوەیە لەسەر خوسرەو دەدوێت:

ویلایەت بــــە عـــــەدڵ تەمام مەعموور کەرد
جــــە مەظڵوومان ظوڵم ظاڵمان دوور کـــــەرد

وەختێ جـــە ڕای عـــــەدڵ ڕەویـــەی سەروەری
خەڵاص بی جـە شـــوغڵ ڕایەتپەروەری (ل١٥٤)

لە شیعری کلاسیکیی کوردیدا ڕەنگە خانا تاکە کەسێك بێت کە دەستەواژەی "ڕایەتپەروەریی" بەکارهێنابێت و بڕوا ناکەم پێش ئەو، یا پاش ئەو، ئەم چەمکە بەکارهێنرابێت، چونکە فەرمانڕەوای ڕۆژهەڵاتی دووسەد و حەفتا و دوو ساڵ پێش ئەمڕۆ، نەیتوانیوە دەستەڵاتدار بێت و ڕەعیەتپەروەر بێت. تەنانەت شاعیر و نووسەرەکانیش لەسەر ئەم دەستەواژەیە هیچ هەڵوەستەیەکیان نەکردووە، بە سەرزارەکی و شێوەی شاراوە و پێچ و پەنا، ئاماژە بۆ ئەم دەستەواژەیە نەکراوە.

**کەوانەی دەستکاری**

هەر شارەزایەکی زمانی فارسی و کوردی، لە نێوان (خسرو و شیرین)ی نیزامیی گەنجەوی و شیرین و خەسرەوی خانای قوبادیدا بەراوردێکی ڕەخنەگرانە بکات، هەر یەکسەر دەگاتە ئەو بڕوایەی شاعیری گەورەی کورد ئەوپەڕی مافی ئازادی و سەربەستیی، بە خۆی بەخشیوە دەستکاریی شاکاری یەکەم بکات. ئەو بە گوێرەی تێگەیشتن و ئاستی ڕووناکبیری و گۆڕانکاری و ڕۆحی سەردەم، دیکۆری دەرەوە و ناوەوەی ڕۆمانە شیعرییەکەی گۆڕیوە و لە چێژ و ئارەزووی خوێنەری کوردی سەردەمی خۆی نزیکی کردۆتەوە. زۆریش گوێی نەداوەتە بنەما و ڕێساکانی زانستی وەرگێڕان.

ئەو لە بەرگەوە بۆ بەرگ، دەستکاریی شاکارەکەی نیزامیی کردووە و تەنیا ڕۆح و تان و پۆی سەرەکیی چیرۆکە شیعرییەکەی هێشتۆتەوە. ناونیشانی بەرهەمەکەی نیزامی (خسرو و شیرین)ە کەچی خانا ڕێگەی بە خۆی داوە، ناونیشانەکەش بۆ "شیرین و خسرەو" بگۆڕێت.

خانا خۆی ئەوەمان بۆ ڕوون ناکاتەوە لەبەر چی خۆی بە وەرگێڕانی بەیت بە بەیتی خوسرەو و شیرین نەبەستۆتەوە. ئەو چۆن بۆی لوابێت و بەدەستییەوە هاتبێت، بە میزاج و

تێگەیشتن و ئارەزووی خۆی گێڕانەوەی چیرۆکە شیعرییەکەی کورداندووە. ئەگەر من لەبری نیزامی بوومایە و چاوم بە کارەکەی خانا کەوتبایە، بە ڕەسمی نارەزاییی خۆمم لە ڕێگەی ئامرازەکانی میدیاوە ڕادەگەیاند.

ڕادەی دەستکاری لە پانتایی و ئەمسەر و ئەوسەری وەرگێڕانەکە، بە شێوەیەکە، بە دوو دێڕ و سێ دێڕ بەرجەستە ناکرێت. تەنیا پاش خوێندنەوەی دەقە فارسییەکە، قەوارە و شێوەی گۆڕانکارییەکە دەردەکەوێت. ئەگەر ئەمڕۆ کەسێك کارەکەی خانا سەرلەنوێ وەربگێڕێت، ڕەنگە کەم کەسی فارسیزان بە دڵنیاییەوە بتوانێت، سەرەداوەکان بخاتەوە سەریەك و ئەو ڕاستییە بدۆزێتەوە کە ئەمە شاکارەکەی نیزامییە و کراوەتە کوردی، پاشان یەکێك لە کوردییەوە، سەرلەنوێ بۆ فارسی وەری گێڕاوە. خانا پتر بایەخی بە چیرۆکەکە داوە و هەرچی لایەنی ڕەوانبێژی و دەربڕینە لە قالّبی (پەند) و (حکمە) (حیکەمیات) کەمتر جێگای سەرنج و بایەخی ئەو بووە.

١. ئایا خانا کەسێك بووە زۆر چاك خۆی ناسیبێت و لە توانا و بەهرەمەندیی خۆی تێ گەیشتبێت و شانازیی بە خۆیەوە کردبێت؟ ئایا ئەو بە شێوەی ڕاستەوخۆ و ئاشکرا شانازیی بە توانای دارشتن و ڕەوانبێژیی خۆیەوە کردووە، یان بە شێوەی شاراوە و ناڕاستەوخۆ، هەستی خۆی دەربڕیوە؟

لە چەندین بەیتدا ئەو خۆی بە شانازییەوە، نێوی خۆی بردووە و خۆی بە شاعیری "دورشناس" ناساندووە:

ئەر صاحیب عەقلی، پڕ شـوعوور و هۆش
بۆ وەعـظ (خانـا) بگێرە نــــــەگــۆش(ل٤٤٨)

یەکێك لە شێوەکانی شانازیکردن ئەوەیە شاعیر لەبری ئەوەی چاوەڕوانی ئەوە بێت خەڵك ستایشی بکەن و سەرسوڕمانی خۆیان دەربڕن، نەك ئەو خۆی خۆی پەسەند بکات و بە شان و باڵی خۆیدا هەڵبدات. نیزامیی گەنجەوی دوو سێ جارێك لە شاکاری (خسرو و

شیرین)دا نێوی خۆی بردووە. بەڵام خانا نزیکەی (٢٠) جار بە ستایشەوە نێوی نیزامیی بردووە:

**وێنــــەی (نیظامی) صەیقەل دەر زەینم**
**بە سورمـەی دانش رەوشەن کەر عەینم**

***

**(عزیز القدر)ێ ئەو چـون (نیظامی)**
**بپەرسۆ تەئریخ ئەی نـــــامەی نامی**
**(أفضل الشعراء) نـــــــادیرەی نامی**
**صاحیب خەمسە، یەعنی (نیظامی)**

بیست جار ناوهێنانی نیزامی، لەوانەیە بیگێڕینەوە بۆ ئەوەی نیزامی خاوەن شاکاری خوسرەو و شیرینە! وەرگێڕ بە گوێرەی میتۆد و تەکنیکی خۆی، گێڕانەوەکە دەداتە پاڵ نیزامی. ئەوە پێویستیی وەرگێڕانە شاعیری ناچار کردووە ناوی خاوەن شاکارەکە بهێنێت، بەڵام هۆی چییە خانا نزیکەی (٢٠) جار ناوی خۆیشی دەهێنێت؟

ئایا ئەمە کاری ڕێکەوت و چرکەی بێئاگاییە، یان کاریگەری و ڕەنگدانەوەی "بنهۆش"ە و نێوی خۆی بیست جار لە پاڵ نێوی نیزامیدا نووسیوە؟ بنهۆش کاریگەری و ڕەنگدانەوەی خۆی هەیە و قوبادی ڕەنگە هەر ئاگای لەوە نەبووبێت کە (٢٠) جار نێوی نیزامیی هێناوە و دەبێ بیست جار نێوی خۆیشی بهێنێت! ئێمە لە سەردەمی کۆمپیوتەر و تێلەکۆمۆنیکاسیۆندا قەت بیر لەوە ناکەینەوە کە چەند جار نێوی کەسێکمان هێناوە دەبێ ئەوەندەش ناوی خۆمان بهێنین، بەڵام "بنهۆش" هەندێك جار، کاری ئەوتۆ بەرهەم دەهێنێت کە بە خەیاڵی کەسدا نایەت.

شاعیری گەورەی کورد بەلایەوە ئاسان نەبووە کە بە ڕاشکاوی ئەوە بنووسێت: "کە من هیچم لە نیزامیی گەنجەوی کەمتر نییە و من شاعیری مەزنی ولاتی خۆمم" بەلام ئەو زانیویەتی نیزامیی نیزامییە و نابێ ڕاست و ڕەوان و بەبێ پێچ و پەنا خۆی بە هاوشان و هاوقەڵەمی شاعیری گەورەی گەنجە بزانێت، چونکە ئەوە لەسەری هەر زۆر گران دەوەستێت. ئەوە تەرازووی ئەقڵ و هۆش و ئاوەزی مرۆڤە کە لە بەردەم تیر و توانجی کۆمەڵ نابێ شووڵی لێ هەڵ بڕێت. بەلام حوکم و پێوەری بنهۆش زۆر جیاوازە و کەناڵ و فۆرمی دەربڕینش هەر زۆر جیاوازە.

شاعیر کاتێك دەستی داوەتە قەڵەم و جڵەوی بۆ ئەسپی خەیاڵ شل کردووە، ئاگای لە خوڕەی بارانی هۆنینەوە و چوارناڵی ئەسپەکەی نەماوە. هەر یەکسەر چۆتە بەرگی شاعیری گەنجەوە و پێیوابووە "شێلە هیچی لە بێلە کەمتر نییە" بەلایەوە زەحمەت بووە بەرانبەر گەورەییی نیزامی خۆی یەکجار بچووك بکاتەوە. بۆیە ئەم یەکسانییە لە ناوهێنان، جۆرێکە لە ڕاگرتنی پارسەنگی دەروونی لە چرکەیەکی نائاگاییدا لە نێوان دوو لووتکەدا، با شاعیری بەناوبانگی کورد لەسەر ئاستی جیهاندا هیچ دەنگ و ڕەنگی نەبێت، ئەوە هۆکاری تری هەیە کە یەکێکیان نەبوونی دەوڵەتی کوردییە.

قوبادی لە چەند بەیتێکیدا خۆی لەگەڵ "جامی"دا بەراورد دەکات، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی چەند خۆی بە شاعیرێکی گرنگ داناوە:

بشۆ بــــە فـــــامدا (خــــانــــا)ی جــــامی طـور

کام زەڕ بەفت پۆش بی نەڕووی عەرەصەی دەور، ل٢٧٩

٢. نیزامی لە خوسرەو و شیریندا ئاماژەی بۆ ناوی گەلانی جیاجیا کردووە و هەر یەکەش بۆ مەبەستێك وەکو ناوی کورد، تورك، ئەبخاز، ئەرمەن... هتد.

خانای قوبادی لە شیرین و خوسرەودا، سەرەڕای دووبارەکردنەوەی ئەو ناوانەی شاعیری گەورەی گەنجە کە لەناو شاکارەکەیدا جێگای کردوونەتەوە، لە سۆنگەی ئەو ناوهێنانەوە

زانیارییەکی زۆری لەسەر خۆی و دەوروبەرەکەی ڕادەستی ئێمە کردووە، ناوی چەندین وڵاتی تری هێناوە. من بۆم ڕێك نەکەوت لیستێك بۆ ناوەکان بکەم و ناوەکان یەك بە یەك بژمێرم و مەبەستی ئەو ڕوون بکەمەوە کە بۆ شاعیر ئەوەندە جار ناوی "ڕووس" و "ڕووسی"ی هێناوە؟

**بـــە ڕەسم شـــاهان فـەرەنگیی و ڕووسیی**

**بکەرۆش بە عەقد نیکاح عورووسیی، ل٤٣٦**

ئەم بەیتە پاشتر لە بۆنەیەکی جیاواز و لە چوارچێوەیەکی تردا دووبارە کراوەتەوە:

**جە میصریی و چینی و سوقلاییی پەڕەند**

**جـــە مـەنسووج هیند دێبای دڵ پەسەند**

**بـــــاوەرۆ بــە ڕەسم شـاهـــان ڕووسیی**

**بکەرۆم بە عەقد نیکاح عرووسیی، ل٥١١**

ئێمە ئەگەر زانیمان مەبەست لە "پەڕەند" ئاوریشمە و مەبەسـت لـە "دێبـا" جـۆرە قوماشێکی ئاوریشمی ڕەنگاورەنگە، ئەو کاتە دەزانین، لە سەرەتای سەدەی (١٨ز) دەنگ و باس، یان کاڵای دڵپەسەندی وڵاتی جیاجیـا گەیـشتۆتە کوردسـتان. "مەنـسووج هینـد" ئاماژەیەکی ترە بۆ فرۆشتن و خستنەڕووی بەرهەمی پیشەسازیی ئینگلیـزی- هینـدی لـە بازاڕەکانی کوردستاندا.

ئەم بابەتە لە بەشی تری شیرین و خەسرەودا بـە شـێوەیەکی تـر دووبـارە کراوەتـەوە، مەبەست سەرەتاکانی تیشکدانەوەی شۆڕشی پیشەسازییە.

ئەو نزیکەی (٢٠) جار وشەی "فەرەنگ" دووبارە دەکاتـەوە. ئەمـە خـۆی لـە خۆیـدا نیشانەی ئەوەیە کە شاعیر چەند فروسمای دەنگوباسی "فەرەنگ"ی پێش شۆڕشی فەرەنـسا (١٧٨٩ز) بووە. هەر چـەندە مەبەسـت لـە فـەرەنگ و فەرەنگـستان تـەنیا "فەرەنـسا"

(France) نییه و فەرەنگ زاراوەیەك بووە هەموو ئۆرووپای ئەو سەردەمەی گرتۆتەوە. لە ڕووی مێژووییەوە کاتێك "فرانك"ەکان بە سەرۆکایەتی کارڵی گەورە، دەوڵەتی "فرانك"یان دامەزراند، زۆربەی وڵاتانی ئۆرووپای لەخۆ گرتبوو.

لەم بیست جارەدا کە نێوی "فەرەنگ" هاتووە، هەندێك جاری بۆ ڕاگرتنی کێش و سەروا بووە، بەڵام وێرای ئەوەش مەبەستێکی تری لە پشتەوە بووە:

**جە دێیای نەفییس کارخانەی فەرەنگ**

**کێشا پێشکەشش بە صەد هەزار ڕەنگ، ل١٦٨**

**ئەبرۆش چۆن کەمان کارخانەی فەرەنگ**

**نەگۆش تا بەگۆش کێشابێ پەی چەنگ، ل٦٣٣**

**هۆرداشت لیباسان ڕەنگین ڕەنگ ڕەنگ**

**هەم پارچەی زەڕباف خولاصەی فەرەنگ، ل٧٥٠**

**ها وەختەن بە چرب قوڵنگەی سەنگیی**

**بەتیشەی دەسکار ئوستای فەرەنگیی، ل٣٩٨**

ئەم چوار نموونەیە بەڵگەن لەسەر ئەوەی خانا زانیاری و ئاگادارییی زۆری لەسەر بەشێك لە پیشەسازیی ڕۆژئاوایی هەبووە کە دوور نییە گەیشتبێتە شارەکانی ئێران و کوردستان. من بڕوا ناکەم کارتێکردن و فروسمان تەنیا لە ڕێگەی خوێندنەوەی کتێب و نامیلکە و قسەی ناو دیوەخان و بازاڕ و دووکان و قەیسەری بووبێت، بەڵام ئەم هەموو دەست داگرتن و جەختکردنە لەسەر وشەی فەرەنگ هەر دەبێ بنەمایەکی مادیی هەبووبێت و خانا بە چاوی خۆی لەناو بازاڕەکانی ئێران و کوردستاندا کاڵای جۆراوجۆری ئۆرووپیی بینیبێت و شەیدای جۆرایەتی و جوانی و ڕێکوپێکیی کاڵاکان بووبێت. هەر دەبێت ئەو سەرسووڕمان و فروسمانە وای لە شاعیری گەورەی کوردستان کردبێت پرسیارئاژنی بازرگانەکانی کردبێت. دەربارەی "کارخانەی فەرەنگ" و "زەڕباف خولاصەی فەرەنگ" و "دەسکار ئوستای

فەرەنگی" و هەر هەموو زانیارییەکانی بە ئەوپەڕی پەرۆشی و بایەخەوە لە دڵدا چەسپیبێت.

بێگومان نیزامی (١١٣٥-١٢١١ز) لە ماوەی تەمەنیدا بەشێك لە مێژووی ڕۆم و یۆنانی زانیوە و دەنگوباسی شەڕی خاچپەرستانی بیستووە و بەرەنگاری و هێرشی سەلاحەدینی ئەیووبیی بەرگوێ کەوتووە، بەڵام ئەو شتێکی ئەوتۆی لەسەر "فەرەنگ" و "کارخانەی فەرەنگ" لە خوسرەو و شیریندا نەنووسیوە. ئەوەی خانا لە "شیرین و خوسرەو"دا دەربارەی "فەرەنگ" دەری بڕیوە، تەنیا حەز و ئارەزووی خۆی بووە و بەرهەمی بیرکردنەوە و لێکدانەوەی خۆی بووە دەربارەی فەرەنگ.

من لێرەدا نامەوێت یەکێکی وەکو خانا بکەمە پێشەنگی مۆدێرنە و ڕۆشنگەریی کوردی، بەڵام ئەوەی لەم بەرهەمەی ئەودا بەرچاو دەکەوێت، نابێ هەروا بەلایدا تێپەڕین و بە وردی سەرنجی بۆچوون و تێگەیشتنی شاعیر نەدەین. بێگومان قسەکانی من دەبێ لەگەڵ تێبینی و بیروڕای مامۆستا موحەممەدی مەلا کەریم گرێ بدرێت کە خانا ئاماژەی بۆ پەیوەندی و شێوەی داوا و خستنەڕووی بازاڕ دەکات.

٣. نیزامی هەر زۆر بەوردی ئاگاداری هەندەسەی نەخشەسازی و تانوپۆی شاکاری خوسرەو و شیرین بووە. ئەو بەباشی ئاگاداری بیروبۆچوون و سەردەمی کەسایەتی و پاڵەوانەکانی ناو چیرۆکە شیعرییەکە بووە. ئەو زانیویە چیرۆکی شیرین و فەرهاد و خەسرەو دەگەڕێنەوە بۆ پێش ئیسلام و لە دوا بەشەکانی چیرۆکەکە ئیسلام بەسەریان دەکاتەوە.

خانای قوبادی لە زەمانێکدا ژیاوە کە ئایینی ئیسلام لە کوردستاندا ڕەگ و ڕیشەی خۆی پتر داکوتاوە. شاعیر لەبەر هەر هۆیەك بووبێت، بەلایەوە ئەستەم بووە پابەندی دەقە فارسییەکە بێت و ڕادەی دەستکاری لە سنوورێکی تەسکدا بهێڵێتەوە. دیارە سۆز و

تێگەیشتنی ئایینیی خۆی بەسەر دارِشــتن و قــاڵبی بیناســازیی فیکریــی چیرۆکەکە زاڵ کردووە.

بـــە ڕەنج بــــەردەش ئـــەر تۆ نەزانی
دوورەن جە ڕەویەی ڕای موسڵمانی، ل٣١٨

ئەمە قسەی فەرهادە کە ئاڕاستەی خەسرەو کراوە. ئەگەر ئەم داستانە پێش ئیسلام ڕووی دابێت، چۆن فەرهاد لە فەرهەنگی ئیسلامەوە ئەم ڕستەیە بە ئەمانەت وەردەگرێت؟

ڕاهیبان بــــە ڕەسم ئـــــاداب ئـــەوجا
وەندشـــــان صیغەی نیکاحش پـــــەی شا
شـــا وێنــەی نــــەسیم تـــا پەنەش یاوا
غونچـــەی نـــــەشکفتـــەش دەرلاد شکـــاوا
دیش جـــە بـــــەکارەت ئـــــەو شۆخ دڵدار
دەستماڵ ڕەنگین کەرد چۆن لالەی وەهار، ل٤٦٩

لە هەردوو کارەکەی نیزامی و خانادا، مێژووی ژیانی شەکر ئەسفەهانی زانراوە کە لــە بازاڕی لەشفرۆشیدا کاری کردووە. ئەمەی خانا دای ڕشتووە، هیچ پەیوەندییەکی ئەوتۆی بە کارەکەی نیزامییەوە نییە. پاشان کە خەسرەو سەردانی شــیرین دەکــات، ئینجــا دیمــەنێکی ڕۆمانسیمان پێشکەش دەکات:

چـــەنیی چـــەند مینای بلوور بێ گەرد
گشت پڕ شەراب چۆن یاقووت زەرد، ل٥٠٢

ئەم جۆرە لە بەیەکگەیشتن و شەراب تێکردنە کە ژن و پیاوێك پێکەوە پەرداخ بە دەستەوە بگرن و... هتد، لە ئــەدەبیاتی ئــەمڕۆی وڵاتــە موســوڵمانەکاندا کــەمتر بەرچــاو دەکەوێت، چ جای هەشتسەد ساڵ، یان دووسەد و شەست و دوو ساڵ پێش ئێستا.

## چەمکی دەوڵەت

نیزامیی گەنجەوی لە چەند شوێنێکی شاکاری خوسرەو و شیریندا، ئاماژەی بۆ چەمکی دەوڵەت کردووە و بیروڕای خۆی لەسەر ئەو دامەزراوە سیاسییە دەربڕیوە. بێگومان ئەو چەمکی دەوڵەتی لەگەڵ چەمکی ستەم و ستەمکاریدا گرێ داوە کە بە عەرەبی (لازم و ملزوم)یان پێدەگوترێت، واتە ئەمیان بەبێ ئەوی تر نابێت. ئەم چەمکەش لای ئەو بنەمایەکی گرنگە لە چەمکی "دادپەروەری" و "دادپەروەریی کۆمەڵایەتی" کە شاعیر لە شیعرەکانیدا زۆر جەختی لەسەر کردووە. دیارە نیزامی ویستوویەتی تێگەیشتنی خۆی لەسەر دادپەروەری ڕوون بکاتەوە، بۆیە لە بەیتێکدا "ستەم"ی وەکو پێچەوانەی چەمکی "ڕێبازی دەوڵەت" داناوە لە ڕەوایەتی و ناڕەوایەتی پێ بەخشین و شەرعییەت پێدان و لەدەستدانی شەرعییەت وێنا بکات:

ستم در مذهب دولت روا نیست

که دولت با ستمکار آشنا نیست، ص١٦٢

بەیتەکەی حەکیمی نیزامی کە پێش نزیکەی هەشتسەد ساڵ نووسراوە، دەتوانرێت ئەمڕۆ بە کرۆکی چەمکی دەوڵەتی قانوون و دەوڵەتی سۆسیال دابنرێت. شاعیر ستەم لە مەزهەبی دەوڵەتدا بە ڕەوا دانانێت. واتە: ئەگەر دەوڵەت ستەم و زوڵم و زۆر و زەبروزەنگی بەکار هێنا، ڕەوایەتیی خۆی لە دەست دەدات. دەوڵەت لەگەڵ ستەمکاردا ئاشنا نییە واتە ئەوانەی ستەمکاری دەکەن دەبێ لەناو دامەزراوەکانی دەوڵەتدا پاك بکرێنەوە، چونکە دامەزراوەی دەوڵەت لەگەڵ ستەمکاردا ئاشنا نییە و لەگەڵ یەکتردا ناگونجێن. سەیر ئەوەیە تیۆرییە مۆدێرنەکانی دەوڵەت، بە تایبەتی ئەوانەی سەر بە قوتابخانە و ڕێبازی مارکسیزمن پێیان وایە دەوڵەت ئامرازی چەوساندنەوەی چینێکە بە دەست چینێکی ترەوە. دەوڵەت و ئامرازەکانی زەبروزەنگی ئاشکراو و شاراوە، داکۆکی لە قازانج و بەرژەوەندیی

چینێك دەكەن دژی چینێكی تر. بەشێك لە تیۆریسیۆنەكانی دەوڵەت لە ڕۆژگاری ئەمڕۆدا پێیان وایە دەوڵەت دامەزراوەیەكی هاوبەش و ناوكۆییی هەموو چین و توێژەكانی كۆمەڵە و دەیەوێت ئاشتیی كۆمەڵایەتی جێگیر بێت و بپارێزێت و هەریەكە لە ڕێگەی دامەزراوەكانی دەوڵەتەوە هەوڵ بدات بەرژەوەندییە چینایەتییەكانی بەدی بهێنێت. خانای قوبادی لە چەند شوێنێكی شیرین و خەسرەودا، ئاماژەی بۆ چەمكی دەوڵەت كردووە كە شایانی سەرنج و لێكدانەوە و ڕامانە:

**هیچ كـــەس جـــەی دنیای ئاشفتەی پڕ شۆر**
**دامـــان دەوڵـــەت نـــەگرتەن بـــە زۆر**
**دەوڵـــەت نـــە بـــە زۆر نە بە كردارەن**
**دەوڵەت هەر بـــە داد پەروەردگارەن، ل٢٩٨**

ئەم دوو بەیتە لە لایەكەوە دەنگدانەوە و وەرگێڕانی شیعرەكەی نیزامیی گەنجەوین: "كەس نەیتوانیوە لەم دونیایەدا دامێنێ دەوڵەت بە زەبروزەنگ دەستەبەر بكات" لە بەیتی دووەمدا، بە ڕاستەوخۆ چەمكی "داد" كە "داد پەروەردگار"ە دەكاتە مەرجی دەوڵەتداری. كەواتە هەر كەسێك بیەوێت جڵەوی دەوڵەت بە دەستەوە بگرێت و حوكمداری بكات، دەبێ "بە داد پەروەردگار" ئیدارەی وڵات بگرێتە دەست، نەك بە زوڵم و زۆر و نادادپەروەری و ویستی خۆی بسەپێنێت.

خانا كە زۆر پابەندی وەرگێڕانی حەرفی نەبووە و كەوانەیەكی فراوانی ئازادیی وەرگێڕانی بە خۆی داوە، لە مەسەلەی "چەمكی دەوڵەت"دا، ئەو بە هەر هۆیەكەوە بوو بێت، تێگەیشتن و لێكدانەوەی خۆی خستۆتە ڕوو. دیارە نیزامی، دەربارەی "دەوڵەت" بە شێوەیەكی چڕوپڕ و ڕوون بۆچوونی خۆی داڕشتووە، كەچی خانا دەربارەی "دەوڵەت" لایەنی ڕەوانبێژی و وێنەی شیعری و مۆسیقای وشەكانی زاڵتر كردووە. شاعیر لە زمانی خوسرەوەوە كە بۆ جاری دووەم تاجی شایەتی لەسەر دەنێت و هەر بیری لای شیرین دەبێت و بەم شێوەیە دەربارەی چەمكی

"دەوڵەت" و چەمکی "بێ دەوڵەت" یان کەسێك کە خرابێتە دەرەوەی بازنەی دەستەڵاتەوە، بە شێوەی مەنەلۆج دەدوێت. شاعیر بەگوێرەی ستایل و شێوازی دارشتنی تایبەتی خۆی، یەکسەر بۆ بن ئاسمانی خەیاڵ و فەنتازیا دەداتە شەقەی باڵ:

**خـــۆ بێ دەولّــەت نیت دیوانــەی کەم فام**
**جـــە عـــەرصـەی دەوران نــەیاوی بەکام**
**پەی چێش؟ بێ دەولّــەت دایم خـــوار مبۆ**
**دۆستش ئـــــەر صـــەدەن لێش بێزار مبۆ**
**ئیســـە تـــۆ شــوکر دەولّـــەت ڕامتەن**
**کام ڕەوانیی دەور بـــــەکامتـــەن، ل٢٦٥**

ئەم مەنەلۆجە کە خانا لە زمانی خەسرەوەوە دایڕشتووە، پەیوەندییەکی ئەوتۆی بە دارشتنەکەی نیزامییەوە نییە، تەنیا لە بەشێك لە هێڵەسەرەکییەکانیدا نەبێت. نیزامی ئاماژەی بۆ چەمکی (دولت) و چەمکی (بی دولت) کردووە، بەڵام بە مەبەست و لێکدانەوەیەکی زۆر جیاواز. پاش بەراوردکردنی کۆپلەکانی هەردوو شاعیر، دەرگای تێڕوانین و تێگەیشتنی هەردوولا ڕوون دەبێتەوە:

**چـــو دولت هست بخت آرام گـــيرد**
**ز دولـــت بـــاتو جـــانـان جام گيرد**
**سر از دولـــت کشيدن سروری نيست**
**که بـــا دولت کسی را داوری نيست**
**کس از بی دولتی کامی نيـــــابد**
**به از دولت فلك نامی نيابد، ص١٤٨**

لێرەدا نیزامی، بوونی دەوڵەت بە مەرجی ئەوە دەزانێت کە بەخت جێگیر دەبێت و ناکەوێتە ناو لەپی مێردەزمەی گۆڕانکاریی ڕۆژگارەوە. دەستهەڵگرتن لە دەوڵەت بە سەروەری دانانێت و لای ئەو سەروەری ئەوەیە شا دەوڵەتەکەی خۆی پارێزگاری بکات. شا دەوڵەتی بەدەستەوە بوو، دەتوانێت ڕێسای دادپەروەری بە باشی جێبەجێ بکات.
کەسێك دەوڵەتی نەبێت، بە ئامانجی خۆی ناگات... هتد.

خانا لە گۆشەنیگای کۆمەڵی کوردیی ئەو سەردەمەوە، سەیری چەمکی "دەوڵەت"ی کردووە کە دەتوانرێت بە دوو دیودا بخوێنرێتەوە:

**أ- دەوڵەت: دامەزراوەیەکی سیاسی- بەڕێوەبردن و ڕێکخستنی کاروباری ئابووری و فەرهەنگییە.**

**ب- دەوڵەت: مەبەست لە دەوڵەت لە کوردەواریدا سەر و سامانی دارایی و دەست ڕۆیشتنی ئابووریی کەسێکە.**

دەوڵەمەند: لە (دولت مند) پێك هێنراوە، واتە: کەسێك کە دەوڵەتی هەبێت دەستەڵاتی دارایی گەورەی هەبێت، لەچاو ئەوانەی نییانە، یان کەمیان هەیە.
ئەو کاتێك دەنووسێت:

**پەی چێش؟ بێ دەوڵەت دایم خوار مبۆ**

**دۆستش ئـــەر صەدەن لێش بێزار مبۆ**

"هۆی چییە؟ هەر کەسێك "بێ دەوڵەت" بێت کاروباری هەمیشە خوار دەردەچێت، ئەگەر سەد دۆستیشی هەبێت، هەمووی لێی بێزار دەبن؟". هەردوو مەبەستەکەی لە یەك کاتدا پێکاوە:

کەسێك گەر دەوڵەتی نەبێت، کارەکانی خوار دەبێت، لە هەڵدێرێکەوە ڕادەستی هەڵدێرێکی تر دەکرێت. لە کێشەیەك دەرباز بوو، سەد کێشەی تر چاوەڕوانی دەکەن.

بە هەمان شێوە، مرۆڤی بێ دەوڵەت و هەژار و بەلەنگاز و بێسەروسامان، هەر ڕۆژێکی بە ساڵێکی دەڕوات و هیچ ئامانجێکی نایەتە دی. شاعیری گەورەی کورد، ئەوەندە لە ئەزموونی ژیاندا دەوڵەمەند بووە، زانیویەتی ئازاری بێدەوڵەتی چەند زۆرە.

**شیرین، پاڵەوانێکی ئەفسانەیی یان سیمبۆلی دایکسالاری**

دایکسالاری سیستمێکی ڕێکخستن و پەیوەندیی کۆمەڵایەتییە کە لە نێوان جیهانی ئەفسانە و خەیاڵ و ڕاستیدا، لە مێژووی کۆنی زۆربەی گەلاندا، شوێنەوار و دەنگدانەوە و ڕەنگدانەوەی هەیە. لە سەردەمی ئەمڕۆشدا، لەسەر ڕووبەری هەندێك دوورگەی چکۆلەی دووری ناو ئۆقیانۆس و نیمچە دوورگەی هیندستان و دارستان و چەنگەڵەکانی ئەفریقا و لەناو هەندێك هۆزی هوونانی چین، ئەم جۆرە ڕێکخستنە کۆمەڵایەتییە هێشتا هەر ماوە و پارێزگاریی لێ کراوە.

ئەم شێوەیە لە دەستەڵات و فەرمانڕەوایەتی و ڕێکخستنی کۆمەڵایەتی، بریتییە لە پاوەنکردنی دەستەڵاتی سیاسی و ئابووری و فەرهەنگی لە لایەن ژنەوە. لە چوارچێوەی ئەم دەستەڵاتەدا، پیاو هیچ دەستەڵات و مافێکی ئەوتۆی نییە، تەنیا ئەو دەورە نەبێت کە ژن بە وردی پێناسەی کردووە و دیاریی کردووە. ڕێگە نادرێت پیاو لە سنووری بەرتەسکی ئەو جغزە داخراوەدا پێ بترازێنێت.[٢٥]

پاش قۆناخی دایکسالاری کە بە لاتینی (مەتریارخات- Matriarchat)ی پێ دەگوترێت، قۆناخی باوکسالاری کە بە لاتینی (پەتریارخات- Patriarchat)ی پێ دەگوترێت، دەست پێ دەکات. ڕاستە ژن و پیاو، هاوژین و هاوژیوار و تەواوکەری یەکترن، بەڵام لە هەر قۆناخێکدا، لایەنێك دەستەڵاتی قۆرخ کردووە و لایەنەکەی تری بێبەش و بێبەری کردووە. بێگومان لە نێوان ئەم دوو قۆناخ و فۆرمەدا، لە دەستەڵات و ڕێکخستنی کۆمەڵایەتی، ناکۆکیو زۆرانبازی و ململانێ هەبووە. ژن بە حەز و ئارەزووی خۆی

دەستەلاتی ڕادەستی پیاو نەکردووە و تا دوا تنۆك و دوا چرکە خەباتی خۆی کردووە و خەباتی خۆی هەر دەکات. بەلگەش ئەوەیە لە چەند شوێنێکی جیهاندا، پاشماوەی کۆمەلی دایکسالاری، لەسەر ڕووبەرێکی بەرتەسکیش بێت، دەستەلاتی خۆی پاراستووە. لە شوێنەکانی تری جیهاندا، ژنان بە ئەوپەڕی توانای خۆیانەوە خەبات دەکەن لە پێناوی ئەوەی هاوتایی و هاوسەنگی و یەکسانی لە نێوان ژن و پیاودا هەبێت.

نووسەر و لێکۆلیارە ئێرانی، ڕووسی، ئەلمانی، فەرەنسی، ئینگلیزی و تورکەکان، سەدان کتێب و لێکۆلینەوەیان لەسەر ژیان و شاکارەکانی نیزامیی گەنجەوی بلاوکردۆتەوە. ئیپۆسی خوسرەو و شیرین پشکی شێری لە لێکۆلینەوە و لێتوێژینەوە بەرکەوتووە و سەرنجی زۆر نووسەر و مێژوونووسی بۆ لای خۆی ڕاکێشاوە. ناسراوترین کەسایەتییەکی ئەکادیمی لەسەر کارەکانی نیزامییان نووسیبێت (عبدالحسین زرین کوب،[٢٦] د. بهروز پروتیان،[٢٧]... هتدن) کە هەر یەکەیان کتێبێکی شیکردنەوەی بۆ کارەکانی نیزامی تەرخان کردووە و توانیویانە بەشدارییەکی گەورە لە ڕوونکردنەوەی لایەنە شاراوەو نەزانراوەکانی بەرهەمەکانی شاعیری بەناوبانگی گەنجە بکەن و شیکارییەکی قوول بۆ چیرۆکە شیعرییەکان بلاو بکەنەوە.

زۆربەی نووسەران، بە زەرینکوب و سەروەتیان و وەحید دەستگردییەوە، بە شێوەیەکی سەرەکی چاویان لەسەر شیکردنەوەی زمانەوانی و بەراوردی ئەدەبی و سەرچاوە ئەدەبی و مێژووییە کۆنەکان بووە. ئەم جۆرە لێکدانەوە و ڕاڤەکاری و شیکردنەوەیە، سەرەڕای بایەخ و گرنگی، ئەگەر لایەنی پشتبەستن بە تیۆرییەکانی سۆسیۆلۆژیا و سایکۆلۆژیا و ئیتنۆلۆگیا و ئەنترۆپۆلۆگیای لێ دەرهاوێژرێت، هەندێك جار مەبەست بەدەستەوە نادات. ئێمە هەر بۆ نموونە کەسایەتیی شیرین دەخەینە بن تیشکی شیکردنەوەی ئیتنۆلۆگی: نیزامی، هەرچەند ئەو بە شاعیرێکی گەورە دادەنرێت، بەلام ئەو وەکو ڕۆماننووس و هونەرمەندێك لەسەر کارەکتەری شیرین کاری کردووە. بە گوێرەی شیعر و داڕشتنی شیعری ئەو بۆ کەسایەتیی

شیرین زانیارییەکی زۆرمان پێشکەش دەکات، دەربارەی بنەماڵە و جێگە و پلەوپایەی ئەو لە وڵاتی ئەرمەندا. ئەو شازادەی جێنشینە و پاش مردنی پووری ئەو جێگەی شاژن دەگرێتەوە.

نیزامی لە زاری پیر و بەتەمەن و بەساڵاچوواندا، لە سەردەمی منداڵی و هەرزەکاریدا، ڕەنگە دەیان جار داستانی خوسرەو و شیرینی بیستبێت و ئەو درامایە بە قووڵی کاری تێکردبێت، ئەوەش وای کردبێت کە شاعیری گەورەی گەنجە، لەگەڵ هەڵکشانی تەمەن بەرەو سەرەوە، بە بەردەوامی هۆگری پاڵەوان و ڕووداوە تراژیدیەکانی ناو داستانەکە بووبێت. ئەو فروسماوی چیرۆکەکە بووە، بەبێ ئەوەی بە خۆی بزانێت کە دەربارەی بەسەرهات و جیهان و دەستەڵاتی ژنێك دەنووسێت کە لەسەردەمێکی پێشووتردا، دەستەڵاتی هەبووە و ئەو جۆرە دەستەڵاتە، لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا، لەسەر نەخشەی سڕاوەتەوە و شوێن و شوێنەواری بەرەبەرە نەماوە. لەبری دەستەڵاتی ژن، دەستەڵاتی پیاو گەشەی کردووە و خۆی سەپاندووە. پێویستیی کار و داڕشتن و بینای تەلاری دراما، شاعیری گەورەی گەنجەی ناچار کردووە بە ئاسانی دەستی لە بەرۆکی ئەفسانە ئەسڵییەکە نەبێتەوە و بەشێك، لە مێژووی دایکسالاری بۆ ناو شاکارەکەی خۆی بگوێزێتەوە. پێویستی ناچاری کردووە، تیشك بخاتە سەر کەسایەتی و دەستەڵات و هێزی (مهین بانو)ی پووری شیرین هەر بۆ ئەوەی شیرینمان پێ بناسێنێت کە شازادەی جێنشینە و پاش مەرگی پووری، عەرش و تاج و دەستەڵات بۆ برازاکەی دەمێنێتەوە. ئەو بەم شێوەیەی خوارەوە دەستەڵاتی (مهین بانو) پێناسە دەکات:

زنی فرمـــــانده است از نسك شاهان
شده جوش سپاهش تـــــا سپاهـــان
همه اقلیم اران تـــــا بـــــه ارمن
مقرر گشته بر فرمـــــــان آن زن

**نـــــــدارد هيچ مرزى بى خـراجى**
**همه دارد مگر تختى و تــــــاجى**
**هـزارش قلعـــه بر كـــــوه بلند است**
**خزينـــه‌اش را خـــدا داند كه چند است**
**ز جنس چارپـــــــا چندان كه خواهى**
**بـــــــه افزونى فزون از مرغ و ماهى**
**نــــــدارد شـــوى و دارد كامرانى**
**بـه شادى مى گـذارد زندگانى، ص٤٥**

لەم بڕگەیەدا نیزامی دەربارەی دەور و چالاکی و سنووری دەستەڵات و هێزی ژنێك دەدوێت کە لە نەوەی شاهانە و بە هەزاران قەڵای قایمی لەسەر کێوەکاندا هەیە. قەڵەمڕەوی دەستەڵاتی ئەو لە ئەرمەنەوە، تا دەگاتە ئاران و سوپایەکی بەهێزی هەیە... هتد. ئەو پێمان ناڵێت: ناوی باوکی چییە و سەروەری و قارەمانی و مێژووی چی بووە؟ ئەو ڕازەشمان بۆ نادرکێنێت کە لە کێوە تاج و عەرشی بۆ ماوەتەوە؟ لەناو بارەگا و دەست و پێوەند و دەوروبەری (مهین بانو)دا، پاشان شیرینی برازای، پیاو بەدی ناکرێت و ناوی هیچ پیاوێك بەرچاوان ناکەوێت. هۆکەش ئەوەیە، شاعیری گەورە ئەفسانەکەی بەو شێوەیە بیستووە و بەلایەوە ئەستەم بووە دەستکاریی ستركتوور و ناوەڕۆکی ڕووداوەکان بکات.

ئایا ئەو دایکسالارییەی شاعیری گەورەی گەنجە لەسەری دەنووسێت، پایتەختەکەی شارێك بووە، یان گوندێکی مەزن بووە؟ نیزامی باسی قەڵا دەکات کە ژمارەیان هەزارە، بەڵام باسی تەلار و کۆشك ناکات! ئەو دەربارەی شایەك دەدوێت کە هەر وەرزێك هەواریان لە ناوچەیەکدا خستووە:

**بـــــه فصل گل به موقان است جايش**
**كـــــه تـــا سر سبز باشد خاك پايش**

بـــــه تـــابستان شود برکوه ارمن
خرامد گل بـــه گل خرمن بـه خرمن
بـــــه هنگام خزان آید بـــــه ابخاز
کـــند در جـــستن نخجـــیر پـــرواز
زمستانش بـــــه بردع میل چپاست
کـــه بردع را هـــوای گرمسیر است
شده جـــوش سپاهش تـــا سپاهان
مقرر گشته بر فرمـــــــان آن زن
همه دارد مگـر تختی و تـــــاجی
خزینه‌اش را خـــدا داند که چند است
بـــــه افزونی فزون از مرغ و ماهی
بـه شادی می گذارد زندگانی، ص٤٦

ئەم وەسفە بۆ شانشینێکی ڕەوەند کە هەر وەرزێك بۆ شوێنێك هۆز کۆچ دەکات، شەقڵی هاوبەشە لە نێوان زۆربەی ئەو کۆمەڵانەدا کە بە دایکسالاری پێناسە دەکرێن.

پاش کۆچی دوایی (مهین بانو) شازادەی جێنشین (شیرین) تاجی شایەتی پێ دەسپێردرێت، شای نوێ ئەوەندە بیری لای خۆشەویستی و دڵدارییە، یەك لە هەزاری ئەوەش بیری لای دەستەڵات و حوکمداری نییە. ئەوکاتەی شازادەی جێنشینە، وێنەی خەسرەو دەبینێت، چاوەڕوان ناکات خەسرەو ڕوو بکاتە ئەرمەنستان. سواری "شەبدیز" دەبێت و بەرەو مەداین دەداتە شەقەی باڵ. ئەمەش نیشانەیەکی تری کۆمەڵی دایکسالارییە کە ژن بە دوای پیاودا دەگەڕێت و دەوری پۆزەتیڤ و چالاك دەگێڕێت.

خەسرەو بە پایتەخت و ڕاوێژکار و قەسر و تەلار و باڵەخانەوە کە بڕوای بە فرەژنی[(٢٨)] هەیە و بیری لای خۆشی و لەزەت و هەوەسبازییە، سمبۆلی باوکسالارییە. شیرین سیمبۆلی دوا دەستەڵاتی دایکسالارییە کە ئۆقرەی لەبەر هەڵگیراوە و ناتوانێت درێژە بە دەستەڵاتی دایکسالاری بدات. ئەو بە پەیوەندی بە شایەکی باوکسالارەوە ڕازی دەبێت کە بە بەرچاوی ئەوەوە، دووجار ژن دەهێنێت و ئەم بە ناشیرنترین شێوە پەراوێز دەخات و هەر نایەوێت بە لای خانووەکەی ئەودا تێپەڕێت.

بێگومان شیرین هەڵوێستی خۆی هەیە و ڕووبەڕووی دەستەڵاتی پەتریارخاتی دەبێتەوە. خانا کوڕی ڕۆژگاری خۆی بووە. تەنانەت کاتێك دەقەکانی وەرگێڕاوە، ئیجازەی بە خۆی داوە هەویرەکە بەگوێرەی دڵی خۆی بشێلێت و بە جۆرێك گونك ببڕێت لەگەڵ ڕۆحی سەردەمی خۆیدا بگونجێت. ئەو کەسایەتیی (مهین بانو)ی بەم شێوەیەی خوارەوە داڕشتووە:

جــــه نـــــەسل شاهــــان ئـــــەعلای قـــەدییمەن
وێنـــــەی ئـــەسکـــــەندەر سوپاش عەظییمەن، ل٤١
بـــــەس کــــە بێ حــــەدەن گـــــــەنج و ئەسبابش
نـــــــەیۆ نـــــــــە ضبط دەفتـــەر حیســـابش
جـــــــــە جینس چـارەیت جــە مورغ و مـــــاهتی
جـــــەم کـــــــــــەردەن تـــــەمام جە گەنج شاهیی
شوش نیــــــــەن ئـــــەمما بـــــە کامـــــــەرانیی
مویـــــــــــارۆ دەوران ئـــــــەی دنیای فــــــانیی
فـــــــــەصڵ تـــــابوستان کۆی ئـــــەرمەن جاشەن
لالـــــــــــــە و شەقـــــــایق گشت فــــــەرش پاشەن
وەقت نــــــــــــــەو بـــــەهـار وێنەی دەستەی گوڵ
نـــــــــــــــە موڵك موغـــــان مگێڕۆ مـــــەنزڵ

**وادەی نـــــــــەو سووەیل ڕەنگ ڕژیی ڕەزان**
**نـــــــەخش نوختـەی خـــــاڵ سەر پەنجەی خەزان**
**چون شـــــابـــــاز شۆخ تونـــد تیژ پـــــەرواز**
**پـــــەی نـــــــەخچیتر بـــە سۆز مەیۆ بە ئیجاز**
**زمستان (بــــــــەردەع) چـــون هـەواش گەرمەن**
**فراوان وەشـــــــــەن، نـــــــەسیمش نــــــەرمەن**
**چـــــون ئـــــــاهوی موشکین مـەم بەرەی ساوا**
**شۆخ شۆخ مــــــەست مـــەست مشۆ بـــــەو مــاوا**
**چـــون تـــەتــــــار شــۆخ کـــەمـــەند نە پێڵەن**
**بەی دەستور چـار فەصڵ نەگەشت و گێڵەن، ل٤١- ٤٣**

لەسەردەمی خانادا گەرمیان و کوێستان و خێڵ بەرەوخوار و خێڵ بەرەوژوور ئاسایی بووە. ڕەنگە ژنی ئەوتۆی ناسیبێت کە سەرخێڵ و دەمڕاستی تایەفەیەك بووبن و ناو و ناوبانگیان بە چەپ و ڕاستدا ڕۆیشتبێت. ئەزموونی خانای وەرگێڕ، لەگەڵ ئەزموون و زانیاریی نیزامیدا زۆر جیاوازە، بۆیە لە وەرگێڕاندا خەیاڵی بۆ بوونی کۆمەڵێکی دایکسالاری نەچووە و هەر پێی وابووە (مهین بانو) بێوەژنێکە لە بێوەژنەکان.

**١. وار پیش نیەن هیچ کەس نەجایێ**
**بــــــەڵـێ ئەو دارۆ یەك برازایێ ل٤٣**

لە شوێنێکی تر دەڵێت:

**٢. (شیرین) وەلی عەهد (مـەهین بانوو)ەن**
**چــۆن مـەهین بانوو ئـــەویچ بێ شوەن ل٤٧**

ئەم وێنایە سنووری کۆمەڵی کوردستانی سەدەی هەڤدەیەم و هەژدەیەم تێ ناپەڕێنێت. لە نموونەی (ژ-١) پێی وایە: هەر لەبەر ئەوەی (مهین بانو) هیچ نێرینەیەك نییە جێگەی بگرێتەوە، بۆیە بازەکە بە سەری شیرینەوە نیشتۆتەوە. ئەگەر نێرینەیەك هەبوایە، بێگومان نێرینەکە جێگەی دەگرتەوە.

لە نموونەی (ژ-٢)دا، شاعیر پێی وایە: مەهین بانوو و شیرین هەردووکیان بێوەژنن، یان بێشوون. گومان لەوەدا نییە، لە قۆناخی یەکەمی ئەفسانەی خوسرەو و شیریندا، بایەخ بە دەوری "مێرد، شوو، نێرینە، پیاو..." نەدراوە. شوو لە نەریتی ئەو سەردەمەدا نەزانراوە و بەهایەکی قانوونی، یان کۆمەڵایەتیی نەبووە و ئەو کۆمەڵە، لە هەندێك ڕووەوە، لە کۆمەڵی هەنگ دەچێت. شاژن ناسراوە و شا هیچ جێگەیەکی ئەوتۆی لە سیستێمەکەدا نییە. لە کۆپلەیەکی تردا کە لای نیزامی بەرچاو ناکەوێت و لای خانا زەق کراوەتەوە، وەسفێکی دەستەی پارێزگاریی شیرینە کە ژمارەیان (٧٠) پەرەستارە و قەسیدەکەی نالیمان بیر دەهێنێتەوە: "**ئەم طاقمە مومتازە هەموو خاصصەی شاهن**"

نالی سوپایەکی نێرینەی بینیوە و بەم شێوەیە وەسفی کردووە. خانا بە خەیاڵ وێنای دەستەیەك ژنی جەنگاوەری کردووە:

**چۆن حـــەڵقەی زنجیر زوڵف دەستــەشـەن**
**هەفتـــاد پـــەرەستـــار کەمەر بەستەشەن**
**دەستـــەی زوڵفانش گشت بۆ عـــەنبـــەرەن**
**هــــەر یەك جە یەکێ شۆخ و شەنگ تەرەن**
**شیرینەن چـــون قـــەند ڕێزەی ڕازشـــان**
**خـــونرێزەن دایم غـــەمزەی نـــازشـان**
**مکەران بەخەصم نەڕۆی عەرصەی جەنگ**
**بـــە حـەربـەی خونرێز دەور دنیا تەنگ**

**ماچی بـــالآشـان جـــە نور سروشتەن**
**ئـەوان چون حۆری، (ئەرمەن) بەهەشتەن**
**(شیرین) وەلیی عـــەهد (مەهێن بانو)ەن**
**چون مـــەهێن بانو ئەویچ بێ شوەن، ل٤٧**

**کورتەی لێکۆڵینەوە**

ئەم نووسینە تەنیا یەك بەرهەمی خانای قوبادیی کردۆتە ئامانجی لێکۆڵینەوە و لێتوێژینەوە، ئەویش ڕۆمانەشیعری شیرین و خەسرەوە کە لە بنەمادا شاکارێکی نیزامیی گەنجەوییە و بە فارسی نووسراوە. ئەم بەرهەمە (١٧٤٠ز) نووسراوە و چەند جارێك لە ئێران و عێراق چاپ کراوە.

خەسرو و شیرینی نیزامیی گەنجەوی، سەدان لێکۆڵینەوە و لێکدانەوەی لەسەر نووسراوە، بەڵام شیرین و خەسرەو هەر زۆر بە کەمی لەسەری نووسراوە.

ئەم نووسینە لەلایەکەوە بەراوردێکە لەنێوان شاکاری ڕەسەن و وەرگێڕانە کوردییەکەی. وەرگێڕی کوردی هێڵەسەرەکییەکانی تانوپۆی ڕۆمانە شیعرییەکەی لەبەرچاو گرتووە و کارەکەی نیزامیی تا سەر ئێسك کورداندووە. خۆیشی لە زۆر شوێنی شیرین و خوسرەودا، بۆچوون و بیروڕای خۆیی تێهەڵکێشی بەرهەمەکەی نیزامی کردووە. هەروەکو چۆن نیزامی کاریگەریی خۆی لەسەر شاعیرانی کوردی وەکو "نالی، حاجی قادری کۆیی، ئەحمەدی خانی و..." هەبووە. بێگومان خانای قوبادییش کاریگەریی خۆی لەسەر شاعیرانی گۆرانی زمان هەبووە (بۆ نموونە: مەولەوی) کە ئەم بابەتە شایانی لێکدانەوە و شیکاری و لەسەرنووسینە.

داستانی شیرین و خەسرەو لە بنەڕەتدا پڕە لە کۆد و سیمبۆل و پەیام. تا ئێستا کەس ئەو ڕاستییەی نەنووسیوە کە شیرین سیمبۆلی کۆمەڵی دایکسالارییە. ئەو سەرەڕای

ئامۆژگارییەکانی پووری، یەکێکی وەکو خەسرەو کە شایەکی ئەو سەردەمەی ئێران بووە و سیمبۆلی باوکسالاری و دەستەڵاتی پیاوسالاری و فرەژنی و هەوەسبازییە، دڵی خۆی ڕادەستی دەکات و چارەنووسی خۆی بە کورسیی دەستەڵاتی ئەوەوە گرێ دەدات. لەگەڵ ئەوەشدا، بەرەنگاریی خۆی دەکات و بوارێك بۆ خۆی دەدۆزێتەوە کە لەگەڵ فەرهاددا دڵداری بکات و پەپوولەی خۆشەویستی و عیشق ڕەوانەی یەکتر دەکەن. ئەمە خۆی لە خۆیدا، بە شێوەیەکی نەدرکێنراو، ئاماژەیە بۆ کولتووری فرەپیاوی کە لە سەردەمی دایکسالاریدا باو بووە.

خانای قوبادی یەکێکە لە شاعیرە کلاسیکییە گەورەکان کە بەداخەوە تا ئێستا بایەخێکی ئەوتۆی پێ نەدراوە و لە زانکۆکانی کوردستان هەوڵ نەدراوە نامەی دکتۆرا و کاری زانستیی گرنگ لەسەر ئەم شاعیرە گەورەیە پێشکەش بکرێت.

## ژێدەر و سەرنج و تێبینی


١. خانای قوبادی، شیرین و خوسرەو، محمدی مەلا کەریم ساغی کردۆتەوە و فەرهەنگی بۆ ڕێکخستووە و پێشەکیی بۆ نووسیوە، چاپخانەی کۆڕی زانیاریی کورد - بەغدا ١٩٧٥.

هەر بۆئەوەی پەراوێزی ئەم نووسینە زۆر قەبە دەرنەچێت، من لە دوای هەر بەیتێکی شیرین و خوسرەو تەنیا ژمارەی لاپەڕەکەم داناوە و ئاماژە نەکراوە بۆ ناوی نووسەر و بەرهەمەکەی. دەربارەی خوسرەو و شیرینی نیزامی بە هەمان شێوە تەنیا ژمارەی لاپەڕە لە کۆتایی بەیتەکەدا دانراوە.

٢. خانای قوبادی، یوسف و زولێخا، بووژانەوە و لێکدانەوەی: حەکیم مەلا ساڵح، لە بڵاوکراوەکانی کۆڕی زانیاریی کوردستان، هەولێر ٢٠٠٥.

٣. خانای قوبادی، لەیلا و مەجنوون، ساغکردنەوە و ئامادەکردنی: غەفار ئیبراهیمی، بنکەی ژین، سلێمانی ٢٠١١.

٤. خانای قوبادی، سوڵتان ئیبراهیم و نۆش ئافەرین، کۆکردنەوە و داڕشتنەوەی: حەمەڕەشی ئەمینی، چاپخانەی ئاراس، هەولێر ٢٠١١.

٥. خانای قوبادی، بەشێك لە دیوانی خانای قوبادی، ئامادەکردن و لێکۆڵینەوەی: کاروان عوسمان خەیات (ڕێبین) لە بڵاوکراوەکانی کۆمەڵەی ڕووناکبیری و کۆمەلایەتیی کەرکووك، کەرکوك ٢٠١٢.

٦. حکیم نظامی گنجەای، کُلیات نظامی، تصحیح و شرح: وحید دستگردی، انتشارات طلایة، جلد اول، چاپ اول، تهران ١٣٨٣ هـ. ش.

٧. محمد سعید اردوبادی، خاتون گنجە، زندگی نظامی گنجوی، ترجمە: غلامرضا طباطبایی مجد، ج١، چ١، زرین، تهران ١٣٨٠ ش. ق.

٨. دانیشتنێك لەگەڵ مامۆستا محەمەدی مەلا کەریم، سلێمانی ٢٧/١٠/٢٠١٢.

٩. ئەحمەدی خانی، مەم و زین، ڕاڤە و شرۆڤە: پەرویز جیهانی، سپیریز، دهۆك ٢٠٠٧ ل ٢٢.

١٠. ئۆسکارمان، تحفەی مظفریة، پێشەکی و ساخکردنەوە و هێنانە سەر ڕێنووسی کوردی: هێمن موکریانی، بەشی یەکەم و دووەم، بەغدا ١٩٧٥ ل ٣٣٤-٣٧٢.

هەروەها بڕوانە:

مامۆستا جەعفەر (فازیل کەریم ئەحمەد) من بڕوام بە دیموکراسیی کوردی نییە، لە بڵاوکراوەکانی مەکتەبی بیر و هۆشیاری، سلێمانی، ٢٠٠٥ ل ٨٥.

١١.Ebdullah M. Varli. Dîwan û Jînewariya

Ahmedê Xanî. Cap Erkam. Stenbol ٢٠٠٤ L ٢١٧.

١٢. حەكيم مەلا سالّح (سەرچاوەی پێشوو).

١٣. ئێمە تەنیا شیعرێکی خانامان بە دەستەوەیە کە ئاراستەی دەرەوەی زیندان کراوە و لەسەر هەلومەرجی زیندان دەدوێت و ئاماژە بۆ ئەوە دەکات، پیاوێکی خاوەن پلەوپایە و جێگە و ڕێگەی کۆمەڵایەتی بووە.

١٤. مامۆستا جەعفەر، مێژووی بیری کوردی، چاپخانەی حەمدی سلێمانی- ٢٠٠٩ ل ١٥٥.

١٥. سەرهەنگ ئەڵماس خان، میرزا ئەڵماس خان، ئەڵماس خان کەنوولە، ئەڵماس خان کەڵهوڕ ناوی یەك کەسن و نووسەرانی کورد، لەبەر هۆی جیاجیا هەر یەکە ناوی ئەڵماس خانیان بە شێوەیەك نووسیوە.

١٦. میرزا ئەڵماس خانی کەڵهوڕ، نادرنامە، بە ڕێنووسی کوردی باوی ئەمڕۆ نووسینەوە و فەرهەنگۆك بۆ دانانی: شوکور مستەفا، بڵاوکردنەوەی ئاراس ژ ٣٣، هەولێر ٢٠٠٠.

١٧. میرزا ئەڵماس خانی کەڵهوڕ (س. پ) ل ١٦.

١٨. میرزا ئەڵماس خانی کەڵهوڕ (س. پ) ل ٥٣.

١٩. میرزا ئەڵماس خانی کەڵهوڕ (س. پ) ل ١٢٢.

٢٠. شرفخان بن شمس الدين بدليسى، شرفنامه، تاريخ مفصل كردستان، به اهتمام: ولاديمر و ليبامينوف زرنوف، افست از روى چاپ بطربورغ ١٨٦٢م (ناشر، اساطير، چاپ دنيا) تهران ١٣٧٧ هـ. ش ص ٤٣٧.

٢١. مامۆستا جەعفەر (مێژووی بیری کوردی) (س. پ) ل ١٥٧ -٢٢٢.

٢٢. Machiavelli. Niccolõ. Der Fürst. InseL Verlag üb. Von Friedrich von Oppeh - Bronikowski Frankfurt am Main ٢٠٠١ S. ١٤٩.ff.

٢٣. سەیر ئەوەیە فیردەوسی لە شانامەدا سرووشێك ڕەوانەی دەکرێت و ئەوە دەبێتە هۆی ئەوەی کارەکەی دەقیقی تەواو بکات.

٢٤. مستورەی اردەلان، تاريخ الاكراد، چاپخانەی ئاراس، چاپ اول، اربيل ٢٠٠٥.

٢٥. Vgl. Bebel. August. Die Frau und der Sozialismus Berlin _ Bonn ١٩٨٥ ٤٥ff

٢٦. دكتر عبدالحسين زرين كوب، پير گنجه- در جستجوى ناكجا آباد، درباره زندگى، آثار وانديشه نظامى، چاپ: مهارت، چ٨ تهران ١٣٨٩.

٢٧. دكتر بهروز ثروتيان، انديشه‌هاى نظامى گنجه‌اى انتشارات آيدن، چاپ اول، تبريز ١٣٨٢ هـ. ش ص٩٢.

٢٨. سەیر ئەوەیە کە خوسرەو پەروێز کە یەکێك بووە لە شای ساسانییەکان و ماوەی (٣٨) ساڵ فەرمانڕەوایەتیی کردووە و لە ساڵی (٦٢٨ز) کوژراوە، گەورەترین حەرەمسرای هەبووە. مێژوونووسی بەناوبانگی مێژووی ئێرانی

کۆن (حسن پیرنیا) پێی وایە خوسرەو سێ هەزار ژنی هەبووە و چەندین هەزار کەنیزەك لە دەرباری ئەودا ژیاون و شیرین یەکێك لە ژنەکانی بووە:

بڕوانە: حسن پیرنیا، تاریخ کامل ایران، چاپ چهارم، تهران ١٣٩١ ص٢٠٦.

# ژیاننامەی خانای قوبادی

## ناوی خانای قوبادی

ئەوە ڕوونە کە بەشێك لە شاعیران بەهۆی ئەوەی لە لایەن خانەوادە و نەوەکانیانەوە، یان بەهۆی باری نالەباری ناوچەکەوە، بەرهەم و مێژووی ژیان و ناو و ناونیشانیان لە ئەدەبیاتی کوردیدا ون بووە، یان ناوی تەواویان لە مێژوودا ڕوون نییە، یان تەنها بەرهەم و نازناوی شیعرییان دیارە. خانای قوبادییش یەکێکە لەو شاعیرە گەورانەی کورد کە خاوەنی بەرهەمێکی زۆرە لە شیعر و وەرگێڕان و لەناو مێژووی ئەدەبیاتی کوردیدا جێگەی بەرز و دیاری هەیە. سەبارەت بە ناوی تەواوی لە پێشوودا تەنها بە خانا ناوی براوە و توێژەران لەوە زیاتر شتێکی ڕوونیان لە بەردەستدا نەبووە.

هەندێك لە ئەدیبان و نووسەرانی کۆنی کورد ناوی خانایان بە موحەممەد هێناوە، بەڵام بەبێ بەڵگە و سەرچاوەیەکی ڕوون ئەو ناوەیان بەکار هێناوە. لێرەدا هەوڵ دەدەم بەپێی ئەو سەرچاوە و بەڵگانەی بەردەستم ئەوە ڕوون و ڕاست بکەمەوە.

بەگزادەکانی جوانرۆ دەڵێن: بەپێی تۆرەمەنامە، ناوی خانا، خانلەرخان، یان خانلەر بەیگی بووە. لەبارەی ئەم موحەممەد ناوەوە بە تەلەفۆن وتەیەکم لە مامۆستا ئیبراهیمی غەففاری سارۆ وەرگرت،[1] ئەویش وتی: من لە هەندێك کەسی پیری هۆزی قوبادی و

[1] ڕۆژی یەك شەممە، ڕێکەوتی ٣٠-١٠-٢٠١١، کات: ١٢:٤٥ پاش نیوەڕۆ ئەو وتووێژە تەلەفۆنییە ئەنجام دراوە. ئەگەرچی قسەی زارەکی لە لێکۆڵینەوەی زانستی دا کەڵکی نییە، بەڵام لەبەر نەبوونی سەرچاوەی پێویست لەو بارەوە، بە بڕوای من پێویست دەکات سوودی لێ وەربگرین، چونکە چەندین قسە و باس لە سەر ژیانی خانا هەیە، تەنها قسەی زارەکی و دەماودەمن، منیش لێرەدا بۆ لێکۆڵینەوەکە سوودم لەو وتە و باسانە وەرگرتووە و هەندێکیم ڕاست کردوونەتەوە، هەندێکیشی بە گومانەوە ماون و کاریان لە سەر دەکرێت و دەیان خەمە بەر لێکۆڵینەوە.

باوەجانییەکانم بیستووە کە خانا ناوی موحەممەد بووە. غەففاری سارۆیی ئەوەشی وت: کە چەند کەسێك هەن بە ناوی موحەمەد خان. بەڵام نەم بیستووە کەسێك هەبوویێت بە ناوی موحەممەد خاناوە، بەتایبەتی لەو کاتەدا کە دەمی خانای قوبادی بوویێت. لەناو تۆرەمە و بەڵگە و دەستنووسەکانی بەردەستی منیشدا بە چەندین شێوە باسی ئەم بنەماڵەیە کراوە، بە شێوەیەك تۆرەمە و خانەوادەی ئەم شاعیرە تێك دراوە و تێکەڵ کراوە، ئەگەر بە وردی لێی ورد نەبیتەوە، ئەوا دەکەویتە هەڵەی گەورەوە.

من لێرەدا ئەوەی جێگەی باس بێت لەسەر ناوی خانا و ئەوەی ئاماژەی بەو لایەنە کردبێت دەیخەمە ڕوو:

یەکێك لەو بەڵگەنامانەی کە لە ڕێکەوتی (٢٩-٥-١٣٤١ ك. هـ.) نووسراوە و واژوو و مۆری چەندین کەسی لەسەرە، بەم شێوەیە هاتووە:

*"کوڕانی جەنابی خوالێخۆشبوو سەیید ئەحمەدی دووەم بریتین لە: ١- بەڕێز موئمین بەگ کوڕی خوالێخۆشبوو سەیید ئەحمەد. ٢- بەڕێز هەمیر خان بەگ کوڕی سەیید ئەحمەد. ٣- بەڕێز یارحوسێن بەگ کوڕی سەیید ئەحمەد. ٤- بەڕێز خانلەر بەگ کوڕی سەیید ئەحمەد لە مێژووی ١٣١٧ لە سەردەمی خوالێخۆشبوو (علیحضرت)ی کۆچکردوو تا ئێستا قەباڵەی کوڕانی بەڕێزی ناوبراو سەیید ئەحمەد دانیشتووی قوبادی لە ساڵی ١٣٠١ بەڕێز مەنسوور ئاغای کەیخوسرەوی کوڕی موحەممەد خان و... میرزا موورادی کوڕی کوێخا عەبدوڵڵا و عەزیزی کوڕی مەهدی و میرزا موورادی کوڕی عەبدولقادر و غەفووری کوڕی ئەعزەم، لەو مێژووەی سەرەوەدا تا ئێستا نووسینی قەباڵەی موڵکدارێتییان لە منداڵانی سەیید ئەحمەد وەرگرتووە..."*

لە کۆتاییی ئەم قەباڵەیەدا ئەمەش هاتووە:

*"چەندین کەس لە لاپەڕەی وەرگێڕاو، بەڵام بەم شێوەیەی خوارەوە عیسا بەگ کوڕی سەیید ئەحمەد بەگ، ڕۆستەم بەگی کوڕی سەیید ئەحمەد بەگ، خانە بەگ برای*

*سەییدئەحمەد، شۆرە بەگ برای سەیید ئەحمەد و میرزا بەگ کوڕی سەیید ئەحمەد".*

لە بەڵگەیەکی موڵکداریی تردا کە لە ساڵی (١١٣٠ ك. هـ.) نووسراوە، بەم شێوەیە باس لەم خانەوادەیە دەکات:

*"بۆیە ئەم نووسراوە شەرعییەمان نووسی، چونکە عەزیزوڵڵا خانی کوڕی خوالێخۆشبوو سەیفوڵڵا خانی جەلیلوەندی و موتیعولئیسلام هاروونی کوڕی سلێمان یەهوودی، دانیشتووی شاری کرمانشاهان، هەردوو لایان لە حاڵەتی تەندروستیی باشدان و ئەم کارەیان بە ڕەزامەندیی تەواوی هەردوو لایان کردووە. عەزیزوڵڵا خانی جەلیلوەند، پێنج دانگ لە شەش دانگی موڵکی "نەهرئاب" کە بە میرات بۆ ئەو ماوەتەوە و هاروون یەك دانگی وەرگرتووە، بفرۆشێت بە جەنابی سەعادەت قروون هەمیرخان بێگی کوڕی سەیید ئەحمەد بێگی حاجی جوانرۆیی ئێناخی ئەسڵ و بەو نرخەی کە دیاری کراوە لە لایەن "حەل و فەسڵ"ەوە. کە بڕی (٤٠٠) قرانی پارەی کارپێکراوی ئەو کاتەی ئێران بووە...".*

هەروەها لە بەڵگەیەکی کۆنتردا کە لە ساڵی (١١٠٢ك. هـ.) نووسراوە، بە شایەد و مۆر و ئامادەبوونی چەندین کەس لەو دانیشتنەدا و گفتوگۆی تێروتەسەل، ئەو موڵکە بە بنەماڵەی قوبادییەکان دەفرۆشن. ئەم موڵکە دوای کەمتر لە ساڵێك گرفتی تێ دەکەوێت، بە ئامادەبوونی کەسانی پێشوو و پشتڕاستکردنەوەی بەڵگەی پێشوو و بەڵگەیەکی تر لەبەر ڕۆشنایی بەڵگەی پێشوو بە ئاڵوگۆڕێکی زۆر کەم لەناوی کەسەکان و هەردوو بەڵگەکە دووبارە ساڵی (١١٠٣)ی لەسەر دەنووسنەوە.

لەم بەڵگەیەدا ئەوە هاتووە کە:

*"ڕۆستەم بەگی یەکەم کوڕی سەیید ئەحمەد بەگی یەکەم ئێناخی ئەسڵ کە ناسراوە... هەمووی بە تەواوەتی و کەماڵی هەر چوار لا کە ناسراوە لە پاڵ (شاب*

*الاجل) ئەمیر خان کوڕی موحەممەد و ئوغلّوو بەگ، ئەو نووسراوە قەبووڵ بکـەن... دوای تێپەڕبوونی چەند کاتژمێرێك، داواکارییەکی تازە... ئەمیر خان بەگی ناوبراو لە ڕۆستەم خان نووسراوێکی وەرگرت. ڕۆستەم بەگ بە مۆڵەتی تازە لە وەرگرتنـی ئەو و ئەمیر خـان بـەگ وەرگرتـووە، بـە فـەرمانی سـوڵحی شـەرعیی و هـەموو مەرجێکی بێ کەموکوڕی و ئاشکرابوونی..."*.

یەکێکی تر لەو دەستنووسانەی دەبێ باسی لێوە بکەین کەشکۆڵێکە لەلای مامۆستا موحەممەد عەلی قەرەداغی لە شاری سلێمانی و بە کەشکۆڵی مەولانا حەمزە[٢] ناسراوە. دوای ئەوەی کەشکۆڵەکەم دی و لێکۆڵینەوەیەکم لەبارەوە کرد، هەندێك وردەکاریم لەم دەستنووسەدا بۆ دەرکەوت کە جێگەی بایەخ بوون و پێویستیان بە وردبوونەوە و لێتوێژینەوە هەیە. هەر لەناو ئەو کەشکۆڵەدا بە چەند شێوەیەك ناوی خانا و شیعر و نازناوی خانا هاتووە.

مەولانا حەمزە خاوەنی کەشکۆڵەکەیە. نووسەر تاکوساڵی (١١١٠- ١١٣٨ ك. م.) لە ژیاندا بووە. ئەم دەستنووسە لە سەردەمی ژیـانی خانـادا نووسـراوەتەوە، بـەڵام لـە شـاری

---

[٢] بووژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد لە ڕێگەی دەستخەکانیانەوە، محەمەد عەلی قەرەداغی، بەرگی سێیەم، چاپی یەکەم، ٢٠٠٠، لا (٣٦٣-٣٧٧).

تێبینی: هەر لەناو ئەو دەستنووسەدا پارچە کاغەزێکی باریکمان دۆزییەوە و بینیمان شیعرێکی فارسیی خانایە و لەم دیوانەدا بەرچاو دەکەوێت. هەروەها لە لاپەڕە (٢٥٧)ی هەمان سەرچاوەدا باسێکی دیی دەستخەتەکە هەیە و منیش ئەم زانیارییانەی لێ وەردەگرم. لەو کتێبەی مامۆستا باسی دەستخەتێك و دانراوێکی دیی کراوە بە ناوی (زواهر اللغة) کە گوایە هەمان موحەممەد خان یا خانا نووسیویەتییەوە. بە بڕوای بەندە ئەوە نووسینی خانا خۆی نییە، دەکرێ دووبارەنووسیی کردبێتەوە، واتە نوسخەیەکی لەبەر گرتۆتەوە. بە بۆچوونێك بەپێی دووریی ناوچەیی، شێوەزاری گۆرانی و کرمانجیی ژووروو زۆر لە یەکەوە دوورن و ناشگونجێ خانا ئەو شێوەزارەی زانیبێت. دەکرێت کەسێکی تر بۆی نووسیبێتەوە و ناوی خانای لە سەر نووسیبێت. کەسێك کە وەکو کاتبی خانا بووبێت، یان شتێکی لەو شێوەیە. هەرچەندە مامۆستا قەرەداغی خۆیشی ئاماژەی بەوە کردووە کە ئەو کتێبە سەردەمانێك بڵاوبووە و چەندین نوسخەی لەبەر گیراوەتەوە، ئەمەش نوسخەیەکە لەوانەی کە لە بەری نووسراوەتەوە.

کەرکووکدا. ئەو کاتە خانا تەمەنی لە (٤٠) ساڵاندا بووە. لە چەند جێگەیەکدا ناوی خانای هێناوە، لەسەر پارچە شیعرێك نووسیویەتی: (مخمس محمد خان جوانروی)، هەروەها لە شوێنێکی تردا نووسیویەتی: (خانای جوانرودی). مامۆستا قەرەداغی لە چەند جێگەیەکی کتێبەکانی تردا هۆنراوەی خانای بلاو کردووەتەوە. لە سەرەتای هۆنراوەکاندا نووسراوە: قازی خانا.[٣] هەر لەو سەرچاوانەی مامۆستادا شیعرێکی تر بە ناوی (من کلام محمد خان قبادی) بلاوکراوەتەوە. جگە لەو بەڵگانەی سەرەوە کە خستمانە ڕوو، دوابەدوای چاپی یەکەمی بەشێك لە دیوانی خانا، چەند دەستنووسێکی ترم دەست کەوت کە لە یەکێك لە کتێبخانەکانی شاری بەرلیندا پارێزراوە. چەند پارچە شیعرێکی بلاوکراوە و بلاونەکراوەی خانایان تێدا بوو.

لەناو ئەو دەستنووسانەدا بەم شێوەیە چاومان بە ناوی خانا دەکەوێت: (میرزا محمد حان جاف)، (محمد خان قبادی). ناوی یەکەم کە بە (میرزا محمد حان جاف) هاتووە، دەکرێت (میرزا موحەممەد خان، یان جان جاف) بێت. ناوی دووەمیش ڕوونە.

یەکێکی تر لەو بەڵگەنامە دەگمەنانەی لەم دواییانەدا لە لایەن کاك موئمینی یەزدانبەخشەوە بە دەستمان گەیشتووە، بەڵگەیەکە لە ڕێکەوتی (ربیع الاول ١١٣٤)دا نووسراوە. لەم بەڵگەیەدا بەم شێوەیە باس لە ناوی خانا کراوە:

*(و بعد از جریان ماجری طلب شاهدان از ملا داود کرد عن حضور رستم بگ دیوان بگی امارت پناه معظم الیه قاضی و قرّ محمد خان قبادی و لطیف آقا ولدی صوفی مصطفی و فقه صالح ولدی ملا الیاس کورەای و ملا میرزا ولدی ملا محمود معاذي الاصل فی الحال صوفی شاه علی دودستانی حاضر گردانید اداء شهاده نمود و گفت مظلمەی روز قیامت به گردن ما باشد...).*

---

[٣] هەمان سەرچاوەی پێشوو، بەرگی چوارەم، چاپی یەکەم، ٢٠٠٢، لا (٣٢٢-٣٢٥).

دوا بەڵگە و بەڵگەیەك كە حاشاهەڵنەگرە، لەناو هۆنراوەكانی خانا خۆیدا بە ناوی "خانە، خانا، خانای قوبادی، خانەی قوبادی، خانای خان قوباد..." ناوی هاتووە. لەو بەڵگانەی سەرەوەدا زۆر لایەنی شاراوەمان لە ژیانی خانا بۆ ڕوون دەبێتەوە، لەوانە:

١- بۆمان ڕوون دەبێتەوە كە ناوی خانا بەم شێوانە هاتووە: "موحەممەد خان قوبادی، خانەی قوبادی، خانای قوبادی، موحەممەد خان جوانڕوودی و خانای جوانڕوودی، خانای خان قوبادی و محەمەد خان قوبادی"، لە كۆتایی شیعرەكانیشدا ناوی خانا هاتووە.

٢- تەواو ئەوەمان بۆ ئاشكرا دەبێت كە خانا لە هیچ دەستنووسێكدا بە ناوی خانلەر و یا كەسێكی تر ناوی نەهاتووە، لەناو زۆربەی زۆری شیعرەكان و ئەو بەڵگانەدا كە هێنامانەوە و نوسخەی كۆنن، ناوی خانا بە شێوەكانی خاڵی (یەك) ناوی هاتووە.

٣- خانا كوڕی قوباد بەگی جافی جوانڕۆیە.

٤- لەناو قوبادییەكاندا چەندین ئەمیر خان بەگ و سەیید ئەحمەد بەگ و ڕۆستەم بەگ و موحەممەد هەن.

٥- ئەوەیشمان بۆ ڕوون دەبێتەوە كە نەوەكانی سەیید ئەحمەد چەندن و كێن.

٦- قوباد بەگ چەند نەوەی هەبووە.

٧- جگە لەوەش ئەوەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە ئەمیر خانی یەكەم كوڕێكی بەناوی موحەممەدەوە هەبووە، نەوەی موحەممەد بەگ كە "ئەمیر"ە، كاری فرۆشتن و سەندنی مووڵكی كردووە و بەڵگە بە ناوییەوە هاتووە.

٨- ئەم زەوییانە لە چ ساڵ و سەردەمێكدا كڕدراون، لە كێ كڕاون، سنوورەكان لە كوێوە دەست پێ دەكەن و تا كوێن، هەروەها بە چەند كڕاون؟

٩- بە ماوەیەكی كەم لە دوای كڕینی زەوییەكان، كێشە و گێر و گرفتەكان دەستی پێ كردووە، ئەگەرچی پێشتریش كێشە لەسەر ئەو زەویانە هەبووە.

۱۰- لە ماوەی یەك ساڵدا ئەو بەڵگەی موڵکە پەسەند کراوە بە ئامادەبوونی هەموو ئەو کەسانەی پێشوو، مۆر و ناوی کەسانی پێشووی تێدا هێنراوە، بەڵگەی پێشووش دووبارە ساڵی لەسەر نووسراوە و ئاماژەی پێ دراوە و کێشەکانیان چارەسەر کردووە.

۱۱- ئەم کێشە و گیروگرفتە لە پێش خانا و لەکاتی خانا و لە دوای خانای قوبادییەوە هەتا ئێستاش بەردەوامە.

۱۲- لەناو نەوەی قوبادییەکاندا کڕین و فرۆشتن بەو موڵکانەوە کراوە.

لە سەرەوە چەند خاڵێکمان خستە ڕوو لەوەی کە لەسەردەمی پێش خانا و کاتی خانا و دوای خانایشدا، ناوی خانا و برا و برازا و مام و باوك و...ی خانا، زانیارییەکان چۆن نووسراون و چۆن گواستراونەتەوە، هەر یەکەیان لە جێگەی خۆی و بەشی خۆیاندا سوودیان لێ وەردەگرین.

ئەوەی لەم بەشەدا سوودی لێ وەردەگرین ئەوەیە کە لە چەندین نوسخەدا ئەوەمان بۆ دووپات دەکاتەوە کە ناوی خانا بە: "خانەی قوبادی، خانای قوبادی، موحەممەد خان، قازی خانا، خانە، موحەممەد خان جوانڕۆیی، خانای جوانڕۆیی و موحەممەد خان قوبادی" هاتووە و ئەو ناوانە هەمان خانای قوبادییە و ناوی ڕاستەقینەی خانایشمان بۆ ڕوون دەبێتەوە کە خانا ناوی ڕاستی و تەواوی موحەممەد بووە.

**خانا لە چ هۆزێك بووە؟**

پێش ئەوەی باس لە باوکی خانا بکەم و بڵێم خانا کوڕی کێیە؟ دەبێ ئەوە ڕاست بکەمەوە کە خانا سەر بە چ هۆزێك بووە؟ چونکە لەو ڕێگەیەوە دەگەینە خاڵێك بۆ ڕاستکردنەوەی مێژووی ژیانی خانا و ڕەچەڵەکی بنەماڵەی خانای قوبادی.

لەناو سەرچاوەکانی مێژووی ئەدەبی کوردیدا ئەوە هاتووە کە خانا لە هۆزی باجەڵانەکانی ناوچەی سەرپێڵی زەهاو بووە. هەندێکی تریش دەڵێن: لە هۆزی قوبادیی جافی جوانڕۆ بووە. هەر یەکێك لەوانە بە شێوە و شێوازێك باس لەسەر هۆزی خانا دەکەن. هێنانی ئەو وتانەش هیچ بەڵگەیەکی باوەڕپێکراوی لەگەڵدا نییە، بۆیە دەبێ بە وردی قسە لەسەر ئەوە بکەین و بگەین بە خاڵێکی باوەڕپێکراو.

لە چاپی یەکەمی ئەم دیوانەدا ئەوەمان خستە ڕوو کە خانای قوبادی لە هۆزی قوبادی بووە و هەندێك بەڵگەی شیعری و نووسینمان هێنایەوە، بەڵام لێرەدا زۆر بە وردتر و بەڵگەی زیاترەوە ئەوە ڕوون دەکەینەوە.

بەڕێزان سەید تاهیری هاشمی و موحەممەد عەلی سوڵتانی لە دوو کتێبی (حەدیقەی سوڵتانی، جلد اول، ص ٢١٧ و مناجاتهای جاویدان ادب کوردی ص ٧٨)دا، خانای قوبادی بە کوڕەزای قوباد بەگی حاکمی دەرنە و لە عەشیرەتی باجەڵانەکان دەزانن. بە ڕیوایەت لە شەرەفخانی بەدلیسییەوە- کە ئاماژە بە بەرگ و لاپەڕەی نەکراوە-.

کاك سەیید فاتیح هاشمی برازای خوالێخۆشبوو سەیید تاهیری هاشمی لە کتێبی (هفت بند، مشتمل بر سه هفت بند از خانا قبادی و سید وجیه‌الدین هاشمی و سید طاهر هاشمی)دا دەڵێت: "خانا لە بنەتۆڵەی قوباد بەیگی حاکمی دەرنەی سەر بە باوەجانییە"، ئیتر نانووسێت خانا یا قوباد بەیگی حاکمی دەرنە لە عەشیرەتی باجەڵانە یا نە؟ هەروەها غەففاری سارۆیی لە مەقالەکەی خۆیدا و کە دواتر لە داستانی لەیل و مەجنوونەکەی خانادا هێناویەتی، دەڵێت: "خانای قوبادی فەیلەسووفی ناوداری کورد لە ساڵی (١٠٨٣)

لە جوانڕۆدا لەدایك بووە و لە سالّی (١١٦٨) هەر لە جوانڕۆدا کۆچی کردووە...". کەسانێکیش سەر بە عەشیرەتی باوەجانی دەڵێن: "خانای قوبادی کەلّە شاعیری ناوداری کورد خەڵکی دەرنە یا دەرنی شار بووە کە دەکەوێتە ڕۆژهەڵاتی باوەجانییەوە...".

مامۆستا موحەممەد ڕەشیدی ئەمینی شاعیر و لێکۆڵەری پاوەیی دەڵێت: "خانا یەکێکە لە بەگزادە جافەکانی هۆزی قوبادی کە لە ناوچەی جوانڕۆ تا نزدیکی سەرپێڵی زەهاو نیشتەجێ بوون...". بەڕێز مامۆستا محێدین سالّحی لە کتێبی (سرود بادیە، ل ١٢٣)دا دەڵێت: "خانا لە ١٠٨٥ی مانگیدا لە ناوچەی جوانڕۆدا لەدایك بووە و ڕۆژێك لە خزمەتیدا بووم، دەیگوت چەند جار لە مەڕ خانای قوبادییەوە لەگەڵ سەید تاهیری هاشمیدا قسەم کردووە، بەڕێزیان بەڵگەیەك کە نیشاندەری باجەلانیبوونی خانا بێت نەیان بووە، تەنیا لە ڕووی مەزەندە و گومانەوە دواوە...".

هەروەها مامۆستا موحەممەد سالّح ئیبراهیمی (شەپۆل) لە کتێبەکەیدا (زانایانی کورد)[٤] دەڵێت: "خانای قوبادی لە هۆزی پاشاکانی باجەلانە و نەوەی قوباد بەگی حاکمی دەرنێ و دەرەتەنگە...". دواتر شێخ حامید لە دیوانەکەیدا سەبارەت بە هۆزی خانا دەڵێت: "خانای قوبادی پاشا لە عەشیرەتی گۆرانە".[٥]

هەروەها دەستنووسێکی سەیید تاهیری هاشمی هەیە کە لەسەری نووسراوە (گوڵزاری ئەدەب). ئەم دەستنووسە وێنەیەکی لەبەرگیراوی خودی مامۆستایە و هەندێك شوێنی بەباشی ناخوێنرێتەوە، ئەم نووسینە تایبەتە بە ژیان و بەرهەمی خانای قوبادی. دەستنووسەکە ئەو وتار و نووسینانەی هاشمییە کە لە ڕادیۆی کوردیی کرماشان بە زمانی

[٤] زانایانی کورد: محەمەد سالّح ئیبراهیمی (شەپۆل)، چاپخانەی سەقز(محەمەدی) - لا (١٠٤).

[٥] یادی شاعیرانی کورد: هۆنراوەی حاجی شێخ حامد حیسامی - چاپی یەکەم، ١٣٨٢ی هەتاوی، چاپخانەی ڕۆستەم خای-تاران، لا (٧٥).

کوردی، بە ناوی "هەوارگەی دڵان"ەوە ئامادە و پێشکەشی کردووە. لە بنەماڵەی نووسەرم وەرگرتووە.

هاشمی نووسیویەتی: "خانای قوبادی لە نەتەوەی قوباد بەگی کوڕی عومەر بەگی کوڕی سوهراب بەگە. قوباد بەگ و باوك و پیری حاکمی دەرەتەنگ بوون...". لێرەدا دەتوانین ئەوەش بڵێین: لەناو تۆرەمەی قوبادی و باجەلانەکاندا ناوی قوباد بەگ هەیە.

خاڵێکی تر کە گرنگە باسی لێوە بکرێت ئەوەیە، خانا بە خاین باسی باجەلانەکان دەکات. ئەمەش خاڵێکی گرنگە و دەبێ لەسەری بوەستین.

لە کۆی ئەو هەموو وتار و سەرچاوانەی خستمانە ڕوو، هیچ یەکێك لەوانە بەڵگەیەکیان نەخستۆتە ڕوو. هەموو ڕاکان ڕای تاکەکەسین. خانای قوبادی لەناو شیعرەکانی خۆیدا بە چەندین شێوە باسی لە هۆزەکەی خۆی کردووە. هەر بۆیە باشترین بەڵگە کە ئەوەمان بۆ یەکلایی بکاتەوە، بەڵگەکانی بنەماڵەی قوبادییەکانە و لە سەردەمی خانادا نووسراونەتەوە، وەکو لە باسی ناوی خانادا چەند لایەنێکی ژیانی خانامان لە چەند خاڵێکدا نیشان دا و ئاماژەمان پێ کرد کە هەر یەکەیان لە جێگەی خۆیدا دەخەینە ڕوو.

لە خاڵی (١ و ٣)دا ئەوەمان پێ دەڵێت کە خانا لە نەوەی قوباد بەگی جافی جوانڕۆیە. لە چەند خاڵێکی تریشدا ئەوەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە و لە قوبادیبوونی خانا دڵنیامان دەکاتەوە، بۆ نموونە ئەوە ڕوون دەبێتەوە کە لەناو قوبادییەکاندا چەندین ئەمیر خان بەگ و سەیید ئەحمەد بەگ و ڕۆستەم بەگ هەن. ئەوەیشمان بۆ ڕوون دەبێتەوە کە نەوەکانی سەیید ئەحمەد چەندن و کێن، هەروەها ئەوەی کە خودی سەیید ئەحمەد برای خانایە. خاڵێکی گرنگتر ئەوەیە کە قوباد بەگ چەند نەوەی هەبووە. ئەم خاڵە کە لەناو بەڵگەی موڵکدارێی قوبادییەکاندا هاتووە، پاڵپشتی قوبادیبوونی خانامان بۆ دەکاتەوە. کڕینی ئەو موڵکانەش کە کڕاون و ناوی موڵکەکانیش ڕوون و ئاشکران و لە ناوچەکانی ژێر دەستەڵاتی

قوبادیدان. لە سەرووی ئەمانەشەوە لەناو شیعرەکانی خانای قوبادیدا چەند بەڵگەیەك هەیە پشتڕاستی هەموو ئەو بەڵگانەمان بۆ دەکاتەوە. لە شیعری "بای شەماڵ ڕێشەن"دا خانا دەڵێت:

ئیستا من دەستاخ کۆتەڵ پاونام
بیٚ جـــەد خاین بـــاجەڵانام
بە ڕۆژ بیٚخورد و بە شەو بیٚخاوم
دیل بیٚتاوان، پـــاشای زەهـــاوم

لەم چەند بەیتەدا گومانێك لە زیهنی خوێنەردا دروست دەبێت کە خانا لە باجەڵانەکان نەبووبێت، هەر بەپێی ئەو بەڵگە و سەرچاوە و بەیتە شیعریانەی خانا، هەروەها لەم دوو بەیتەدا ئەوەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە کە خانا لەلای باجەڵانەکان گیراوە، وەکو خۆی دەڵێت: من ئێستا دیلێکی دەست و پێ بەستە و بێتاوانم و لەلای باجەڵانەکان بەبێ هۆ گیراوم، بێ هۆ بە خاین دانراوم. جگە لەوەیش، خانا لە بەندیخانەی باجەڵانەکاندا لە ژیانێکی زۆر ناخۆشدا بووە.

لەم چەند دێڕەی خوارەوەیشدا ئەو جیاوازییەی خانا لە باجەڵانیبوونی و بە قوبادییبوونی ئاشکرا دەبێت:

ئـــــەی بـــــادی! شـــەماڵ فرە زەلیلم
وێنـــەی عـــــارەبـــــان، بـــە تۆ دەخیلم
عەرزەی جەستە و حـاڵ ئێمە و ئـــەسیان
بەرە پـــــەی ئۆتاق بەگـــــزادەی میان

خانا دەڵێت: بای شەماڵ! ئەو عەرز و حاڵەی ئێمەی ئەسیر بەرە بۆ لای بەگزادە و میرەکان. لەم شوێنەدا سەرکردەی باجەڵانەکان بە پاشا بەناوبانگن، بەڵام سەرکردەی جافەکان بە بەگزادە. لەم بەیتەدا باشتر ئەوەمان بۆ ئاشکرا دەکات و دەڵێت:

**باچە بەو جاهیلان قەوم و قارداشم**

**ئەو چاپووك سوار، لە مەیدان باشم...**

خانا لەم بەیتەدا قەوم و برادەرانی خۆیمان بۆ دەستنیشان دەکات، هەروەها هۆز و تیرەکەیشی لە باجەڵانەکان جیا دەکاتەوە.

لە نوسخەکەی بەرلینیشدا بە ناوی "موحەممەد خان قوبادی" و لە کەشکۆڵی مەولانا حەمزەدا بە "موحەممەد خانی جوانڕۆیی و خانای جوانڕۆدی" ناوی هاتووە. ئەمانە بەڵگەن بۆ سەلماندنی ئەوەی کە "خانای قوبادی" خەڵکی جوانڕۆ بووە و لە هۆزی قوبادییەکان بووە. هەروەها خودی شاعیریش لە چەند بەیتێکی تردا دەڵێت:

**قوباد قوچاغ کۆی نەوسوارم**

**تەرح جەبلەکێش باغچە و حەسارم**

لێرەدا وشەی "قوباد" بە سێ شێوە لێك دەدرێتەوە:

**یەکەم:** تیرەی قوبادی جافی جوانڕۆیی.

**دووەم:** ناوی باوکی خانای قوبادی، واتە: خانا کوڕی قوباد.

**سێیەم:** واتە کەسی زۆر زیرەك و دلێر.

خانا لێرەدا زۆر بە دەستڕەنگینی کاری کردووە و جوانکارییەکی بێوێنەی کردووە. وای لە خوێنەری خۆی کردووە تێرامێنێ لەو وشەیە و بە چەندین شێوە وشەکە لێك بداتەوە. لایەنی (تبادُر، ابهام، حُسن طَلَب و جمع و تفریق...) لەم بەیتەدا هەیە و چەند لایەنێکی جوانکاریی بەسەردا جێبەجێ دەکرێت. خانا لە جێگەیەکی تردا دەڵێت:

قوباد و قـــۆچـــاغ، قـــەدیم سـالاّن بیم
بابـــۆی بــــەگزادان کەمـــــەرلالاّن بیم

لەم بەیتەیشدا خانا لایەنێکی تری جوانکاری (جمع و تفریق)ی بەکار هێناوە. هـەردوو وشەی "قوباد و قۆچاغ"ی کۆکردووەتەوە. قوباد هەر وەکو بەیتی پێشوو چـەند مانایـەکی هەیە. جگە لەو دوو بەیتەی سەرەوە کە خرانە ڕوو، جارێکی تر خانا لە داسـتانی سـولّتان ئیبراهیم و نۆش ئافەرین دا دەڵێت:

گۆش دەن بە داستان خانـای خان قوباد
وەی دنیای بیّ پۆ، هەرگیز نـەبۆن شاد
مونشیی دیـوان دەفتەرخانەی عـــەشق
هیجرانکێش دەور، شێخ سەنعان مـەشق

لێرەدا خانا زۆر بە ڕوونی و جوانی پلە و پایە و هۆزەکەی خۆی دەستنیشان دەکات. لە نیوەبەیتی یەکەمی ئەو دوو بەیتەی سەرەوە کە بە نموونە هێنرانەوە، خانا دەڵێت: گـویّ بگرن لە داستانێك کە خانای خانی قوبادییەکان بۆتان باس دەکات. هەروەها لە کۆتـاییی داستانی یووسف و زولەیخاکەیشدا دەڵێت:

بەی تەور بەیان کەرد خانای خان قوباد
پـــــەریّ هامسەران بمانۆ وە یـــــــاد

ئەنجامی ئەم توێژینەوەیە ئەوەمان بۆ دەردەخات کە خانا لە هۆزی قوبادییەکانی جـافی جوانڕۆ بووە و لە هۆزی باجەلاّن نەبووە، چونکە خانا لە شیعری "بـای شـەماڵ ڕێـشەن"دا ئاماژە بەوە دەکات کە لە نەوەی کێیە. ئەگەر خانا کوڕی قوباد بەگی باجەلاّن بێـت، ئـەوا

قوباد بەگی باجەڵان کوڕی عومەر بەگی کوڕی سوهراب بەگی باجەڵانە.[٦] قوباد بەگی قوبادییەکانیش کوڕی ئەمیر خانی کوڕی سەیید ئەحمەدی گەورەی جافە. کەریم بەگی کوڕی فەتاح بەگی جافیش لە کتێبی "تەئریخی جاف"دا لاپەڕە ١٢٤ دەڵێت:

*"ئەم چەند تایفەیە لە جافەکانی ئێران جویێ بوونەوە و هاتوونەتە شارەزوور و خاکی بابان کە داخڵی عێراقە و تایفەکانی جاف کە لە ئێران ماونەتەوە ئەمەیە کە ئەینووسم: قوبادیی، باوەجانیی، ئیمامیی، یەناخیی، قادرمیرەویسیی، تایشەیی، کۆیك، نێرژی، دەروێشیی، وەڵەدبەگیی، دەڵەژێریی، کۆکۆیی، زەردوویی، عەلی ئاخەیی، پەپڵیی، تاووگۆزیی، دووڕوویی، کوێرەکیی".*

خانای قوبادییش دەڵێت:

**نـــەوەی ئەمیرخان، بـــەچەی بێباکم**
**بێ فەرش، بێ باڵین، ئوفتادەی خـــاکم**

وەکو بۆمان ڕوون دەبێتەوە کە خانا لە هۆزی قوبادییەکانە و کوڕی قوباد بەگ و لە نەوەی ئەمیر خانە. لە بەشەکانی تردا بەڵگەی تر هەن کە سەلمێنەری ئەم وتانەن.

[٦] نێلی باجەڵان لە سەفەوییەکانەوە تا کۆتاییی قاجارەکان، مەزاهر باجەڵان- و. ف: جەلیل مورادی و کاروان عوسمان خەیات (ڕێبین)، چاپخانەی گەنج، سلێمانی، ٢٠١٤، لا (٤٦-٤٨).

## ڕەچەڵەکی خانای قوبادی

لە باسی ناوی خانادا ئەوەمان بۆ ڕوون بووەوە کە خانا ناوی موحەممەد بووە. لـە بەشـی دووەمیشدا ئەوەش سەلمێنرا کە خانا لە هۆزی قوبادیی جافی جوانڕۆ بووە. دواتر ئەوەشمان بۆ ڕوون بووەوە کە خانا کوڕی قوباد بەگی نـەوەی ئـەمیر خانـە. هـەروەها ئـەوەشمان وت کـە تۆرەمەی ئەم بنەماڵەیە تێـك دراوە. لێـرەدا ئـاوڕ لـەو خاڵـە دەدەینـەوە کـە لـەناو ئـەو شەجەرانەی بەردەستمان بە چەندین شێوە تۆرەمەی ئەم بنەماڵەیە هاتووە.

موحەممەد عەلی سوڵتانی لە کتێبی "جوگرافیای تاریخی و... کرماشان"دا لـە لاپـەڕە ١٩٥دا بەم شێوەیە تۆرەمەنامەی قوبادییەکانی هێناوە: "قوباد بـەگ کـوڕی ئـەمیر خـان بەگی کوڕی سەیید ئەحمەد بەگە. قوباد بەگ پێنج کوڕی هەیە: ئوغلۆ بەگ، شـاه وەیـس ئاغا، یووسف ئاغا، عەلی ئاغا و مصور ئاغا". وا هەست دەکەم ناوی پێنجەم مەنـسوور ئاغا بێت!

هەروەها لەسەر داوای یەکێك لە قوبادییەکان سـەیید تـاهیری هـاشمی تۆرەمەیـەکی نووسیوە و بەم شێوەیە دەست پێ دەکات:

*"سێ شەممە ١٧-٩ی مانگی ڕەبیعولئاخری ساڵی ١٣٨٧ی کۆچیی مانگی، بەرانبەر بە سێشەممەی مانگی خوردادی ١٣٤٦ی کۆچیی هەتاوی کە ئاغای دانیشتوی گوندی ئایشەیی زەهاو لە بەرواری ناوبراودا چووبووە لای ئاغای سەیید تاهیری هاشمی و داوای تۆمارکردنی سەرجەلەی خۆی و سەرلەبەری بەگزادەکانی قوبادیی کردووە.*

*بەندە سەیید حەسەن کوڕی سەیید وەلی سەیید موستەفا، بەپێی ئەوەی ئەم سەرجەلەی باپیرانە دەبێتە سەرجەلەی پیرۆزی بەگزادەکانی قوبادی، من لە بەگزادەکانی قوبادیم، لە نەوەکانی کوڕی ئەمیر خان، بۆیە حەزم کرد ئەم سەرجەلەیە بنووسمەوە. ئەم ماڵە لە کوڕانی سەیید ئەحمەد بەگی گەورەن و دەبێتە باپیرەگەورەی تەواوی بەگزادەکانی قوبادی و باوەجانی. سەیید ئەحمەدبەگی گەورە دەبێتە باپیرە*

*گەورەی تەواوی بەگزادەکانی جافی جوانرۆ کە دەکەنە بەگزادەکانی قوبادی و باباجانیی جوانرۆ و وەڵەد بەگی. بەناوبانگترین کوڕانی سەییید ئەحمەدبەگی گەورە سێ کوڕن: ڕۆستەم بەگ، دەکاتە باپیرەی تەواوی بەگزادە و بریکارەکانی جوانرۆ، ئەمیر خان، دەبێتە باپیرەی قوبادی و باباجانی و وەڵەد بەگیش دەکاتە باپیری بەگزادەکانی وەڵەد بەگی.*

*سەیید حەسەن کوڕی سەیید وەلی کوڕی سەیید موستەفای کوڕی سەیید حوسێنی کوڕی سەیید تەیموری کوڕی سەیید زەکی خانی کوڕی سەیید شۆڕە بەگی کوڕی سەیید قوباد بەگی کوڕی سەیید ئەمیر خانی کوڕی سەیید ئەحمەد بەگی گەورەی کوڕی سەیید عەلی کوڕی سەیید ئێناخی کوڕی سەیید ناهم ئەناعم".*

لەناو ئەو بەڵگانەی کە لە کاك جەماڵی کوڕی ساڵحی کوڕی سولەیمانی قوبادیم وەرگرتووە، ئەم بەڵگە دوای (۲۸-۲۹) ساڵ لە بەڵگەی موڵکی ئەمیر خانی کوڕی موحەممەدی ئەمیر خانی یەکەم نووسراوە، واتە ساڵی (۱۱۳۰) نووسراوە. لەم بەڵگەیشدا هەندێك لایەنی گرنگی ترمان بۆ ڕوون دەبێتەوە.

لە کۆی ئەو بەڵگە و نووسین و شیعر و تۆمارانەی بەردەستمان ئەوەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە کە تۆرەمەی قوبادییەکان بەم شێوەیەیە:

ئێناقی ئەسڵ، کوڕێکی هەبووە بە ناوی سەیید عەلی، سەیید عەلییش چەند کوڕێکی هەبووە، لەوانە: موستەفا بەگ، موحەممەد و سەیید ئەحمەد بەگی یەکەمی جاف.

سەیید ئەحمەد بەگیش ئەم نەوانەی هەبووە: ڕۆستەم بەگی یەکەم (ڕۆستەم بەگی)، وەلید بەگ (وەڵەد بەگ)، ئەحمەد بەگی سەغیر (دووەم، شەمێرانییەکان)، ئەمیر خانی یەکەم (ئەمیرییەکان)، خالید ئاغا، مەنووچەهر (مەنووچەهرییەکان) و قوباد بەگی یەکەم.

ڕۆستەم بەگی یەکەم: دوو کوڕی ئەم پیاوە دیارن و ناویان: کەیخوسرەو سوڵتان و ئەحمەد سوڵتان. نەوەکانی کەیخوسرەو سوڵتان بریتین لە: بەهرام بەگ و عەبدوڵڵا بەگی وەکیل.

نەوەکانی ئەمیر خان بریتین لە: موحەممەد و قوباد بەگی دووەم. نەوەی خالد ئاغا، ئەمیر خانە، نەوەی ئەمیر خان موحەممەدە. نەوەکانی مەنووچەهر بریتین لە: ئـەمین خـان بـەگ و میرزا بەگ. نەوەکانی قوباد بەگی یەکەم بریتین لە: خان پاشا و ئەحمەد.

قوباد بەگی دووەم: نەوەکانی ئەم قوباد بەگە بریتین لە: یووسف ئاغا، مەنسوور ئاغا، ئۆغلو بەگ، عەلی ئاغا، شاوەیس ئاغا، شۆرە بەگ، موحەممەد (خانای قوبادی) و ئەحمەد بەگ.

نەوەکانی یووسف ئاغا بریتین لە: ئۆغلو بەگی دووەم و موحەممەد. نەوەکانی ئۆغلو بەگ ئەمـانەن: ئیسمـاعیل و سلێمان. نەوەی موحەممەدیش حەبیبوڵڵا خان (نیزامولئەیالە)یە.

نەوەکانی ئەحمەد بەگی کوڕی قوباد بەگیش بریتین لەمانە: موئمین بەگ، یار حوسـێن بەگ (پارەچین)، خانلەر بەگ، ئەمیر خان، عیسا بەگ، ڕۆستەم بەگ، میرزا بـەگ و بـۆران بەگ.

لە نەوەکانی سەیید ئەحمەد بەگی یەکەمی جافدا چەند هۆزێك دروست بوون، لەوانە: ڕۆستەم بەگی، وەڵەد بەگی، شەمێرانی، ئەمیری، خالد ئاغایی (ناوی ئەم هۆزەم بە دروستی دەست نەکەوتووە) و مەنووچەهری.

هۆزی قوبادی لە ئەمیر خانییەوە دروست بووە و لە قوبادییەکانیشەوە چـەند تیرەیـەك دروست بوون.

لێرەدا ئەوەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە کە خانا ناوی موحەممەدە و کوڕی قوباد بەگی یەکەمی کوڕی ئەمیر خانی یەکەمی کوڕی سەیید ئەحمەد بەگی یەکەمی جافی کوڕی سەیید عەلی یەکەمی کوڕی ئێناقی ئەسڵی یەکەمی کوڕی سەیید ناهم ئەناعمە.

پێویسته ئەوەیش ڕوون بکەینەوە کە بۆ لەگەڵ هەندێ ناودا یەکەم و دووەمـــان دانــاوە. وەکو ئەمیر خانی یەکەم و سەیید ئەحمەدی یەکەم. ئەوە بەهۆی ئەوەوە دانراوە چونکە لەناو ئەم بنەماڵەیەدا چەند ناوێك هەن زۆر دووبارە بوونەتەوە، بۆیە ژمارەمان لەگەڵیاندا داناوە. خانای قوبادییش دەڵێت:

**نەوەی ئەمیرخان، بــــــەچەی بێباکم**
**بێ فەرش، بێ باڵین، ئوفتادەی خاکم**

**ساڵی لەدایکبوونی خانا**

سەبارەت بە ساڵی لەدایکبوونی خانای قوبادی ڕای جیاواز هەیە، هەر یەکێك لە توێژەرانیش بە شێوەیەك باس لە خانا دەکەن. بۆ ئەم مەبەستە هەندێك لەو ساڵانە دەهێنین و دواتر بەپێی هەندێك بەڵگە و بەیتی شیعری خانای قوبادی کە لەناو شیعرەکانیدا بەدەستمان هێناوە، ڕای خۆمان لەسەر ساڵی لەدایکبوونی خانا دەخەینە ڕوو.

هەر یەك لە کتێبی گوڵزاری کوردستان، سدیق بۆرەکەیی لە کتێبی مێژووی وێژەی کوردی، لە نامیلکەیەکی چاپی کۆندا، بەگزادەکانی جوانڕۆ و شێخ حامید لە دیوانەکەیدا ساڵی لەدایکبوونی خانا بە ساڵی (١٠٨٣ك. م.) لە قەڵەم دەدەن.

بەڕێز مامۆستا مەلا محێدین ساڵحی لە کتێبی (سرود بادیه) لا (١٢٣)دا دەڵێت: خانا ساڵی (١٠٨٥ك. م.) لە ناوچەی جوانڕۆدا لەدایك بووە. مامۆستا سەجادییش ساڵی لەدایکبوونی خانا بە (١٧٠٠م=١١١١ یا ١١١٢ك. م.) دەزانێت. هەر یەك لە سەید تاهیری هاشمی و موحەممەد عەلی سوڵتانی لە دوو کتێبی (حدیقەی سلطانی، ج ١، ص ٢١٧) و (مناجاتهای جاویدان ادب کوردی ص ٧٨)، مارف خەزنەدار لە بەرگی دووەمی مێژووی ئەدەبی کوردییەکەی، لا ٧٣دا و مامۆستا موحەممەد ساڵح ئیبراهیمی (شەپۆل) لە کتێبی زانایانی کورد، لا ١٠٤دا دەڵێن: خانا ساڵی (١١١٦ك. م.) لەدایك بووە.

حەکیمی مەلا ساڵحیش ساڵی لەدایکبوونی خانا بە (١١٣٣ك. م. =١٦٦٧ز.) دەزانێت، بەڵام ساڵی (١١٣٣ك. م.=١٧٢٠ یا ١٧٢١ز.) و ئەو ساڵە زایینییە بەرانبەر بە ساڵە کۆچییەکە هەڵەیە.

سەبارەت بە ساڵی لەدایکبوونی خانا لە شیعری "پەی سەنەی ساڵم"دا ئاماژەیەك بۆ ساڵێك هەیە، ئەگەر لێکی بدەینەوە دەمان گەیەنێتە خاڵێك کە تا ڕادەیەك لەلای من دڵخۆشکەر و جێی بڕوایە. خانا لە سەرەتای ئەو شیعرەدا دەڵێت:

پەی سەنەی سالّم، پەی سەنەی ســـالّم
دیـام وە تاریخ پەی سەنـــــەی ســـالّم
پەنجا و چوار بیم هــــــەرەس وە مـــالّم
پـــیـــری وە بێ دەنگ بی وە زەوالّـــم

بەلاّم بۆرەکەیی لە بەرگی یەکەمی مێژووی وێژەی کوردی (لا ٤٣٥)دا، کاتێك باسی میرزا شەفیعی کولیایی دەکات، دەڵێت: میرزا شەفیع سالّی (١١٦٩ك. م.) لەدایك بووە. خانا نامە گۆڕینەوەی لەگەڵ میرزا شەفیعی کولیاییدا هەبووە، ئەوەی لە بەردەستدایە لە چەند نامەیەکی شیعری و وەلاّمەکەی زیاترە. گومانیش لەوەدا نییە نێوان ئەم دوو شاعیرە ئەوەندە پتەو و پڕ زانیاری و خۆش بووە، تەنها لەم دوو- سێ نامە شیعرییەدا نەوەستاوە. ئەم نامە گۆڕینەوەیە لە نێوان دوو شاعیری هاوتەمەندا، جێگەی سەرسووڕمانە و ئەو دوو سالّەی بۆ ژیانی ئەم دوو شاعیرە لەلای هەندێك لە نووسەرانەوە دانراوە، هەڵەیە و جێگای پرسیارە.

ئەگەر وا دانێین خانا سالّی (١٠٨٣ك. م.) لەدایك بووە و میرزا شەفیع سالّی (١١٦٩ك. م.) لەدایك بووە، دەبێت خانا تەمەنی (٨٦) سالّ بووبێت و میرزا شەفیع سالّێك یا تازە لەدایکبوو بووبێت و نامە گۆڕینەوە لە نێوانیاندا هەبووبێت. ڕوون و ئاشکرایە کە ئەو مێژووە نووسراوانە هەڵەن.

ئەگەر وا دانێین خانا سالّی (١١١١ یا ١١١٦ك. م.) لەدایك بووە، دیسانەوە هەردوو سالّەکە هەڵەیە. ئەو سالاّنەی بۆ خانا و میرزا شەفیع دانراون و بەپێی ئەو شیعرانەی لە نێوان ئەم دوو شاعیرەدا هەیە، پەنجەی گومان دەخەنە سەر ئەو سالاّنەی کە بۆیان دانراوە. هەر ئەو سالاّنەشی کە بۆ کۆچی دوایی خانا دانراوە و ئەو سالّەی بۆ لەدایکبوونی میرزا شەفیع دانراوە جێگەی گومانن، چونکە بە یەك ناخۆن و جیاوازیی زۆر لەو نێوانەدا هەیە.

ئاخر چۆن دەکرێت کەسێك تازە هاتبێتە دنیاوە لەگەڵ کەسێکدا لە کۆتایی ژیانیدا بێت نامە گۆڕینەوەیان لە نێواندا هەبووبێت؟

بۆرەکەیی لە کتێبەکەیدا شیعری "پەی سەنەی سالّم" بەم شێوەیە دەهێنێت:

**یە سەد و شەستەن هەرەس وە مالّم**

**پەیی وە بێ دەنگ بی وە زەوالّـــــم**

ئەم بەیتە ئەگەرچی دەستکاریی پێوە دیارە و نیشانەی (؟!)ی لەسەرە، ڕام وایە ئەم تاکە دەستکاری کراوە. بەپێی ئەم بەیتە دەبێ خانا هۆنراوەکەی سالّی (١١٦٠) نووسیبێت، کەواتە ئەو سالّە چەندە کە خانای تێدا لەدایك بووە؟ لەم شیعرەدا نازانرێت کەی خانا لەدایك بووە. تەنها بەوەی بلّێین (١١٦٠-٦٠=١١٠٠) ئەوە ناسەلمێت کە لەو سالّەدا خانا لەدایك بووە. سەبارەت بەوەی کە گومانم لەو بەیتەی لای سدیق بۆرەکەیی هەیە، هۆکارەکەی ئەوەیە کە بۆرەکەیی لە کتێبەکەیدا زۆر هەڵەی کردووە و زۆر شتی تێکەڵ کردووە. بە شێوەیەك کە هەرکەس دەیخوێنێتەوە دەکەوێتە گومانەوە. هەر لێرەدا ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت خانا سالّی (١٠٩٨) لەدایك بووبێت. لەناو ئەو شیعرانەی بەردەستماندا میرزا شەفیع و خانا سەری زمان و بنی زمانیان باس باسی پیرێتییە.

**خانا چون تۆ پیر، تۆ پیر چون خانا**

**هەر دوو خاك پـــای پیران دانـــا**

خانا لەم شیعرەدا بە سێ ئاماژەی گرنگ یەکلاییمان ئەکاتەوە لەسەر ئەوەی بلّێین خانا سالّی چەند لەدایك بووە. خانا لە سەرەتای شیعرەکەدا دەڵێت:

**پەی سەنەی سالّم، پەی سەنەی ســـالّم**

**دیـام وە تاریخ پەی سەنـــــەی ســـالّم**

**پەنجا و چوار بیم هـــــەرەس وە مـــالّم**

**پـــیـــری وە بێ دەنگ بی وە زەوالّـــــم**

لە جێگەیەکی تردا خانا دەڵێت:

**قامەت ڕێك و ڕاست وە سەر نەی ڕەوان**

**پیری چەفتی کـــەرد وەك چەفتی کەوان**

ئەم بەیتەش ئاماژەی پیریتیی خانای تێدایە و ساڵمان بـۆ دەستنیـشان دەکـات. خانـا وێنەیەك دەکێشێت، وێنەیەك لە قامەت و باڵای خۆی دەکێشێت و نیـشانەی سـاڵمان بـۆ دەخاتە ڕوو. وای بۆ دەچم خانا ئاوەهای گوتبێت: قامەتم ڕێکـە، واتـە: (١٠٠٠)، ڕاسـت: واتە: (١٠٠)، پیری لاری کردەوە وەکو چەفتی کەوان: دەکاتە ژمارە (٥٠)، واتە وەکو ئـەو دار و لاستیکەی کەوانە کە کاتێك ڕادەکێشرێت و وەکو ژمارە پێنجی لێ دێت، کـاتێکیش تیرەکە لە ناوەڕاستی دادەنێیت وەکو ژمارە چـواری لـێ دێـت و دەکاتـە ژمـارە (٤)، یـان هەندێك کەوان هەیە خۆی وەکو ژمارە (٤) وەهایە، ئەمە بۆچوونی منە، یان دەکرێت بەبێ تیرەکە قامەتی وەکو ژمارە دووی لێ هاتبێت، واتە بە شێوەی هیلالی.

لە نیوەدێری دواتریشدا دەڵێت "قەواغم"، مەبەستی لە خڕی و شێوە گۆییە کە وەکـو پێنج وەهایە. ئەمەش بەڵگەیەکی دییە بۆ دڵنیابوونەوە لە تەمەنی خانا کـە بریتییـە لـە ساڵی (١١٥٢) و لە سەرەوەش تەمەنی خۆی بە پەنجا و چوار داناوە. لەم چەند بەیتەدا دوو خاڵمان بۆ ڕوون دەبێتەوە:

١- ساڵی (١١٥٢).

٢- خانا دڵنیاییمان پێ دەدات بەوەی کە ساڵی (١١٥٢) نامەکەی نووسیوە.

کاتێك باس لە پیری دەکات و وێنەکە دەکێشێت، وشەی "قەواغم" دەهێنێت، هەروەها دڵنیایی لە پیری و شێوەی لاشـەی لـە شـێوەی ژمـارە (٥٢) و چـەمانەوە وەکـو ئـەو دوو ژمارەیە. لە بەیتێکی تردا خانا دەڵێت:

**پیر و کەفتەکار، قامەت قەواغم**

**شەریك مەینەت، ڕەفیق ئـــاخم**

ئەم بەیتە دەتوانین زۆر شتی لێ بەدەست بهێنین، خانا تەواو پەشێو و بێحاڵە بە دەست پیرییەوە. ئاماژەش دەکات بەوەی کە جەستەی چیی بەسەر هاتووە، ئەوەی زۆر گرنگـە لـەم بەیتەدا وشەی "قەواغم"ە.

وشەی "قەواغم" لەم بەیتەدا ئەگەرچی لە دەستنووسەکەدا بە "قەواخم" هاتووە، لـە لای (حد)یش بە هەمان شێوە هاتووە و لە (مع)دا نـەهاتووە. بـەڵام لـە ڕاسـتیدا دەبێـت "قەواغم" بێت. لە ئاوازەکەشیدا هیچ لەنگییەك دروست نابێت و جوانکارییەکەش جـوانتر دەردەکەوێت، جگە لەوانەش کە باسمان کرد، ساڵی هۆنراوەکەمان بۆ دەخاتە ڕوو. ئەم وشەیە بەپێی ڕیزبەندیی پیتەکانی ئەلف و بێ (حروفی ئەبجەد) ئـەم وشـەیە بـەم شـێوەیە لێـك دەدرێتەوە:

| |
|---|
| ق ١٠٠ + هـ ٥ + و ٦ + ا ١ + غ ١٠٠٠ + م ٤٠ = ١١٥٢ |

**لەم بەیتەدا چەند شتێکمان بۆ ڕوون دەبێتەوە:**

**١- ساڵی نووسینەوەی شیعرەکە کە ساڵی (١١٥٢)ی کۆچییە.**

**٢- نامەکە بۆ میرزا شەفیعی کولیایی نووسراوە.**

**٣- لەو ساڵەدا خانا پیر بووە.**

**٤- ساڵی لەدایکبوونی خانای قوبادیمان بە هاوکاریی ئەو بەیتەی سەرەوە بۆ ڕوون دەبێتەوە.**

خانا لە ساڵی (١١٥٢)دا ئەم شیعرەی بۆ میرزا شەفیعی کولیایی نووسیوە. هەروەها لە سەرەتاوە دەڵێت: من تەمـەنم (٥٤) ساڵە، جگە لەوەش وشـەی "قـەواغم" دەکاتـە سـاڵی

(١١٥٢)، بەم پێیە ساڵی (١١٥٢-٥٤=١٠٩٨)ی کۆچی دەکات. کەواتە خانای قوبادی لە ساڵی (١٠٩٨)ی کۆچییدا لەدایك بووە.

بەپێی ئەو سێ بەیتەی لە هۆنراوەکەدا هاتووە و شیمان کردنەوە، بڕوام وایە کە خانا لە ساڵی (١١٥٢) ئەو نامەیەی بۆ میرزا شەفیعی کولیایی نووسیوە و تەمەنی (٥٤) ساڵ بووە. هەروەها لە ساڵی (١٠٩٨)ی کۆچیش لەدایك بووە. هەتا دەرکەوتنی زانیاریی نوێ لەسەر ساڵی لەدایکبوونی خانای قوبادی، من ئەم وتانەم لێرەدا جێگیر دەکەم.

**نازناوی شیعریی خانا**

یەکێك لەو بابەتە فارسییانەی لە قۆناغی یەکەمی زانکۆمدا خوێندمەوە، بابەتێکی موحەممەد ڕەزای کەدکەنی بوو بە ناونیشانی (نقش ایدئولوژیك نسخه بدل ها). ئەم بابەتە زۆر باس لەسەر ئەو گۆڕانکارییانە دەکات لەناو دەستنووس و کەشکۆڵەکاندا کە کاتبان چ گۆڕانکارییەك دەکەن. هۆکار و فکر و مەزهەب و شتی زۆر باس دەکات کە کاریگەرییان لەسەر کاتبان و نووسەران هەبووە و هەیە. نووسەر زۆر بە وردی لەو بابەتە ورد دەبێتەوە و ئاماژە بە لایەنەکانی دەکات.

بۆیە لێرەدا ئەوەم خستە ڕوو، چونکە ناوی خاناش بە هەر جۆر و شێوەیەك بووبێت، لە کات و سەردەمی خۆیدا یان دوای خۆی، لە دەستنووسەکاندا بە چەندین شێوە ناوی هاتووە و باسی کراوە. هۆنراوەکانی نووسراونەتەوە. لە لایەن هەندێك کەسیشەوە شیعرەکانی تێکەڵ کراون. هەروەکو چۆن لە باسی ناوی خانای قوبادیدا ئەوەمان خستە ڕوو کە هەندێك لە کاتبان و نووسەرانی کەشکۆڵ و بەیازەکان ناوی خانایان بەم شێوەیە نووسیوە: "خانای قوبادی، خانەی قوبادی، خانا، خانە، موحەممەد خان قوبادی و موحەممەد خان جوانڕۆیی و..."، خودی خاناش لەناو شیعرەکانیدا بە "خانە، خانا، خانەی قوبادی، خانای قوبادی و خانای خان قوباد و..." ناوی خۆی بەکار بردووە.

تاکو ئێستا بەو شێوانەی سەرەوە ناوی خانا لەناو هۆنراوە و دەستنووسە کۆنەکاندا بەکار براوە و هاتووە. پێ دەچێت هەر بەم شێوە و شێوازانەش بەکاری بردێت، یان لە ژێر نازناوی تریشدا شتی هەبێت. ئەمە تەنها گومانە و هیچی تر، بەڵام خودی خانا لەناو ئەم دیوانەدا بە ناوی "خانە، خانا، خانەی قوبادی، خانای قوبادی و خانای قوبادی" ناوی خۆی بەکار هێناوە. لەم بەیتەدا ناوی خۆی بەم شێوەیە دەهێنێت:

**وه ڕەنجەڕۆیی و وه نـــامورادی**
**نەیاوا وەکام (خانەی قوبادی)**

لە جێگەیەکی تردا خانا دەڵێت:

**(خانە)یی خزمەت غەزاڵەی نۆدا**
**زنجیرەی زوڵف، سزام وه تـــــــۆدا**

لە هەندێك شیعریشدا خانا ناوی خۆی بە (خانا و خانای قوبادی) دەهێنێت:

**یە (خانا) واتەن بـــە دڵ زەویری**
**هاناشەن جە دەس مـاجەرای پیری**

## هۆزی قوبادی و ناوی قوبادی

هۆزی قوبادی یەکێکە لە هۆزەکانی گەلی کورد و لە کات و سەردەمی خۆیدا جێدەستیان لە مێژووی هۆزایەتی و سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابووری و سەرجەم بوارە جیاجیاکانی تردا هەبووە و ڕۆڵی خۆیان تێدا بینیوە.

ئەم هۆزە ئەگەرچی مێژووی دروستبوونیان زۆر کۆن نییە، بەڵام لەو ماوەیەی دروست بوون، توانیویانە کۆڵەکەیەك بن لە بوارە جیاجیاکانی ژیانی عەشایەری و سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابووری و کشتوکاڵی لە تەواوی ناوچەکانی کوردستان و بە تایبەتی لەو سنوورە جوگرافییەی خۆیاندا جێگیربوون، پەرەی پێ بدەن و ڕۆڵی کاریگەر ببینن. کەم کەمیش پەل بۆ جێگاکانی تر بهاوێژن. بۆ زانینی مێژووی ئەم هۆزە دەکرێ بپرسین کەی و چۆن پەیدا بوون؟ سەر بە چ تیرەیەکن؟ ناوی هۆزەکەش لە چییەوە هاتووە؟

لە چەندین کتێبدا بە زمانی فارسی و کوردی باس لەم هۆزە کراوە. نووسەرانی مێژی قوبادییەکان هەر یەکەو بەپێی ئەو نووسراو و باسانەی کە کەوتوونەتە بەردیدیان، یان چۆن بۆیان گێڕدراوەتەوە، هەر بەو شێوەیە یان بە زیاترەوە، یان بەپێی بیر و بۆچوونی خۆیان قسەیان لەسەر کردووە و ئاوڕیان لێ داونەتەوە.

یەکێك لەو نووسەرانەی باسی قوبادییەکانی کردووە (فخر الکتاب)ە. ئامادەکاری کتێبەکە لە لاپەڕە (٩٨)دا سەبارەت بە قوبادییەکان دەڵێت:

*"ئێستا نزیکەی دووسەد خێزان و هەزار کەسێك دەبن، لە وەچەی کاکە جان ناوێکن کە خۆی بە تۆرەمەی خالیدی کوڕی وەلید دەزانێت و بە دوورەپەرێزی و لەخوداترسی ناوی دەرکردووە و گوایە لە ئەسڵی عەرەبەوە هاتووە. هۆزەکە تۆرەمەی قوباد ناوێکن کە عەسکەری کاکە جانی ناوبراو بووە و بەهۆی ئەوەوە بە*

*قوبادی ناسراون. سەرۆکی هۆزەکە و چەند هـۆزی خێوەتنـشینی تـر لـە ناوچـەی جوانرۆ، ئێستا حەبیب بەگێکە کە پێشتر باسی لێوە کرا..."*.

سەیید تاهیری هاشمیش لەو تۆرەمەیەی کە بۆ یەکێك لە نەوەکانی هۆزی قوبادیی نووسیوە، کاتێك باس لەسەر قوبادییەکان دەکات، دەڵێت:

*"... من لە بەگزادەکانی قوبادیم، لە نەوەکانی ئەمیر خان، بۆیە حەزم کرد ئەم سەرجەلەیە بنووسمەوە. ئەم ماڵە لە کوڕانی سەیید ئەحمەد بەگی گەورەن کە دەبێتە باپیرەگەورەی تەواوی بەگزادەکانی قوبادی و باباجانی. سەیید ئەحمەدبەگی گەورە دەبێتە باپیرەگەورەی تەواوی بەگزادەکانی جافی جوانرۆ کە دەکەنە بەگزادەکانی قوبادی و باباجانی و وەڵەد بەگی. بەناوبانگترین کوڕانی سەیید ئەحمەدبەگی گەورە سێ کوڕن: ڕۆستەم بەگ، دەکاتە باپیری تەواوی بەگزادە و بریکارەکانی جوانرۆ، ئەمیر خان، دەبێتە باپیرەی قوبادی و باباجانی و وەڵەد بەگی، وەڵەد بەگی، دەبێتە باپیری بەگزادەکانی وەڵەد بەگی..."*.

هۆزی قوبادییەکان بەپێی ئەو تۆرەمەیەی پێشەوە کە خستمانە ڕوو. قوباد بەگ کوڕی ئەمیر خانی یەکەمی کوڕی سەیید ئەحمەد بەگی یەکـەمی کـوڕی سـەیید عـەلی کـوڕی ئینـاخە.

ئەمیر خان ئەم کوڕانەی هەبووە: موحەممەد و قوباد بەگی دووەم.

وشەی قوباد لە ناوی قوباد بەگی دووەمی کوڕی ئەمیر خان بەگی یەکەم، کوڕی سەیید ئەحمەد بەگی جافەوە هاتووە.

لە سەیید ئەحمەد بەگی جافەوە چەند هۆزێك جیابوونەتەوە.

١- وەڵەو (وەڵەد) بەگی.

٢- ڕۆستەم بەگی.

٣- مەنووچەهری.

٤- ئەمیری.

٥- شەمێرانی.

٦- خالد ئاغایی.

لە ئەمیرخانییشەوە هۆزی قوبادی جیا دەبێتەوە، لە قوبادییشەوە چەند تیرەیەکی تر دروست بوون.

لە چەندین بەڵگە و تۆرەمە و سەرچاوەی تردا باسیان لە هۆزی قوبادی کردووە. ڕوون و ئاشکرایە قوبادییەکان لە نەوەی ئەمیر خانی یەکەمن.

**بەرهەمەكانى خانا**

خانا يەكێكە لەو شاعيرانەى كە خاوەنى بەرهەمێكى زۆرە. لەبەر ئەوەى كەس خەمخۆر و پارێزەرى بەرهەمەكانى نەبووە، زۆربەى نووسراوەكانى بە پەرشوبڵاوى لەنێو بەياز و كەشكۆڵ و دەستنووسەكانى كتێبخانە تايبەتى و حوكوميیەكانى ناوخۆ و دەرەوەدا ماوەتەوە. هەندێكى پارێزراوە و هەندێكى تريشان فەوتاون.

ئەوەى تاكو ئێستا ڕوون و ئاشكرايە لەسەر بەرهەمەكانى خاناى قوبادى، ئەوەيە كە شاعير خاوەنى چەندين شاكار و ديوانى سەربەخۆى خۆيەتى. ديوانى شاعير هێشتا ديوانێكى ڕێك و پێك و لە هەڵە و كەموكورتى بەدەر نييە.

هۆكارى ئەمەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە كە هۆنراوەكانى خانا تاكو ئێستا لە دەفتەر و كەشكۆڵێكى تايبەتيدا نەنووسراون و نەبينراون. ئەوەشى كە لە بەردەستدايە هەموو بەرهەمەكانى ئەم شاعيرە نييە. هەندێك جار ئەوەشى كە لە بەردەستدايە، بە چەندين نوسخەى جۆراوجۆرەوە نەتوانراوە شيعرێكى بێ كەموكورتى بخاتە بەر دەست.

لەبەر ئەوەى بەشێك لە هۆنراوەكان لەسەر زار بووە و دەماودەم وەرگيراوە، هەڵە و شێواويى ئاواز و بڕگە و كێش و نووسينى تێدا ڕووى داوە. ئەم دەماودەمكردن و دەستبەدەستكردن و لەناوچوونەى هۆنراوەكانى شاعير، واى كردووە شيعرێك يا داستانێك بە يەك نوسخە يا چەندين نوسخە باوەڕ نەكرێت و نەتوانرێت شيعرێكى تا ڕادەيەك دوور لە هەڵە و ناسازيى ئاواز و كێش و سەروا بخرێتە بەر ديدى خوێنەرى شيعرى خانا. هەر بۆيە هەندێ هۆنراوە بە ناتەواوى و لەنگى لەم ديوانەدا بەرچاو دەكەوێت.

واى بۆى دەچم خانا تەنها خاوەنى چەند داستانێك نەبووبێت، خاوەنى چەندين داستان و كورتە چيرۆك و بەرهەمى ناوازە بێت، چونكە خانا سەليقەى داستاننووسى و نامەى شيعريى لە شێوەى داستاننووسيدا زۆر بەهێز بووە. خاوەنى بير و هزرێكى جوان و سەليقەيەكى ناسك بووە. بۆيە لێرەدا باسى هەندێك نوسخە و شيعرم هێنايە ئاراوە، چونكە

لەم ديوانەدا چەند هۆنراوەيەك هەيە لە شێوەی داستان و كورتە چيرۆك و داستانی كـورت. ئەم جۆرەش سەليقەيەكی وردی دەوێت. تێگەيشتن لەم جـۆرە چـيرۆكانە بـەوە دەبێـت كـە خوێنەر خۆی خاوەنی زانياريی زۆر بێت. ناوی ئـەو كەسـانەی دەهێنرێـت دەبـێ پێـشووتر زانياريی لەسەريان هەبووبێت.

سەبارەت بەو بەرهەمانەی خانا كە تاكو ئێستا لە بەردەستدان، بريتين لە ئەمانەی لای خوارەوە:

١- بەشێك لە ديوانی شيعری خانا، لە ئامادەكردن و لێكۆڵينەوەی كاروان عوسمان خەيات (ڕێبين)، چاپی يەكەمی ئەم بەشـە لـە زنجـيرەی بڵاوكراوەكـانی كۆمەڵـەی ڕوونـاكبيری و كۆمەڵايەتيی كەركووك، ساڵی (٢٠١٢) چاپ و بڵاو كراوەتەوە.

٢- خوسرەو و شيرين، ئەم بەرهەمە چەند جارێك چاپ و بـڵاو كراوەتـەوە. يەكـەمين جـار موحەممەدی مەلا عەبدولكـەريمی مـودەڕيس لـە سـاڵی (١٩٧٥)دا بـڵاوی كـردەوە. ئـەم بەرهەمە لە بڵاوكراوەكانی كۆڕی زانياريی كوردە، زنجيرەی ژياندنەوەی كەلەپووری ئـەدەبيی كورد- ژمارە (٢) بووە. ئامادەكار چـەند نوسـخەيەكی بـەراورد كـردووە و پـەراويزی بـۆ نووسيوە. دواتر سديق بۆرەكەيی لەبەر ڕۆشنيايی دوو دەستنووس كە يەكێكيان لـە سـاڵی (١٢٧٨ و ١٣٦١ك.) ئەم بەرهەمەی بەراورد كردووە، چاپی يەكەمی لـە بـەهاری سـاڵی (١٣٦٩ك. هـ.) بڵاو كردۆتەوە.

دوابـەدوای بڵاوبوونـەوەی ئـەم بەرهەمـە، چـەندين دەستنووسـی تـر دەركـەوتوون. ئامادەكاريی ئەم ديوانە، تا ئێستا نزيكەی (٧) دەستنووسی ديوانەكەی دەسـت كـەوتووە. هەر يەكەيان لە سەردەم و كاتی جياوازدا نووسراوە. ئەم دەستنووسانە لە ساڵانی (١٢٩٨، ١٣١٩، ١٣٣٤ك.)دا نووسراون. لە داهاتوودا ئەم بەرهەمەش هەمووی بەراورد دەكـەين و بڵاوی دەكەينەوە.

٣- لەیلا و مەجنوون، ئەم بەرهەمە لە ساڵی (٢٠١١) غەففار ئیبراهی لە بنکەی ژین چاپی کردووە. ئەم بەرهەمە ئەگەرچی بەراوردێکی وردی بۆ کراوە، بەڵام لە هەڵە بەدەر نییە، چونکە ئامادەکار نۆفلڵ و مەجنوونەکەی میرزا شەفیعی کولیاییی بە بەشێك لە لەیلا و مەجنوونەکەی خانا زانیوە و تێکەڵی کردوون. بەمەش خۆی دەدانی پێدا دەنێت بەهۆی ئەوەوە چەند نوسخەیەکی بەراورد کردووە، ژمارەی بەیتەکان زیادیان کردووە. بەندە ئەو دەستنووسانەی لە بەردەستدایە کە ئامادەکار کەڵکی لێ وەرگرتوون، جگە لەوەش چەند نوسخەیەکی نۆفلڵ و مەجنوونی میرزا شەفیعمان لە بەردەستدایە. ئەم دوو بەرهەمە جیاوازن لە یەکتر.

٤- سوڵتان ئیبراهیم و نۆش ئافەرین، ئەم بەرهەمە لە لایەن مامۆستا موحەممەد ڕەشیدی ئەمینیی پاوەییەوە ئامادەی چاپ کراوە، دەزگای ئاراس لە هەولێر ساڵی (٢٠١١) چاپی کردووە. ئامادەکار چەند نوسخەیەکی لە بەردەستدا بووە. یەکێك لە کاتبەکانی ئەو دەستنووسانە لە هەندێك جێگادا ئەگەر توانیبێتی ناوی خانا بگۆڕێت، ئەوا ناوی خۆی لە جێگەی خانادا داناوە، لەو جێگانەشی خانا زۆر بە وردی ناوی خۆیی نووسیوە، نەیتوانیوە بیان گۆڕێت. بەم شێوەیە بۆمان دەردەکەوێت بۆچی خانای قوبادی ئەوەندە نازناوی شیعریی خۆی لە داستان و شیعرەکانیدا دووبارە کردووەتەوە، تا لە فەوتان و دەستکاریکردن بیان پارێزیت.

٥- یووسف و زولەیخا، ئەم بەرهەمە مامۆستا حەکیم مەلا ساڵح لە ساڵی (٢٠٠٦) ئامادەی کردووە، کۆڕی زانیاریی کوردستان بە ژمارە (١٧) لە زنجیرەی کتێبەکانی خۆیدا لە هەولێر چاپی کردووە. ئەو نوسخەیەی ئامادەکار سوودی لێ بینیوە، لەم دواییانەدا بەندە نوسخەیەکی دەستنووسەکەی لە شاری سەقز دەست کەوتووە.

٦- شیرین و فەرهاد، حەکیم مەلا ساڵح دەڵێت کۆپیی نوسخەیەکی ئەم بەرهەمەم لە بەردەستدایە. تاکو ئێستا چاپ نەکراوە.

٧- ئەسکەندەر نامە، ئەم بەرهەمە تا ئێستا نوسخەی بەردەست نەکەوتووە. غەففار ئیبراهیمی ئەوەی پێمان گوت کە نوسخەیەکی نەفیسی ئەم بەرهەمەی لەلای مەلایەك دیوە لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان، هەر چەند هەوڵی داوە کە بە هەرچەند و چۆنێك بێت بەدەستی بهێنێت، بەڵام نەیتوانیوە.

بەشێك لە بەرهەمەکانی خانای قوبادی چاپ و بڵاو کراونەتەوە، هەندێکیان تاکو ئێستا نوسخەیان لە بەردەستدا نییە. دەکرێت بەرهەمەکانی خانا زۆر لەمە زیاتر بن. هەندێك لەمانە ڕوون و ئاشکران و نوسخەیان لە بەردەستدا هەیە و چاپ کراون.

**هەندێك تایبەتمەندیی خانا**

هەموو شاعیرێك لە هۆنراوەکانیدا کۆمەڵێك تایبەتمەندیی خۆی هەیە. لە شیعرەکانی خاناشدا کۆمەڵێك تایبەتمەندی دەبینرێت. لێرەدا هەندێك لەو تایبەتمەندییانەی شاعیر دەخەمە ڕوو.

خانا لەناو هۆنراوە و کورتە چیرۆك و وەرگێڕانەکانیدا، هەندێك تایبەتمەندی و مۆری لە شیعرەکانی داوە تا بە ڕوونی دەرکەون و باشتر بناسرێنەوە. هەندێك جار ئەو تایبەتمەندی و مۆر و پەراوێزانەی خانا وای کردووە ئەگەر لە سەرەتاوە نەزانی ئەم هۆنراوەیە هی خانایە، پاش کەمێك لە خوێندنەوەی هۆنراوەکە یان داستانەکە زۆر بە دیقەتەوە بۆت دەرکەوێت کە شیعرەکە هی کێیە.

هەندێك جاریش لە کۆتایی هۆنراوەکە یا داستانەکەدا بۆت ڕوون دەبێتەوە کە شیعرەکە هی خانای قوبادییە. هەندێك جاریش شاعیر لە سەرەتا و لە کۆتایی داستانەکانیدا چەند جارێك ناوی خۆی و مۆری خۆی لە شیعرەکە داوە، ئەمەش لەبەر پاراستن و نەفەوتانیەتی.

لێرەدا چەند بەڵگەیەك لەسەر تایبەتمەندی و مۆری شیعریی خانا دەخەینە ڕوو. خانا لە هۆنراوەیەکدا دەڵێت:

**وە ڕەنجەڕۆیی و وە نامورادی**
**نەیاوا وە کام خانەی قوبادی**

ئەوەشمان گوت کە خانا هەندێك جار چەند جارێك ناوی خۆی لە شیعرەکانیدا دەهێنێت. لە شیعری پەی سەنەی سالّم دا خانا دوو جار ناوی خۆی دەهێنێت و دەڵێت:

**خانا فکرت کەر، ئەی خەیاڵ خامەن**
**(مَلَكَ الموت) ئامان کارت تەمامەن**
**یە خانا واتەن بە دڵ زەویری**
**هاناشەن جە دەس ماجەرای پیری**

ئەم خاسیێتە لەلای هەندێك شاعیر بەدی دەکرێت، جگە لەوەش ناوهێنانی شاعیر لە کۆتایی شیعردا، ڕێسایەك بووە لە ڕێساکانی شیعری سوکلاسیك. یەکێکی تر لە خاسیێتەکانی شیعری خانا ئەوەیە کە لەناو شیعرەکانیدا هەندێك جار ساڵ و هەندێك جار ئەو لایەنەی ویستوویەتی ناوی بهێنێت بە ڕوونی باسی کردووە.

عەرزەی جەستە و حاڵ ئێمە و ئەسیان
بەرە پەی تۆتاق، بەگزادەی میان
گلەیی و شکات، فرە و ناپیاو
شەرع من و تۆ، مەقسوودی زەهاو
ماجەرای پیریم، سکەی سپیدیم
مەعلووم بی جە لای خانەی ڕەشیدیم

یان لە جێگەیەکی تردا دەڵێت:

شەفیع شیفتە، برای هامفەردم
گۆش دەر وە موفاد خاتیمەی دەردم
حەیفەن پەی تۆ چون زی فەزڵ فەزڵان
حەزین بۆ جە دەس بەعزێ بەدئەسڵان
خانا چون تۆ پیر، تۆ پیر چون خانا
هەر دوو خاك پای پیران دانا

خانا لە هەندێك لە نامەکانیدا کە بۆ میرزا شەفیعی کولیاییی ناردووە، زۆر بە ڕوونی باس لەوە دەکات کە پیری نیشانەیەکی جوانە و دەبێ شانازیی پێوە بکەین:

میرزام جە پیری، میرزام جە پیری
پەی چێش سکاڵات بەرزەن جە پیری

نیسبەت زوڵمەت دای بـــەنـــام پیری
ئـــەعلا موقـامەن، موقـــام پیری
هـــەر چەند کـە پایەی پیری زەحمەتەن
ئـــەمانـــەتبـەخشی مایەی ڕەحمەتەن
بـــــە قـەوڵ بـــەدان، هەرزەی زەمانە
خـــاترت خەمەن، لێت مەدان تـــانە
وەی تەورە ئـــەدووی جـــــە زوڵم پیری
میرزام تۆ زانـا و ساحێب تـــــــەدبیری
ساحێب فـام و فـەزڵ، دانا و هوشیاری
بە عەقڵ و ئـەدەب، جـــە عام دیاری

لەم شیعرەی خانادا ئەوەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە چۆن شانازی بە پیرییـەوە دەکـات و بـە میرزا شەفیعیش دەڵێت: تۆش شانازی بەوەوە بکە، چونکە هەر لە ئادەمەوە هەتا خاتـەم و بە پیاو چاکان و زاڵم و زۆردارەکانیشەوە پیر بوون و بەو قۆناغەدا تێپەڕ بوون. لـەلای خـوا پلە و پایەی ئەم تەمەنە بەرزە.

ئەگەرچی یەکێك لە تایبەتمەندییـەکانی خانـا ئەوەیـە کـە لـە هەنـدێك هۆنراوەیـدا خۆشکاندەوە و بێنەفسی بەدی دەکرێت، بەڵام لە هەندێك جێگایشدا بە جوانییەکانی پشتی ئەو خۆشکاندنەوانە شانازی دەکات بۆ ئەوەی بگاتە مەقامێکی بەرزتر.

هەر من بەندەی تۆم، هەر من بەندەی تۆم
خوا مـــەزانۆ هـــــەر من بـــەندەی تۆم
داغـدار بـــــە داغمای مودام ژەندەی تۆم
غولام قــــــەدیم بـــــــە زەڕ سەندەی تۆم

یان لە جێگەیەکی تردا دەڵێت:

زوننارم بەستەن، زوننارم بەستەن
جە و ساوە پەی تۆ زوننارم بەستەن
شیشەی نام و نەنگ تەقوام شکەستەن
ئەعزام جە بادەی مەیل تۆ مەستەن

ئەم خۆشکاندنەوەیە یەکێکە لە تایبەتمەندییەکانی شیعری خانای قوبادی. لەگەڵ ئەوەشدا لە هەندێك جێگادا خانا خۆی بە گەورە و دەستەڵاتدار دەزانێت و خۆی نیشان دەدات. وەکو لە شیعری "بای شەماڵ ڕێشەن"دا ئەو خۆ بەگەورەزانین و دەستەڵاتدارێتییە دەبینرێت و شانازیی پێوە دەکات:

قوباد و قۆچاغ، قەدیمسالان بیم
بابۆی بەگزادان کەمەرلالان بیم
میرزای خاتوونان، شۆخ شیرین بیم
کاکەی کناچان، زولف عەنبەرین بیم
ساحێب ئۆتاق، ئەقرەبا و پشتم
دەستگیر دەستدار، بەگلەران گشتم
عێل بەگی و ڕەشید، میر جافانم
پەروەردەی سای چین، زولف کلافانم
بەور بالادەس، بان شێرانم
نامیدەی ولات ڕۆم و ئێرانم

ئەم شانازییانە بەشێکیان لە شیعری "پەی سەنەی سالم"یشدا دەبینرێت. لە هەندێك شیعری تری خانادا بە شێوەیەکی تر بەرچاو دەکەون، وەکو لە هۆنراوەی "وەلاڵ نمەبۆ، حەوت

تەرجیع بەند"ەکەیدا. تایبەتمەندییەکانی خانای قوبادی ئەگەرچی هەندێکی زۆر تایبەتن بە خودی ڕێبازی شیعریی خانا و ڕەوتە شیعرییەکەی، هەندێکیشی لە شیعر و ڕەوتی شاعیرانی پێش خانادا باو بوون. دوای خانای قوبادییش ئەم ڕەوتە زیاتر پەرەی سەندووە و زۆر بەدی دەکرێت. لە کۆی بەرهەمەکانیدا تایبەتمەندیی زۆر جوانتریش دەبینرێت. لێرەدا تەنها چەند دانەیەکی کەمان خستۆتە ڕوو.

**مەزهەب و ئەندێشەی خانا**

بە باشم زانی لێرەدا هەندێك قسە لەسەر فیکر و ئەندێشە و ئایین و مەزهەبی خانا بکەم. سەرەتا دەمەوێت هەندێك لە وتە و ڕای نووسەران و ئەدیبان لەسەر مەزهەب و ئایینی خانا لێرەدا بخەمە ڕوو.

توێژەرێکی ئێرانی بە ناوی حەسەن ئەنساریی قومی، توێژینەوەیەکی سەبارەت بە مەزهەبی فیردەوسیی شاعیری فارس کردووە، لەو توێژینەوەیەدا دەڵێت:

*"باشترین ڕێگە بۆ ڕوونکردنەوەی مەزهەبی فیردەوسی، خوێندنەوەیەکی ورد و قووڵە بۆ پێشەکیی شانامە و دووبارە پێداچوونەیەکی مێژوویی دەربارەی فیردەوسی..."*.

هەروەها دەڵێت:

*"لەم نێوەندەدا دەبێ بە وردییەوە تەماشای گێڕانەوەی ئەفسانەیی و گێڕانەوەی مێژوویی جیاواز بکەین..."*.

لە سەر زاری دکتۆر شەفیعی کەدکەنیی هەندێك خاڵی تریش دەهێنێتەوە و لێرەدا باسیان دەکات و دەڵێت:

*(در زمان فردوسی البته هم تشیع زیدی و هم تشیع امامی و هم مذهب اسماعیلی در خراسان و شهرهای مهم آن چون نیشابور حضور و ظهور داشته‌اند. اما بی تردید آنچه مسلم است برای تعلق مذهبی فردوسی به هر یك از این سه مذهب شیعی نیاز به قرائن قوی داریم. از میان این سه مذهب، تشیع امامی البته در عصر فردوسی در خراسان حضور کم رنگتری داشته است و ارتباط عقاید امامیه خراسان با امامیه قم و بغداد در دوران فردوسی تاکنون به درستی مورد مطالعه قرار نگرفته است.*

*درست است كه يكى از احتمالات قوى درباره كسى كه از سوى مخالفان سنى (به معناى عام كلمه سنى كه شامل حنفيان و كراميان و ديگر مذاهب سنى مى‌شود) در آن دوران به "رفض" و "اعتزال" متهم مى‌شود، مى‌تواند مذهب امامى باشد، اما بايد به اين نكته هم توجه داشت كه معلوم نيست كه اتهام زنندگان و بدخواهان فردوسى چه تصوير و معنايى از "رفض" در سر داشته‌اند و نيز از "اعتزال". سنيان گاه در آثارشان حتى سنيان متمايل به اهل بيت و كسانى كه نوعى تشيع را در محبت اهل بيت معتقد بوده‌اند، صرفا براى اتهام زنى رافضى خوانده‌اند. نگاهى به كتاب لسان الميزان ابن حجر عسقلانى مؤيد چنين نظرى است. گاه راويانى متهم به رفض شده‌اند كه در جاى خود رواياتى هم در مناقب مشايخ سنيان روايت مى كرده‌اند ...).*

له كۆتاييدا دەڵێت:

*(از نقطه نظر بحث از "وصى" قابل استناد است، به‌فرض اينكه زيدى بودن او را چنانكه استاد مهدوى ادعا كرده‌اند، منتفى سازد، همچنان اين نكته را از دايره امكان خارج نمى‌كند كه فردوسى اسماعيلى مذهب بوده است، چرا كه تشيع امامى و اسماعيلى در اصل موضوع امامت و وصايت و "وصى" دقيقا همفكر بوده‌اند و اختلافات آنان درباره امامت به مسائلى فراتر از اصل بحث پذيرش "وصى" مربوط بوده است.)*.[٧]

**توێژەرێكى ترى ئێرانى بە ناوى ئەحمەد مەهدەوى دامەغانى، لە بابەتەكەيدا كاتێك باس لە مەزهەبى فيردەوسى دەكات، چەند نموونەيەكى كۆن و باوەڕ پێكراو كە باس لەسەر وشەى (وصى) دەكات، بە بەڵگە دەهێنێتەوە. ئەمەيان كردووەتە بنەمايەك بۆ ئەوەى بيسەلمێنن فيردەوسى شيعە بووە. سەبارەت بەوەى كە فيردەوسى شيعە بووە هيچ كەسێك لەوانەى كە باسى مەزهەبى فيردەوسييان كردووە، ئەوەيان نەسەلماندووە كە فيردەوسى لەسەر**

[٧] نكته‌اى درباره مذهب فردوسى: حسن انصارى قمى، پايگاه اطلاع رسانى حلقه كاتبان.

چ مەزهەبێك بووە و هەر یەکێکیشیان بە مەزهەبێکی لە قەڵەم داوە. لە کۆتاییشدا توێژەر ئەم چەند وتەیە دەخاتە ڕوو:

*(همەی خوانندگان فاضل نام کتاب مشهور شیخ عبدالجلیل رازی رضوان الله علیه (تألیف حدود ٥٦٠) النض، معروف به بعض مثالب النواصب فی نقض بعض فضائح الروافض که یکی از مهمترین و فصیحترین کتب نثر فارسیست شنیده و یا آن را مطالعه فرمودەاند که در آن صدها بار، کلمەی رافضی بر شیعەی اثناعشری اطلاق شده و لاغیر- و نیز همەی شارحان صحیح بخاری در شرح عبارت متن بُخاری که: "فکان ابن سیرین یری انّ عامّه ما یروی عن علی..." میگویند: "مّما یرویه الرّافضیة" و آن روایات همان روایات و احادیثیست که شیعەی امامی پیش از بخاری (٢٥٦) روایت کردەاند زیرا زیدیه که جنابان ابی بکر و عمر را به خلافت و امامت میشناسند چنان روایاتی را نقل نکردەاند. و بنابراین اصرار بر این که مراد از (رافضه) زیدّیه پاشند و حضرت فردوسی قدّسالله روحه القدوّسی زیدی مذهب باشد نوعی مکاره و انکار واضحات است.)*[٨]

ئەمە سەبارەت بە کە ڕافزی و وەسی و شیعەبوونی فیردەوسییە کە ڕای زۆرێك لە زانایانیان لەبارەیەوە هێناوەتەوە. لێرەدا بۆ سوننیبوونی خانا و مەزهەبی خانا پێویستە چەند نموونەیەك بهێنینەوە و بیسەلمێنین. جگە لەوەش بەڵگە لەسەر ئەوە بهێنینەوە کە ئایا خانا تەکفیر کراوە یان نا؟ بەپێی لێکدانەوەکانی هەردوو نووسەری ناوبراوی ئێرانی، ئەو کەسانەی لەناو مەتن و شیعرەکانیاندا ناوی ئیمامی عەلییان زۆر هێنابێت شیعەمەزهەبن. خاناش لەناو شیعرەکانیدا بەم شێوەیە باس لە ئیمامی عەلی دەکات:

[٨] مذهب فردوسی: مهدوی دامغانی، احمد، مجله ایران شناسی، شماره (١٧)ی بهار (١٣٧٢)، (ص ٢٠-٥٣).

چون یەزید وە قەتڵ کەس سەڵا نەویم
هانجەنگ حسێن کەربەلا نەویم
وە تیغ بێڕام، بڕندەی خەتەر
چون ئیبن مولجەم نەکوشتەم حەیدەر

لە جێگەیەکی تردا دەڵێت:

هیچ کامێن بە دەست من نەوی ئەسیر
زانووی حەیدەرم نەپێکا وە تیر

لێرەشدا بەم شێوەیە باس لە ئیمامی عەلی دەکات:

هەم بە موعجیزات حەیدەری کەڕڕار
قەتڵ کونەندەی تایفەی کوففار

لەم بەیتەدا جگە لەوەی ناوی حەیدەر دەهێنێت، ناوی شمشێرەکەیشی دەهێنێت:

کۆن سەدای تەکبیر نەعرەتەی حەیدەر؟
کوانێ زولفەقار بڕندەی دوو سەر

لە بەیتێکی تریشدا بە هەمان شێوە:

ئەسحاب بەو عیززەت، بەو ویقارەوە
عەلی بەو تیغ زولفەقارەوە

بە بۆچوونی هەردوو نووسەری ناوبراوی فارس بێت، دەبێ خانا لە مەزهەبی شیعە بێت، بە تایبەتی مەزهەبی ئیسماعیلییە و ئیمامییە. بەڵام ئەم بۆچوونە ئەگەر بۆ فیردەوسی دروست و ڕاست بێت، ئەوا بۆ خانای قوبادی هەڵە دەبێت. بڕوام وانییە هەر شاعیرێك زۆر باسی ئیمامی عەلیی کردبێت ئیتر ئەو شاعیرە شیعەمەزهەبە. هەرچەندە هەردوو نووسەر چەند بەڵگەیەکیش لەسەر ئەوە دەهێننەوە کە لەناو مەزهەبی زەیدییەدا ئەو دوو ئیمامەکەی تر (ئەبووبەکر و عومەر) یان هەرسێ خەلیفەی یەکەمی ئیسلامیشیان

قەبوولە، بەڵام دیسان، تەنها هێنانی ئەو ناوانە نابێتە بەڵگەی یەکلاکەرەوە. نابێ ئەوەیش لە یاد بکەین، ئایین و مەزهەب ڕاستەوخۆ پەیوەندییان بە دەستەڵاتی سیاسیی ئەوکاتەوە هەیە، هەر دەستەڵاتی سیاسیی ئەو سەردەمە ئایین و مەزهەب بەسەر خەڵکیدا دەسەپێنێت. خانا و دەستەڵاتەکەی جۆرێکی تر ئەو بابەتەمان پێ دەڵێن، هەر لەناو شیعرەکانی خانادا بەم شێوەیە باس لە ئیمامەکانی تر کراوە:

بـــە سەبـــابەی نوور، شەهادەت ئەسەر
موعیجزنمای عــــەین، (وانشق القمر)
بـــە حیلم بوویەکر، حەیای (ذالنّورین)
بـە عەدل عومەر، سەخـای بووسیبتەین
هەم بـــە موعجیزات حەیدەری کەڕڕار
قـــەتڵ کونەندەی تـــــایفەی کوففار

خانا لە جێگەیەکی تردا جگە لەوەی باس لە ئیمامی عەلی و ئیمامی عومەر دەکات و بەدوای یەکدا ناویان دەهێنێت، دواتر باسی خوڵق و بەدکرداری و خراپەکاریی ئەمەوییەکان دەکات. بە گشتی بەم شێوەیە باس لە هەموو هاوەڵانی پەیامبەر دەکات:

ئـەسحاب بەو عیززەت، بەو ویقارەوە
عـــەلی بــــەو تیغ زولفەقـارەوە
بــــەو عیلم و هویـا و ئیفتیخارەوە
عومـــەر بـــەو تەدبیر کەسنەدارەوە
ئەمەوی بـــــەو خوڵق بەدکردارەوە
بــــەو کینەی دێرین بە موختارەوە

لە چەند بەیتێکی تردا خانا باس لە ئال و بەیت دەکات، لەگەڵ ناوی ئال و بەیتدا ناوی هەر چوار یارەکەیش (ئەبوبەکر، عومەر، عوسمان و عەلی) دەهێنێت، هەروەها باس لە کۆی هاوەڵانی پێغەمبەر (د. خ.) دەکات، ناوی ئیمامی حەمزە و عەباسیش دێنێتە ئاراوە. لە کۆتاییشدا دەڵێت: ئەو هەموو پیر و زانا و دانایانەی کە ڕێگەی خودایان گرتبووە بەر لە کوێن؟!

کـــۆن حـــــەسەن، حوسێن ئال پێغەمبەر؟
کـــــۆن چوار یـــــــاران ڕەسوول سەروەر؟
کـۆن تیپ قوشەن ئەسحابـــــان تەمــــــام؟
کـــۆن حـــــەمزە و عەباس، بەوران نێکنام؟
کـــــۆن پیران پیر دانـــــــــــای (ذو الجلال)؟
کـــــۆن سوار غەیب وەیس یەمەن مــــاڵ؟

لە چەند بەیتێکی تریشدا خانای قوبادی زانایان و تێگەیشتووانی عیلمی قورئان و شەریعەت و پیاوچاك و خواناسانی ڕێگای حەق باس دەکات. لەگەڵ ئەوانەشدا ناوی عەبدوڵڵا و عومەر پێکەوە کۆ دەکاتەوە و لە کۆتاییدا دەڵێت: ئەی پەیامبەری ئیسلام لە کوێیە؟

کـــــۆن موسەننیفان عیلم شـــــەریعەت؟
کـــۆن ئەولیائـــــان دەریـــــای حەقیقەت؟
کۆن شان و شەوکەت عەبدوڵڵا و عومەر؟
کۆن تاج لــــەولاك ڕەهنومـــــای ڕەهبەر؟

بەپێی وتەی هەردوو نووسەری فارس (دامەغانی و ئەنساری) دەبێ خانای قوبادی شیعەمەزهەب بوو بێت و لە مەزهەبی ئیمامی، ئیسماعیلییە یا زەیدییە بێت. ئەگەرچی ئەم ڕایە زۆر هەڵەیە، بەڵکو ڕوونتر و دروستر ئەوەیە کە خودی شاعیر، مەزهەب و ئایین و

باوەڕی خۆیی ئاشکرا کردووە. بەوەی زۆر باسی ئیمامی عەلی (خ. ڕ.) کردووە، ئەوە ناگەیەنێت کە شاعیرەکە شیعەمەزهەبە، یان لەبەر ئەوەی باسی ئیمامێکی نەکردووە ئەوە سەر بە مەزهەبێکی ترە. لەناو مەزهەبی سوننەدا جگە لەوەی هەر چوار ئیمامەکە بە یەك چاو تەماشا دەکرێن، بە کۆی گشتی هەموو هاوەڵەکانی پەیامبەر یەك ڕێزیان هەیە و بە یەك چاو تەماشا دەکرێن.

خاڵێکی تر کە پێویستە باسی بکەین، ئەوەیە کە زەروورییاتی شاعیر هۆکاری ئەوەیە کە شاعیر باسی هاوەڵێك زیاتر یان کەمتر بکات، هەروەها جێگا و بەستێنی باس زۆر جار وا پێویست دەکات باسی ئەو کەسە بکرێت، یان باسی وتە و ڕەوشت و ئازایەتی و مەزهەبی بکرێت، باسی لێوە دەکرێت و ناوی زیاتر دەهێنرێت. ئەمەش نیشانەی ئەوە نییە شاعیر سەر بە فلان مەزهەبە. خۆ دەکرێت لە جێگەیەکدا زەروورییاتی فیکری، مەزهەبی، ڕەوشتی، نیشتماندۆستی و کۆمەڵایەتی وا لە شاعیر بکات و بڵێت:

ڕاستەن مەواچـــان فارسی شەککەرەن
کـوردی جە فـــارسی بەڵ شیرینتەرەن
پەی چێش نەدەوران ئی دنیای بەدکێش
مەعلوومـەن هـــەرکەس بە زوان وێش

واتە: ڕاستە دەڵێن زمانی فارسی شیرینە، بەڵام زمانی کوردی بەبێ جیاوازیی مەزهەب و ئایین "سوننی، شیعی، کاکەیی (اهل حەق)، یەزیدی، مەسیحی و..." یان ناوچەگەرێتی و شێوەزار کە لەناو زمانی کوردیدا زۆرە، وەك شێوەزارەکانی "سنە، هەورامان، بابان، موکریان، بادینان و...". خانا بێ دەمارگیری دەڵێت: زمانی کوردیی لە زمانی فارسی شیرینترە، ئەم دەمارگیرییە لێرەدا تەنها بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە ئەو کاتە هێرش کراوەتە سەر زمانی کوردی و کتێبخانەی کوردی، وەك لەناوچوونی کتێبخانەکانی بیری ماوەران،

کتێبخانەکانی پاشای باجەلانەکان، ئەردەلان، بابان و چەندانی تریش. زۆر شاعیری ئەو کاتە هۆنراوەیان بۆ ئەو بارودۆخە داناوە.

دەکرێت ئەوە لە بەرچاو بگرین کە ئەو هەموو مەلا و شاعیر و میر و بەگزادە و نووسەرانەی کۆن، کتێبخانەکانیان چۆن لەناو براون، چییان بەسەر هاتووە، لە کوێن؟ ئەی بۆچی شاعیران لە چەندین دەستنووسدا بەو شێوەیە بەسەر زمانی کوردیدا هەڵدەدەن؟

دەکرێت مەزهەبێکی شیعە کاریگەری و ڕەنگدانەوەی لەسەر شاعیرێك هەبوبێت، چ لە ڕەوشتی ڕۆژانەیدا بێت، یان لە هۆنراوەکانیدا، یان وەکو ئەوەی کە شێخ ڕەزا تووشی دەبێت و بەو بەیتە دێتە جواب کە دەڵێت: "**من سوننیم و ناوم ڕەزایە و سەگی ئیمامی مورتەزام، دەروێشی شێخ عەبدولقادرم و ڕێگەم ڕێگەی خودایە و ڕێگەیەکی ڕاستە...**". ئەو بەیتە ئەم خاڵانە لە خۆ دەگرێت:

١- من سوننیم.

٢- ناوم ڕەزایە، ناوی ڕەزاش لەناو مەزهەبی شیعەدا بەهۆی ئیمامی ڕەزاوە بە پیرۆز تەماشا دەکرێت.

٣- خۆ من سوننیم، بەڵام خۆم بە سەگی ئەو مورتەزایە دەزانم کە شیعە بەلایانەوە پیرۆزە. ئێمە جیاوازی لەو دوو مەزهەبەدا نازانین یان لەناو هاوەڵاندا جیاوازی نابینین.

٤- هەروەها دەروێشی شێخ عەبدولقادری گەیلانیم و ڕێگەی هەمووشمان بێ جیاوازی بۆ لای خوای گەورەیە... هتد.

هەندێك لە نووسەران و ئەدیبان و لێکۆڵەرانیش سەبارەت بە مەزهەب و ڕێگە و فکری خانای قوبادی بەم شێوەیە دوواون: لە کتێبی گوڵزاری کوردستاندا دەڵێت: خانا لە فرووعی دیندا پەیڕەوی ئیمامی شافیعی و لە ئوسووڵیشدا ئەشعەری بووە. سەبارەت بەوەی کە نووسەران و ئەدیبیانی کورد گوتوویانە خانا سوننی مەزهەب بووە و پەیڕەوی ئیمامی شافیعیی کردووە، ئەوە ڕاست بووە. چونکە ئەمە لە شیعر و کارەکانیدا ڕەنگی داوەتەوە.

سەبارەت بەوەی کە خانا ئەشعەری بووە، پێم وایە لە فیکر و ئەندێشەی خانای قوبادیدا هەم ئاماژەی ئەشعەرییبوون هەیە و هەم ئاماژەی پێچەوانەی ئەوە، لە هەندێك شوێندا لایەنی تەسلیمبوونی ڕەها لە بەرانبەر ئیرادەی خودادا بەدی دەکرێت کە ئەمە یەکێکە لە تایبەتمەندێتییەکانی ڕێبازی ئەشعەری، هەروەها گێڕانەوەی هەموو کاروبارەکان -بە چاك و خراپەوە- بۆ ژێر ئیرادەی خودا یەکێکی ترە لە نیشانەکانی ڕێبازی ئەشعەری:

قەســەم وە زاتت گشت کــەردەی ویتــەن
گۆنـای کـەس نییەن بنیـــــادەم شێتەن

خانا لە هۆنراوەکانیدا خۆشکاندنەوە و خۆبچووکردنەوە یەکێك لە ڕەوشتەکانی بووە. وەکو دەڵێت:

مەغروور ئـــــەغوای نـــــەفس ئەمارە
فریفتەی شەیتــــان، شووم بـــــەدچارە
عــــــەرووس دنیــــــای دەنی بیم
نــــە حــــاسەی حەرس حەرام غەنی بیم
مەست (لایعقل)، دوور جـــە ڕای دین بیم
خیلاف ڕای شــــــەرع (حَق الیَقین) بیم

لە جێگەیەکی تردا وەکو کەسێکی زۆر ئیماندار و لەخواترس و عارفێکی تەواو دەڵێت:

بــــــەندەی شەرمەندەی نافەرمان وە وێم
گرفتــــــار دەرد بێدەرمـــــان وە وێم
یــــاران هــــا دەوای دەرد وێم بــــەردم
بــــە ئیخلاس پاك، تۆبەی وێم کــەردم

وەرنـــــــە نـــــافەرمان، نـــائومێدی وێم
ئـــــاخر خـــەجاڵـــــەت، دۆزەخ زێدی وێم

سەبارەت بەوەی کە خانا فیکرەی جەبری یان ئەشعەریی هەبووە، بڕوام وایە خانا جگە لەوەی خانێك بووە، پیاوێکی ئایینی و زانایایەکی سوننە مەزهەبی شافیعی مەزهەبی ئەندێشە و فکر کراوە و تێگەیشتوو بووە لە بوارە جیاجیاکاندا. ئەگەر ئەشعەرییش بوبێت ئەوا خاوەنی فکرێکی کراوە و سەربەخۆ بووە و توانیویەتی لە ڕێگەی دینەکەیەوە زۆر شت بۆ کورد بکات و پەیامێك بگەیەنێت و قازانجی گەورەی بۆ زمانی کوردی لێ بکەوێتەوە.

هەرچەند ئەی حەرفە جە ئەدەب دوورەن
خاریج رای شـــــــەرع ئـــەهل شعوورەن
قەســەم وە زاتت گشت کــەردەی وێتـــەن
گۆنـــای کەس نییەن بنیـــــــادەم شێتەن
چونکــە تـــۆ بەیتەور ساحێب هیمەتی
(شـدید العقاب) والآ شــــــــەوکـــەتی
بە عیشق ڕەسوول ســــــەیید ســــــەروەر
جە زەلزەلەی سەخت هـــایلەی مەحشەر
ڕەبا، بێشـــەریك فریـــــادڕەسیم کـــەر
یـــا ڕەحیم ڕەحمێ وە بێکـــەسیم کــەر
وەرنـــــە بــــــە زاتت جـــــە لای زات تۆ
مــــەکـــەرۆن ڕۆی حەشر، من شکات تۆ

ئەم فکرە کراوەیە لە مەزهەبی سوننەی شافیعی مەزهەبدا و فراوانیی مێشکی خانا، وای کردووە کە بەم شێوەیە بیر بکاتەوە و خوێندنەوە بۆ ئەو ئایەتانەش بکات کە مەلایان و زانایانی ئەو کاتە بە حەزەرەوە دەستیان بۆ بردووە. خانا لەبەر وریایی و دیقەت و تێفکرینی

لە بوارە جیاجیاکاندا، توانیویەتی پەیامێك بگەیەنێت، زانایان و نووسەرانی ئەو کات و ئێستاش بخاتە دۆخێکەوە کە بیر بکەنەوە و تێ بفکرن لەو بابەتە.

دوا سەرنج و ڕام لەسەر مەزهەبی خانای قوبادی ئەوەیە کە خانا پیاوێکی ئایینیی سوننی مەزهەبی شافیعی مەزهەب بووە. ئەندێشە و فکرێکی کراوەی هەبووە، خوێندنەوەی جوانی بۆ قورئان و سوننەت و فەرموودەکانی پەیامبەر هەبووە. بە جوانی لە وتە و ڕەمز و دینەکان تێ گەیشتووە. توانیویەتی وا بکات هەموو لایەك بە لای خۆیدا ڕابکێشیت و فکری هەموو کەسێك بێنێتە جووڵە و وایان لێ بکات کە لە هەموو شتێك بیر بکەنەوە. لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا خانێکی دەستەڵاتدار و خاوەن موڵك و ماڵێکی زۆر بووە.

**ئایا خانا تەکفیر کرا، یان لەبەر کێشەی موڵك و ماڵ بەند کراوە؟**

لەناو ژیانی هەندێك لە شـاعیران و عـاریفانـدا هەنـدێك جـار ڕووداوێـك یـان چـەند ڕووداوێکی خوازراو یان نەخوازراو، ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ بە هەر هۆکارێـك بووبێـت بەهۆی دەستەڵاتی سیاسی یان مەزهەبی، دەبەسترێت بە خودی شاعیرەوە، ئەمەش تەنها لە سەردەمی خانای قوبادیدا ڕووی نەداوە، بەڵکو لەناو ژیانی زۆرێك لە شاعیران و عـاریفاندا ئەم ڕووداوگەلە هەن و گرێ دراون بە ژیان و کەسایەتییانەوە، جا ئیدی بۆ گەورە کردنیـان یان بۆ لەکەدارکردنیان بووبێت، ئـەم کـارە خراوەتـە پاڵیـان. وادەزانم عـاریفـانێکی وەکـو سوهرەوەردی و مەنسووری حەللاج، نموونەیەکی بەرچاوی ئەم ڕاسـتییەن. سـەیر لەوەدایـە زۆرجار هەر ئەم پیاوانە لە پاشدا بە جۆرێك لە جۆرەکان دەبنە سیمبولی ئەدەبیاتی عیرفانی و سۆفیگەری، وەك حەللاج کە سیمبولبوونی بە تەواوەتی لای شـاعیرانی وەکـو مـەحوی و نالی و حافیز و مەولانا بە ئاشکرا دیار و بەرچاوە.

لەناو نووسەران و ئەدیبان و هەندێك لە لێکۆڵەراندا وا باوە کـە گوایـا خانـا لەبـەر هەندێك هۆکاری مەزهەبی و فکری و ئەندێشەیی، یـان لەبـەر وەرگێڕانـی هەنـدێك لـە ئایەتەکانی قورئان بە هۆنراوە، لە دین دەرکراوە. هەندێکی تـریش دەڵـێن: لەبـەر حـەوت تەرجیعبەندەکەی بووە. ئەمانە و چەندین شتی تر هەن لێـرەدا بـە وردی قـسەیان لەسـەر دەکەم و نموونەیان لەسەر دەهێنمەوە.

هەر یەك لە سوڵتانی و سەیید تاهیری هاشمی دەڵێن: خانا بەهۆی ڕاڤەکردنی هەندێك لە ئایەتەکانی قورئان بە هۆنراوە، لـە لایـەن هەنـدێك لـە زانایـانی ئـایینی کوردسـتان (سنە)وە تەکفیر دەکرێت و دەکەوێتە بەر ڕق و تـووڕەیـی خـەڵك و والیـی ئـەو کـات بـە مەبەستی تەمێکردن و گوێچەڕەکردنی بانگهێشتی دەکات، بەڵام خانـا هەڵـدێ و دەڕواتـە وڵاتی بابانەکان و هەر لەوێش دەمرێت. مامۆستا حەکیم مەلا ساڵح[٩] پێی وایە دوای ئەوەی

[٩] ئەم وتانەم لە ڕێکەوتی ٢٧/٢٨-١٠-٢٠١١ بە تەلەفۆن وەرگرتووە.

هەندێك لە ئایەتەکانی قورئانی هێناوەتە ناو دەقی شیعریی خۆیەوە، لێی دڵگران بـوون و بووەتە هۆی ئەوەی مـەلازادەکانی ئـەردەڵان تـەکفیری بکـەن. دوای ئـەوەی گـێراوە لـەلای باجەڵانەکان، شیعری "بای شەماڵ ڕێشەن"ی لە دیلیدا نووسیوە و هۆزەکەشی بە دەنگییەوە چوون و بەریان داوە. پێم وانییە هێنانی ئایەتی قورئان بۆ نێو شیعر، تاوانی ئەوەندە گەورە بێت ببێتە هۆی لە دین دەرکردن. هەر لەسەردەمی پەیامبەرەوە هەتاکو ئێستا ئـەم کـارە کراوە. هەروەها لە پێش خانا و لەو ناوچەیەدا چەندین شاعیر هەبوون زانـای گـەورەی ئـەو دەمە بوون، ئایەتی قورئانییان هێناوە و بە مولەممەع، ئیقتباس، (عقد، تلمیح و ترجمە)یان کردووە و لەگەڵ هۆنراوەکانی خۆیان تێکیان هەڵکێشاوە. خانا ئەگەر لەم کارەیدا تەفسیری کردبێت یان شیکاری و ڕەخنەی کردبێت، پێم وانییە بە شـێوەیەك بێـت، ببێتـە هۆکـاری کوشتنی. سەبارەت بەوانەی دەڵێن: بەهۆی تـەرجیع بەندەکەیـەوە لـە دیـن دەرکـراوە، بـا سەرەتای هەر حەوت تەرجیع بەندەکە بێنین و بزانین خانا چۆن کاری کردووە و چی دەڵێت:

**بەندی یەکەم**

**قـــەدیم موتلـــەق، قـــەدیم موتلـــەق!**
**یـــا قـــایم بـــە زات قـــەدیم موتلـــەق!**
**حـــەیی بێزەواڵ، قـــەییووم بـــەرحەق!**
**نیگارندەی نەقش نـــۆ تـــاق ئـــەزرەق!**

**بەندی دووەم**

**یـــا حەی! کەس چون تۆ پەرێ کەس نییەن**
**کـــەس چون تۆ بە داد موئمین ڕەس نییەن**
**کـــەس چون تۆ کـــەریم کەرەمدار نییەن**
**کەس چون تۆ غەفوور هـــەم غـەففار نییەن**

بەندی سێیەم

یا ڕەب! من بـــەندەی نـــافەرمـــان تۆم
بێپـــەروا جـــە فیعل عیسیان پێشۆم
حـــەییی لاشەریك فـــەرد فـەریادڕەس
کەریم کارساز پـــەی بێکـــەسان کەس

بەندی چوارەم

یـــا حـەی ئەر بەدخووم، ئەر پاکیزەخووم
گونـــای من چێشەن ئـــافەریدەی تووم
شـــەڵڵا ڕۆی ئـــەزەل نـــەرییا وە جەور
نـــەکێشای تەسویر هەستیی من وەی تەور

بەندی پێنجەم

پـــادشـــای شـــاهان، ئیقلیم هـەستی
نـــەققـاش تـــەسویر بڵندی و پەستی
میعمار تـــەرکیب دەوران دڵکـــەش
دەفتەریـــەند نـــەوع هەفت و چار و شەش

بەندی شەشەم

کـــەریم کارســـاز، بـــەخشندەی داوەر!
ڕەونەق بـــەخش سەتح ڕەواق شـــەش دەر!
تۆ ئـــەو قـــادری بـــە دەست قودەرت
بێ ئیمداد غـــەیب بێ تـــەرز و سورەت

بەندی حەوتەم

یـــا قـــایم بـــە زات، قـــەدیم قەییووم!
هەر چەند کـــەچڕەفتـار، هـــەم بێنابرووم!

قــــەســــەم بــــــە زاتت یـــاگەی ئومێدەن
ئـــــەر مەکەیم وە سەنگ ڕاستش هــەر ئێدەن

وەکو دەبینین جگە لە پیاهەڵدان و وەسفکردنی خوای گەورە و خۆ بچووککردنەوە لە بەرانبەر حەزرەتی حەقدا و تاوانباری و بێدەستەڵاتیی بەندە لە ئاست گەورەییی ئەودا، هیچ شتێك نابینیت کە جێگەی ئەوە بێت مەلا، یان کۆلکە مەلایەکیش بێت فەتوای تەکفیر و دەرکردنی خانا لەو سنوورە بدات. لە بەندی پێنجەمیشدا ئەگەر ورد ببینەوە "پادشای شاهان، ئیقلیم هەستی..." ئەم بەیتە کوفر نییە، چونکە خودا خالقی خێر و شەڕیشە، ئەگەرچی مەفهوومی پەستی و بڵندی لێرەدا دوو مەفهوومی وجوودی و عورفییان لەخۆ گرتووە. هەڵبەت نابێ ئەوە لە یاد بکەین کە ئەوان تا ئەندازەیەکی باش شارەزاییان لە عەقیدە و تەسەوری دینییدا هەبووە، بە تەواوی بە فیلتەری چوار مەزهەب و قوتابخانەی ئەشعەریدا تێپەڕیون، هەر بۆیەیش خولقاندی پەستی لێرەدا، لای خانا شێوازێکی دیکەیە لە نەقشی ئیلاهی لە جیهانی بووندا. خانایش وەکو مەولانا پێی وایە کە پەستییش دوو ڕووی هەیە، بە ئەژمارێك شەڕ و پەستی دێتە بەرچاو، بەڵام بە ڕێژەیەکی گشتی و باڵاتر حیکمەتدارە و خێرێکی گشتییە. واتە: لە نزیکەوە شەڕە و لە دووریشەوە کاتێك بە گشتی بۆی دەڕوانیت، خێرە.

هەروەها خانا لە کۆتاییشدا بەم بەیتانەی خوارەوە کۆتایی بە شیعرەکەی دێنێت:

قـــــاهیان دەور، جــــــە قــەهرت ماتەن
وەسف عـــەزیمت بێ حــــــــەد سیفاتەن
عەفووت جـــای ئومێد بێگانە و خوێشەن
لوتفت دڵنەواز گــــــــەدا و دەروێشــــەن

ئـــومێدم ئێدەن، لاشەریك یێبـــــاك
بـــــەشق شـــای ئەورەنگ (وَما أرسَلناك)
جـه عــــەرسەی مەحشەر مەكەر تەریقم
بــــــە جەزبــــــەی تەوفیق بدەر تەوفیقم
سەوگـــەند بــــــە زاتت یەكتای یەگانە
نییەن جــــــە عــــــەرسەی دەور زەمانە
هەر تا كــــە زندەم مـــــەوجوود موتڵەق!
قــــەییوم قــــایم، قـــــەدیم بەرحەق!
زوانم جــــــە زیكر وێت مەكـەر خامۆش
نامت بـا جـــەلام نـــــەبۆ فـــەرامۆش
جیهانئـــــافــەرین بـەخشندەی ئەكبەر!
خانـــــــا بێچــــارەن فریادڕەسیش كەر!
وەرنــــــــە بـــــــە زاتت جـه لای زات تۆ
مەكەرۆن ڕۆی حـــــەشر، مـــن شكات تۆ

خوایە گیان هەر چەندە لە بەردەم تـۆدا بێئــەدەبی دەكـەم و لـە دەرەوەی ڕای شــەرع و ئەهلی شعوورە ئەم كارە دەكەم. من سوێند دەخۆم بە زاتی تۆ ئەی خودای گـەورە كـە تـۆ خاوەنی هەموو كردەوەیەكی باشی لە پێشوودا و هیچ كەموكوڕییەك نییە لە كارەكانتــدا، مرۆڤ شێت و نەزانە، ئەگینا تۆ خاوەنی قودرەت و دەستەڵات و تۆڵەسەندوەی توند بیت لەو كەسانەی دەردەچن لە فەرمانی تۆ و تاوانبارن، خاوەن شەوكەت و شـكۆ و باڵایـت. لەبـەر خۆشەویستیی پێغەمبەری ئیسلام كە موحەممەدە (د. خ.) لە زەلزەلە و ڕۆژی قیامــەت لــە مەیدانی حەشـر و حیـسابدا، ئـەو هـەموو نەهامەتییـە زۆرەی تووشمـان دەبێـت بـەهۆی تاوانەكانمانەوە، تۆ كە ڕەئووف و بێشەریك و تاك و تەنیای ڕزگارمان دەكـەیت. ئـەی ئـەو

کەسەی کە ڕەحمان و ڕەحیم و بێکەسی، فریای ئێمەی بێکەسیش بکەوە، ئەگەر فریامان نەکەوی، ئەوا لە قیامەتدا لەکاتی حەشر و حیسابدا من شکات دەکەم و دەڵێم:

**(وقالوا لجلودهم لِمَ شهدتم علينا قالوا أنطقنا الله الذي أنطق كل شيء وهو خلقكم أول مرةٍ وإليه ترجعون).**

ئەو دێرانەی کۆتایی کە نووسراون و وای لێ تێ گەیشتووین گوایە خانا بە خودا دەڵێت: من شکات لە تۆ دەکەم، ئەوا بەم شێوەیە خانا قسە لەگەڵ خودا دەکات کە ئاماژەم پێ کرد. ئەو دێرەی کە دەڵێت:

**وەرنـــە بـــە زاتت جـــە لای زات تۆ**

**مـەکـــەرۆن ڕۆی حـەشر، من شکات تۆ**

واتە: خوایە گیان! ئەگەر تۆ فریای ئێمەی بێکەس و تاوانبار نەکەویت، ئەوا سوێند بە زاتی تۆ، یان سوێند بە خودا من لەلای زاتی تۆ یان خودی خۆت لە دەستی خۆت شکات دەکەم لە ڕۆژی قیامەتدا و حەق و حیسابی ڕۆژی حەشرم لەلای تۆ دەکەم. لەپای ئەو شکاتەشدا خودای گەورە دەڵێت: ئەی دەم! بنووقێ و ئەی چاو! قسە بکە، ئەی پێ! قسە بکە، دواتر هەموو ئەمانە قسەی خۆیان دەکەن، دەمیش دەکرێتەوە و دەڵێت: (**أنطقنا الله الذي أنطق كل شيء**). ئەگەر بەو بۆچوونەی ئەوانیش لێکی بدەینەوە کە خانا شکات لە خودا دەکات، ئەوا بەڕاستی هەر وەك لە ئایەتەکەدا هاتووە کە خستوومەتە ڕوو، کافرەکان شکات لە خودا دەکەن و دەڵێن: شایەدمان لە خۆمان دەوێت، بەڵام خانا لێرەدا دەڵێت: ئەگەر خراپم و ئەگەر چاکیشم کەواتە: خانا خۆی بە بێتاوان نازانێت و خۆیشی بە چاك نازانێت، دەڵێت من هەرچییەك بم هەر بەندەی خۆتم. هەر وەك ئیمامی عومەر (ڕ. خ.) دەیفەرموو: ئەگەر بڵێن یەك کەس دەڕواتە بەهەشتەوە ئەوا وای بۆ دەچم من بم، ئەگەر بڵێن یەك کەس دەڕواتە دۆزەخەوە، ئەوا گومان دەکەم من بم. یاخود دەڵێت: ئەگەر پێیەکم لە

بەهەشتدا بێت و پێیەکی ترم لە دەرەوە بێت، ئەوا بڕوا ناکەم بچمە بەهەشتەوە. خاناش هەمان قسە و باسی هێناوە و ئاماژە بە هەندێك لە ڕووداوەکانی پێشووی خۆی دەکات و بە بیرە فراوانەکەی خۆی مامەڵەی لەگەڵ وشە و دەقی ئایەتەکاندا کردووە.

لە ڕوویەکی ترەوە ئەو بەیتەی کە دەڵێت: "**وەرنە بە زاتت جە لای زات تۆ/ مەکەرۆن ڕۆی حەشر، من شکات تۆ**" نەك هەر کوفر نییە و بۆنی کوفری لێ نایەت، بەڵکو دووپاتکردنەوەی مەفهوومی موناجات و فەرمایشتێکی بەناوبانگی پێغەمبەر محەممەدە (د.خ.) کە فەرموویەتی: (اللهم أعوذ برضاك من سخطك وبمعافاتك من عقوبتك وأعوذ بك منك لا أحصي ثناء عليك أنت كما أثنيت على نفسك. صحيح مسلم (ج١، ٣٥٢).

کەواتە ئەمانە کوفر نین و گفتوگۆیەکن لەگەڵ خوادا و شیکردنەوە و خەیاڵی فراوان و بیرکراوەیی خانایە بۆ ئەو ڕۆژانەی کە دینار و درهەم کەڵکیان نییە. ئەگەر لەبەر ئەوە خانا تەکفیر بکرێت، ئەو هەموو دەق و ئایەتە قورئانییانە کە خانا داوا لە خودا دەکات لە گوناه و تاوانی خۆش ببێت و ڕەحمی پێ بکات، گوناهباریی خانایە؟ لە بارێکەوە ئەگەر خانا بە کافر و لەدین دەرچوو ئەژمار کرابێت، ئەوا بۆ لەناوبردنی بووە نەك وەکو پیاو چاکێك مامەڵەیان لەگەڵ کردبێت، بەڵام لەناو شیعرەکانی خانا ئەمە بە شێوەیکی تر بەرچاو دەکەوێت. جگە لەوەی کە خانا تەکفیر نەکراوە، بڕوام وایە خانا قورئانی ڕاڤە نەکردووە. ئەوەندە هەیە کە لەناو حەوت تەرجیع بەندەکەیدا خانا فکر و ئەندێشەی خۆی فراوان کردووە و زۆر ورد و درشت بیری کردووەتەوە. جۆرێك لە جەبری و فکرێکی تازەی لەو سەردەمەدا بەکار هێناوە. تا ئێستا دەقی ئەو قورئانەی کە باسی لێوە دەکرێت، یەك لاپەڕەیشی لە بەردەستدا نییە. ئەوەی ڕاستی بێت خانا لەبەر هۆکارێکی دیکە بەند کراوە.

خانا لە هۆنراوەی "بای شەماڵ ڕێشەن"دا هەندێك شتمان بۆ دەستنیشان دەکات کە بەڵگەی ئەوەن خانا نە لەبەر حەوت تەرجیع بەندەکە تەکفیر کراوە و نە لەبەر ڕاڤەی ئایەتەکانی قورئان دەرکراوە و نە قورئانیشی تەفسیر کردووە. ئەم شیعرەی خانا دوو بەشە،

بەشی سەرەتای باسی پلە و پایە و دەستەڵات و موڵکداریی خانایە. بەشی دووەمیشی باسی ئەو دیلی و ناهەقی و تاوانانەی باجەڵانەکانە لە بەرانبەر خانادا.
خانا لەو شیعرەی ناوبراودا دەڵێت:

ساحێبی ئۆتـــاق ئـــەقرەبـــا و پشتم
دەستگیر دەسدار، بەگلـــــــەران گشتم
عێل بـــــەگی و ڕەشید میر جـــــافـانم
پـــەروەردەی ســـــای چین زوڵف کلاّفانم
بـــــەور بـــــالاّدەس بـــان شـــێرانم
نــــــــامیـــــدەی وڵات ڕۆم و ئێرانم
قۆچ ســـەرنـــــەپێچ وایەی هـــــایهاتم
شێر ســـــــەفشکێن، کـــۆی زۆر و زاتم
قوباد قـــۆچاغ کـــــۆی نــــەوسوارم
تـــــەرح جــەبلەکێش باغچە و حەسارم
ســـوڵتان هـــــارون میر ســـــەریاسم
ساحێب نـــــــاواك تیغ ئـــــەڵماسم
میر ســـــەرحـــــەدگیر لای خـان ئـاشورم
لە تەعنەی بـەدان یـــانەخـــــاپوورم

لەم شیعرەدا بۆمان ڕوون دەبێتەوە کە خانـای قوبـادی خـۆی بـە سـەرخێڵی هۆزەکـەی دەزانێت. هەروەها خۆی بە مرۆیەکی ڕەشید و مـیری جافـان دەزانێـت، دیـسانەوە دەڵێـت: پەروەردەی دەستی زوڵفی یارانم و خۆی بە (بەور = پڵنگ)ی بالاّدەست دادەنێت.

ئەوەی جێگەی سەرنجە لەم شیعرەدا خانا لە زۆر لایەنی ژیانی خۆی دوواوە و بەشێك لە ژیانی خۆیمان بۆمان ڕوون دەکاتەوە. یەکێکی دی لە لایەنەکانی ژیانی خانا ئەوەیە کە خۆی بە هاوخەمی هۆز و ناوچەکەی دەزانێت و پێشڕەوی ئەو نەهامەتی و کارەساتانەیە کە ڕووبەڕووی هۆز و خەڵکی ناوچەکەی ژێر دەستەڵاتی دەبێتەوە. لە دێڕێکی دیدا خانا خۆی بە پێشەنگی سوارانی تیرەی قوبادی دەزانێت و خۆی بە بچووك نیشان دەدات و بۆ هاوکاری کردنی کەمدەستەڵات و ئەوانەی خەریکی باخ و باخاتن، هاوکاریان دەبێت و خۆی بە کرێکاریان دادەنێت، ئامادەیە بۆ تێکەڵاوی و خزمەتکردنیان. ئەوەیشمان بۆ ڕوون دەبێتەوە کە خانا لەلای باجەڵانەکان دیل بووە، باجەڵانەکان بە خراپی لەگەڵیدا جووڵاونەتەوە. هەر بۆیە دەڵێت:

ئیستا ڕووگەردان قەسری مورادم
ئەبلەی مایە پووچ خزمەت وە بادم

کاتێك خانا لای باجەڵانەکانی ناوچەی زەهاودا بەدیل گیراوە، هاوار بۆ جافەکان دەبات و بە بای شەماڵدا ئەم نامەیە دەنێرێ بۆ تیرە و هۆزەکەی. ئەمە سەلمێنەری ئەو ڕاستیانەیە کە لە بارەی خاناوە گوتمانە و ئەوانەش ڕەت دەکاتەوە کە دەڵێن خانا لە هۆزی باجەڵانە و لەلای ئەردەڵانەکان هەڵهاتووە و چووەتە لای بابانەکان و هەر لەوێش کۆچی دوایی کردووە.

مێر سەرحەدگیر لای خان ئاشوورم
لە تەعنەی بەدان یانە خاپوورم
ئیستا من دەستاخ کۆتەڵ پاونام
بێ جەد خاین باجەڵانام
بە ڕۆژ بێ خورد، بە شەو بێ خاوم
دیل بیتاوان، پاشای زەهاوم

لێرەشدا ئەوەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە کە خانا تەکفیر نەکراوە. ئاشکرایشە خانا لەلای باجەڵانەکان لە ناوچەی زەهاو گیراوە و حاڵ و گوزەرانی خراپ بووە. ئەمەش بێ هۆ و هۆکار نەبووە. مەسەلەکەش مەسەلەیەکی موڵکداری بووە. بەڵگەش بۆ ئەم قسانەمان ئەوەیە کە فەخرولکوتتاب لە باسی باوەجانی و قوبادییەکان دا دەڵێت:

*"زۆربەی مەزرا و لەوەڕگەی هاوین و زستانیان بریتییە لە ئاواییگەلی بلەبزان، گەڵاڵ، کلاش، نەورۆڵ و سەریاس کە گوندی ناوچەی جوانرۆن و پاشان بەپێی چەرخی زەمانە هەڵهاتوون و زستانیان لە گەرمێنی زەهاو و هاوینیان لە کوێستانەکانی کوردستانی ئێران بردۆتە سەر، تا ئەوەی نزیك دوازە ساڵ لەمەوپێش، هاتنی ئێرانیان لێ یاساخ کراوە..."*.

لە جێگەیەکی تریشدا دەڵێت:

*"لەوەرگە و مەزاری ئەم هۆزە لە بەهار و هاوین، مەزرای باران و نەهرابی جوانرۆیە و پاییز و زستانیش بۆ لەوەڕاندنی ماڵات دەچنە پشت شاخی شێخان و خاکی زەهاو..."*.

لەناو بەڵگەنامەکانیشدا ئەوە هاتووە کە ئەمیر خان و موحەممەد ئەمیر خان و ڕۆستەم بەگ بەشێك لەو زەوی و زارانەیان کڕیوە و کڕین و فرۆشتنیان پێوە کراوە. لەگەڵ چەند کەسێکی کرماشانیدا کڕین و فرۆشتنی زەوی و زار کراوە. ئەو ناوچانەی کە باسی لێوە دەکرێت لەناو کتێب و بەڵگەنامە و نووسراو و شیعرەکاندا هەموویان زۆر لە یەکەوە نزیکن. خێڵاتەکانی کۆنیش هاوینانیان لە جێگەیەك بردۆتە سەر و زستانیش لە جێگەیەکی تردا. هەر ئەم هاتوچۆ و ئاڵوگۆڕە لە ناوچەیەکەوە بۆ ناوچەیەکی تر لە ژێر دەستەڵاتی میرنشینێکی تردا، وای کردووە کێشە و ناکۆکی دروست ببێت. خاناش سەبارەت بەو کێشە و ناکۆکیانە دەڵێت:

ئەی باد شەمـــاڵ یـــە جەستە و حاڵە
یە گـۆنای پەڕگەرد، زەردەی جـەماڵە
یە لاشەی زەبــــوون بێنازکەفتەی من
جـە ناڵەی کۆسار شەونەخەفتەی من
یە جـــامەی جیـــا دوور نـە کافوورە
یـە گلکۆی مــــەزار گـەدادەستوورە
یە کەلوەلای زام زوڵــــم ســــالاتــە
یـــە عەیش، واوەیلای میرە مـــالاتە؟

لەم چەند بەیتەدا خانای قوبادی ڕووداوەکەمان بۆ دەگێڕێتەوە. خانا زۆر بـە ڕاشـکاوانە دەڵێت: ئەمە جەستە و حاڵی منــە، تەماشــای گۆنــای پڕگـەردی مــن بکـەن چـۆن زەرد هەڵگەڕاوە. وەرن سەیری لاشەی زەبوونم بکەن چۆن بێناز کەوتووە. وەرن تەماشای ناڵەی من لە کۆساردا بکەن و بزانن من خەوتووم؟ خانا بەردەوام دەبێت و دێتــەوە بـۆ لای کەربـەلای خوێناوی، ئەو کەربەلایەی کە خوێنی ئیمامی حوسێنی کوڕی ئیمامی عەلیی تێـدا ڕژاوە.
ئەم نیوەباڵە سێ مەبەستی خانا ڕوون دەکاتەوە و مانای تایبەتی هەیە:

**یەکەم:** ئەو بەندیخانەیەی باجەلانەکان کە خانای تێدابووە، بە کەربەلا چووێندراوە و زوڵم و ستەمێکی زۆریان لەو جێگەیەدا لە خانا و دۆستانی کردووە.

**دووەم:** کەلوەلا: بە مانای لەتلەتبوون و زامدارکردنی جەستە و ڕۆحی خانا و هــەوالانی دێت لە لایەن حاکمانی باجەلانەوە. خانا دەڵێت: وەرن سەیری زامی دڵــی مــن بکـەن لـەم سالانەدا، ئەمەیش عەیش و شین و واوەیلای میری مالانە. خانا خۆی بـە نـازدارانی شـاری کەربەلا چواندووە کە مەبەست لە ئیمامی حوسێنی کوڕی عــەلیی کـوڕی ئـەبو تالـب و شوێنکەوتوانیەتی. خانای قوبادی دەڵێت: سەیری لاشەی ئەم نازدارە بکەن، بزانن چۆن وەکو

ئەو نازەنینە بێ ناز و لاواز و بێ ئاو و خۆراك لە دیلیدا کەوتووە. لەبەر ئەو هەموو ئازار و مەینەتییە لاشەم لەڕ و لاواز و زامدار بووە.

**سێیەم:** واتە ئەمە زام و ئازار و کێشەیەکی کۆنە و تازەی دەکەنەوە. ئەم گرفت و موشکیلەیە هی میرەکانە لە کۆنەوە دروستیان کردووە، نەك من.

بەپێی ئەم چەند بەیتە لەناو کێشە و گیروگرفتەکاندا کە کەوتۆتە نێوان خانای قوبادی و باجەڵانەکانەوە، بەپێی ئەو چەند بەیتەی سەرەوەش، دوودڵ نیم لەوەی کێشەی گەورە لەنێوانیاندا ڕووی داوە و دواتر خانایش بەهۆی ئەو کێشانەوە بەند کراوە:

**عەرزەی جەستە و حاڵ ئێمە و ئەسیران**
**بەرە پەی ئۆتاق بەگزادەی میران**
**گلەیی و شکات فرە و ناپیاو**
**شەرع من و تۆ مەقسوودی زەهاو**

دوا سەرنجی من لەسەر ئەم بابەتە ئەوەیە: زۆر ڕوونە خانا تەکفیر نەکراوە و ڕای نەکردووە. تەنها کێشەیەك هەبوویێت لەسەر کێشەی موڵکداری بووە. قوبادییەکان بۆ لەوەڕاندنی مەڕوماڵاتیان لە جوانڕۆوە ڕوویان کردووەتە لای زەهاو و ناوچەکانی ژێر دەستەڵاتی باجەڵانەکان و ئەم کێشەیە ڕووی داوە.

کێشەکەیش لەسەر باج و موڵك و ماڵات و موڵکداری بووە. گیروگرفتێکی کۆن بووە، لە سەردەمی خانادا ئەم کێشەیە گەورەتر بووەتەوە و خانا لەو نێوەندەدا پێوە بووە و گیراوە.

**خانا و جوگرافیای دەستەڵاتی**

خانا لە جوگرافیایەکدا ژیاوە جیاواز بووە لەو جوگرافیایەی کە (نیزامی، جامی، فیردەوسی، خاقانی و سائیب)ی تێدا ژیاون. خانای قوبادی لەو پارچە هۆنراوەیەی کە لەلای باجەڵانەکان دیل بووە و نوسیوویەتی. ئاماژە بەو جوگرافیاییە دەکات کە دەستەڵاتی بەسەریاندا هەبووە.

میرزای خـــاتوونـــــان، شۆخ شیرین بیم
کاکەی کناچـــــان زوڵف عەنبەرین بیم
ساحێب ئۆتـــــاق ئـــەقرەبـــا و پشتم
دەستگیر دەستدار بـــــەگلـــەران گشتم

سەرەتا میرزایەکی جوان و شۆخ و شەنگ بووە و کەسێکی گەورە و خۆشبۆ و ڕەنگین بووە. خاوەنی خزم و کەسوکارێکی زۆرە. دواتر دەڵێت:

عێل بـــــەگی و ڕەشید، میر جـافـــانم
پـــــەروەردەی سـای چین، زوڵف کلافانم
بـــــەور بـــالادەس، بـــــــــان شێرانم
نـــــــــــــــامیدەی وڵات ڕۆم و ئێرانم

خانا میری جافەکان بووە، هەر وەکو چۆن لە چەند بەڵگە و داستانێکیشدا دەڵێت: من خانی قوبادییەکان بووم. خانا سەردەمانێك قازی و میر بووە، دواتریش خانێکی بەدەستەڵات بووە. تەنها لەناو خێڵ و خزم و کەسوکارەکەی خۆیدا ناوبانگی نەبووە. بەپێی ئەم هۆنراوەیە خانا کەسایەتییەکی زۆر زیرەك و وریا و بەناوبانگی ناو وڵاتی ئێران و ڕۆمەکان بووە.

قۆچ سەر نـــەپێچ، وایـــــــەی هەیهاتم
شێر ســـەفشکێن، کــــۆی زۆر و زاتم

**دارای دەمـــــاغبەرز کـەرەم کـــولاّوم**
**ئوستادان جـــە تەرح، جـــۆی سێلاّتاوم**

هەروەها پیاوێکی خاوەن هۆش و فیکر و بیرێکی بەرز بووە. مامۆستایەکی قسەڕۆیشتوو بووە و خاوەنی بڕیاری خۆی بووە. لە هەموو کات و ساتێکیشدا خاوەن بەڵێنی خۆی بووە.

**تـــەکیەی ڕاهداران شـــای سەماواتم**
**دەفتەردار موڵك ســــــەرجۆی کاواتم**
**بـــــاش بـــالاّدەس پـــەهلەوانانم**
**قەڵغان لای شـــان نــــەوجەوانــانم**

لەم چەند بەیتەدا جگە لەوەی خانا بـاس لـە دەسـتەڵات و سـەروەت و سـامانی خـۆی دەکات، لە هەمان کاتیشدا باس لەو ناوچە جوگرافییە دەکات کە لەژێر دەستەڵاتیدا بووە. لە درێژەی ئەم شیعرەدا ئەمە زیاتر ڕوون دەبێتەوە.

بەپێی لێکۆڵینەوەی مێژوونووسانی جوانڕۆیی هیچ کـات باجەلاّنـەکان نـەیان توانیـوە دەست بەسەر جوانڕۆدا بگرن، ئەوەی کە خانا دەیڵێ: "دەفتەردار موڵك سـەرجۆی کـاواتم" باشترین بەڵگەیە بۆ نیشاندانی جوانڕۆییبوونی خانا. چونکە سـەرجۆی کـاوات، نـزیکترین کانیاوی سەر بە شاری جوانڕۆیە و ئاوی زۆربەی دانیشتوانی ئەو شارە لە کۆن و ئێـستاشدا لە کاوات دابین دەکات، دیسان لە دێرێکی تردا دەڵێت:

**بەهار پـــای ئێلاخ جـــە کوردەماڵ بیم**
**جە پـــــای سەراوان چەشمەی زولاڵ بیم**

هەروەها لە جێگەیەکی تردا دەڵێت:

**سوڵتان هـــــاروون، میر سەریـــاسم**
**ســـاحێب نــــــاواك، تیغ ئەڵماسم**

میر سەرحەدگیر لای خـــان ئـــاشوورم
لە تەعنەی بەدان یــــانـــە خاپوورم

لەم چەند بەیتەدا خانا تەواوی ئەو سنووورە جوگرافییی و ناوچانەی لەژێر دەستیدا بووە ئاماژەی پێ دەکات. هەموو ئەو ناوچانەش کە خانا ئاماژەی پێ دەکات لە شاری جوانڕۆوە نزیکترن تا لە ناوچەی ژێر دەستەڵاتی باجەڵانەکانەوە. ناوچانەکەش لە ژێر دەستەڵاتی جافەکانی ناوچەی جوانڕۆدا بووە.

سەریاس دێیەکە لە ناوچەی شێوەسەر و نزیکە لە ناوچەی باینگانی (پاینگان) و شاری پاوە و نزیکیشە لە جوانڕۆوە، هەروەها نزیکە لە پارێزگای کوردستان (سنە) لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان. سەریاس لە سەردەمی خانادا ناوچەیەکی کوێستانی بووە، دەکەوێتە نێوان پاینگان و پاوە و جوانڕۆ. لەپاش شۆڕشی ئیسلامیی ئێران، کرا بە ئۆردووگا. خەڵکی ئەم ناوچەیە زیاتر ئێناخین. خان ئاشووریش ناوچەیەکە لە سولاسی باوەجانی، نزیك بە شاری سەرپێڵ زەهاوە. وەکو گوتمان سەرجۆی (کاوەت)، نزیکترین کانیاوی سەر بە شاری جوانڕۆیە و ئاوی زۆربەی دانیشتوانی ئەو ناوچەیەی دابین کردووە. ئەمەش ئەوە دەردەخات کە ئەو ناچەیەی خانا تێیدا نیشتەجێ بووە و دەستەڵاتی بەسەریاندا هەبووە، ناوچەیەکی سەوزایی و خاوەن بەروبوومی و کشتوکاڵی و لەوەڕگایەکی باش بووە بۆ خێڵەکەی.

تـــەکیەی ڕاهداران شـــای سەماواتم
دەفتەردار موڵك ســـەرجۆی کاواتم

ئەمەش زیاتر لەوە نزیکمان دەکاتەوە و پتەوترمان دەکاتەوە کە خانای قوبادی باجەڵان نەبووە. ناوچە و دەستەڵات و جوگرافیای دەستەڵاتی خاناش خاڵێکی گرنگ و بایەخدارە بۆ ژیان و گوزەرانی خانا.

ناوچەکانی ژێر دەستەڵاتی، جوگرافیایەکی پڕ لە سەوزایی و لەوەڕگایەکی باش بووە بۆ خێڵەکەی. خانا دەستەڵاتی جوگرافیی لە سەریاسەوە دەستی پێ کردووە تاکو سنووری خان ئاشوور و سەرجۆی کاوات.

پێشووتر ناوچەکانی ناراو و ڕووبارەکانی ئەو ناوچەیەی لای جوانرۆ کڕین و فرۆشتنی پێوە کراوە. هەروەها سنووری سەرتەنگی ئەژدیها، بەنیگەز، باهووی کیکەن، سنووری بەنیقەمەر، سنووری باهووری تەنگی قەجە، سنووری بەنیگەز و سنووری ڕێگەی گشتیی ناراو تا سەرتەنگی ئەژدیها کڕدراون و لەژێر دەستەڵاتی قوبادییەکاندا بوون.

ئەم جوگرافیایەش ئاشکرایە موڵکی ڕاستەقینەی هۆزی قوبادییەکان بووە، هەتا ئێستاش بە موڵکی ئەو هۆزە دەژمێردرێت و لەژێر دەستەڵاتی ئەواندایە.

ئەم جوگرافیایە و گەرمیان و کوێستان (ئێلاخ و قشلاخ)ەیش وای خولقاندووە کە کێشە و گێروگرفت و ناخۆشی بخاتە نێوان هۆزی باجەلان و خانای قوبادییەوە. ئەم ناخۆشی و کێشەیە تەنها بۆ ئەم دوو هۆزە پێش نەهاتووە، بۆ سەدان خێڵ و هۆز و خانەوادە و بنەماڵە پێش هاتووە. چەندین خێڵ و هۆز لەو نێوەندەدا لە جێگە و شوێنی خۆیان هەڵکەندراون و دوور خراونەتەوە بۆ جێگایەکی زۆر دوور، دراونەتە دەست دەستەڵاتێکی تر، یان ئەوەتا لەناوچوون، یان لە ناوبراون. ئەم کارە لە مێژووی خێڵایەتی و عەشایەریی کوردییدا نامۆ نییە. چەندین بەڵگە لەسەر ئەم کێشە و گێروگرفت و ناخۆشییانە لە نێوان خێڵەکان و دەستەڵاتی فارس و تورکدا هەیە. هەر سەبارەت بە هۆزی قوبادییەکان لە بەڵگەیەکی تریشدا کە لەلای قوبادییەکان پارێزراوە و بەندە لە کاك جەمالی کوڕی کاك ساڵحی قوبادیم وەرگرتووە، تێیدا ئەوە هاتووە کە لە دیوی کوردستانی عێراقەوە، دەستەڵاتدارانی عێراقی ئەوکاتەی عێراق گێروگرفتیان بۆ قوبادییەکان دروست کردووە و نەیان هێشتووە مەڕوماڵاتیان هاتوچۆ پێ بکەن.

## خانا و مێژوو

خانا لەناو مێژووی ئەدەبیاتی کوردیدا جێدەستی دیارە. جێگای شانازیی کورد بووە و کوردیش شانازیی پێوە دەکات. پەیامی خانا لە مێژوودا زۆر ڕوون و ئاشکرا بووە. لە وەرگێڕانی داستانەکاندا، بە تایبەت داستانی یووسف و زولەیخا پەیامێکی ئایینیی عاشقانەی هەیە. جگە لەوەیش، لە مێژوودا خاڵی وەرگێڕان و دەستپاکی و لایەنەکانی وەرگێڕان و جۆری داستاننووسیمان بۆ دەخاتە ڕوو.

سەرچاوەیەکی تری زانیاری لەسەر بیر و جیهانبینیی خانا بەرهەمە ئەدەبییەکانی خۆیەتی، لەناو ئەو بەرهەمانەدا زانیاریی ورد و ئاماژەی پەرشوبڵاو و ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆی زۆری تێدایە کە دەبێت کۆ بکرێنەوە. خانا کاتێك شاکارەکانی نیزامیی وەرگێڕاوە، لە زۆر جێگەدا پەراوێزێکی بۆ خۆی بەجێ هێشتووە و بە مافی تایبەتی خۆی زانیوە لە هەگبە و زانیاریی ڕۆژگاری ئەو کاتەی خۆیەوە چەند بەیتێك بهۆنێتەوە و لەگەڵ شیعرەکانی شاعیری گەورەی گەنجەدا تێکهەڵکێشی بکات. لە داستانی سوڵتان ئیبراهیم و نۆش ئافەرینیشدا (لا ١٤٨) لایەنێکی مێژوویمان بۆ دەستنیشان دەکات و دەڵێت:

**گۆش دەن بە داستان خانای خـــان قوباد**
**وەی دنیای بێ پۆ، هەرگیز نـــــەبۆن شاد**
**مونشیی دیوان دەفتەرخانـــــەی عـــەشق**
**هیجران کێش دەور، شێخ سەنعان مەشق**

خانا لەم شیعرەدا باس لەوە دەکات کە ماوەیەك خانی قوبادییەکان بووە. ئەمەش لە مێژوودا جێگەی باسە و گرنگی و تایبەتمەندیی کاریگەری خۆی هەیە. یان لە جێگەیەکی تردا دەڵێت:

**خانـــــای قوبـــــــادی دەروون پڕ نـــــەدەرد**
**سەرلـــەوحەی ئـــــەلواح، جەدوەلکاری کەرد**

بــــــە حــەرف ڕاوی، دانـــــایـــــان پێش
بـــەی دەستوور کەردەن تای ڕشتە تا کێش
خــــامەی عەترئامێز، نوکتەی ڕەقەمساز
بـــــــەی دەستوور بییەن ئەی ڕاز و ئاواز"[١٠]

ئەگەر تەماشای ئەم بەیتەیش بکەین، کوتومت وەکو گێڕانەوەکەی فیردەوسییە و بۆ مێژوو تۆماری کردووە. خانای قوبادی پێمان دەڵێت ئەم داستانانەی چۆن وەرگرتوون و بە چ شێوەیەك دەیان گێڕێتەوە. فیردەوسیش بەشێك لە شانامەکەی لە بەرهەم و نووسراوەکانی "دەقیقی، خودای نامە، نامە پەهلەوییەکان و ڕاوییەکان" وەرگرتووە، پاشان بە شێوەیەکی ڕێکوپێك دایانی ڕشتووەتەوە. خانا خاڵێکی ترمان بۆ دەستنیشان دەکات و دەڵێت:

خـــــانــــــای خـــۆش نوویس باش حەکاکان
تــــەعریفکونـــــەندەی داستان بـــە داستان
بشین بــــــە ســـــــەروەخت کار شـــــازادە
چون بـــــە جا گـــوزاشت ئـــەو زەوق و بادە"[١١]

لەم دوو بەیتەشدا خانای قوبادی جگە لەوەی باسی خۆشنووسیی خۆیمان بۆ دەکات و دەری دەخات کە کەسێکی خۆشنووس بووە. لە هەمان کاتیشدا ئەوەمان پێ دەڵێت کە ئەو داستانانەی وەری گرتوون یا بۆیان هێناوە و بیستوونی، زۆر بە جوانی و ڕێکوپێکی و داستان بە داستان نووسیویەتییەوە. فیردەوسیش دەڵێ:

یکی نــــامە بود از گـــە باستان
فـــراوان بـــدو اندرون داستـــــان

[١٠] سوڵتان ئیبراهیم و نوش ئافەرین، لا (١٨٩).
[١١] هەمان سەرچاوەی پێشوو، لا (٣١٤).

پراگـــــنده در دست هـــر مـــوبدی
از او بهره‌ای نـــــــزد هـــر بخردی
یکی پهلوی بـــــود دهقـــان نژاد
دلـــیر و بزرگ و خـــردمند و راد
پـــــژوهنـــده‌ی روزگـــــار نخست
گـذشتـه سخن‌ها همه بـــــازجُست
ز هر کشوری موبدی ســــــالخورد
بیاورد و این نـــــامه را گرد کرد

فیردەوسی بەشێك لە شانامەکەی لەو نامە و شانامانەی پێشووترەوە وەرگرتووە، وەکو داستانەکانی دەقیقی و ئەبومەنسوور و نامە پەهلەوییەکان کە لەلای خەڵکی و مووبەدەکانی زەردەشتی بوون. دوای گردوکۆمەکردنیان، هەموویانی بەراورد کردوون. فیردەوسی هەرچی داستانێك لە شانامەکەی خۆیدا نەهاتووە، لەوێدا نووسیونی. خانایش لەم داستانەدا هەمان کاری فیردەوسیی ئەنجام داوە. دواتر هەموو داستانەکانی بە شێوەیەك کۆکردۆتەوە و ڕێکی خستوون، هەروەها بەسەر بەشەکانی خۆیاندا دابەشی کردوون. تاکو ئەو داستانە بەنرخەی لێ پێك هێناوە. خانا جارێکی تر و لە شوێنێکی تریشدا دەڵێت:

خانـــــا ئەی دونیا چەرخ نـــــەیرەنگەن
گا مایل بە نۆش، گاهێ بـــە جەنگەن
بـــە حـــەرف ڕاوی سوخەنگۆی وەرین
بشین بـــــە سەرکار خورشید شیرین..[١٢]

ئەم دووپاتکردنەوەیە دوو خاڵمان بۆ دەخاتە ڕوو:

[١٢] هەمان سەرچاوە، لا (٣١٨).

**یەکەمیان:** خانا یان ئەوەتا ئەم داستانەی وەرگێڕاوە، یان خۆی داستانەکانی لە زاری ڕاوییەکانەوە وەرگرتووە. دواتر داستان بە داستان نووسیونییەوە. وای بۆ دەچم خۆی هەموو داستانەکانی وەرگرتوون، دواتر بە شێوەیەکی ڕێکوپێك و دروست نووسیونیەتییەوە. ئەم دوو خاڵە لە مێژوودا جێگەی قسە و باسن، جێگەی لێکۆڵینەوە و وردبوونەوەن. لەو نامانەشیدا کە بۆ میرزا شەفیعی ناردوون، تەنها لە یەکێك لەو نامانەدا ساڵی (١١٥٢) بەر چاو دەکەوێت، بەڵام بە بۆچوونی من ئەوە ڕوونە کە ئەو چەند پارچە شیعرەی باسی پیری دەکات لەو کات و ساتانەدا نووسراون. تا لەو جێگایانەدا کە باسی پیریی هەندێك لە کەسایەتییە سیاسیی و مێژووییەکان دەکات و دەڵێت:

**هۆلاکۆ و جـــەنگیز وە تەیموورەوە**
**بـــەو کەللەی منار زوڵم و زۆرەوە**
**ئیەج وە سوپـــــای سەلم و توورەوە**
**نـــــادر شا بەو تاج کۆهی نوورەوە**
**خـــــــاقانی چینی وە فەعفوورەوە**
**کەریم خان بەو عەدڵ بێقسوورەوە**

خانای قوبادی لەم هۆنراوەدا ئەگەرچی زیاتر باس لە پیری دەکات، بەڵام خوێندنەوەی بۆ لایەنەکانی مێژوو و کەسایەتییەکانیش کردووە لە ڕووی تەمەن و فیکر و ئەندێشە و کەسایەتییەوە، خوێندنەوەی بۆیان کردووە و هەڵیانی سەنگاندووە و حوکمی خۆی لە بارەیانەوە داوە.

ئەوەتا هۆلاکۆ و جەنگیزخان و تەیموورلەنگی پێکەوە کۆکردوونەتەوە. هەرسێکیان کەسایەتی و کەسی زۆر گەورە و دەستەڵاتداری مێژوویین. هەروەها لە ڕووی مێژوویی و ئەفسانەییەوە قسەی خۆی کردووە. لە نیوەبەیتێکی تردا خانا لایەکیش لە نادرشای ئەفشار

دەکاتەوە. ئەگەرچی نادرشا ساڵی (١١٤٥-١١٤٧ك.) دەسەڵاتی سیاسیی زۆر بەهێزی هەبووە و زەبر و زەنگی زۆری بەرانبەر بە کوردەکان کردووە، لایەنی باش و خراپیشی هەبووە، دواتریش نیازی خراپی خۆی بەرانبەر بە کوردەکان جێبەجێ کردووە و زەبری کوشندە و خراپی لە دەستەڵاتی سیاسیی کورد داوە. ئەو زەبرە کوشندەیە لە شیعرەکانی ڕەزا خانی باوکی ئەڵماس خاندا بە ڕوونی دیار دەکەون. باوکی ئەڵماس خانیش هێرشێکی زۆر توند دەکاتە سەر ئەندیشە و کەسایەتی و دەستەڵاتی سیاسیی نادر شا و دەڵێت:

**خان وات: ئەی شاتر! خان وات: ئەی شاتر!**

**ئـــــەی کۆهنە میهتەر، قـــەدیمی شاتر!**

**بــــە ئەمر بێچوون، قـــــەدیم و قـــادر**

**نـــــــادر ئێمە تۆ کەردیم بـــــە نـــادر**

لە جێگەیەکی تردا ڕەزا خان دەڵێت:

**قەییووم قـــادر، قەییووم قـــادر**

**نـــــادر ئێمە تۆ کەردیم بە نادر**

سەبارەت بە جیهانی دەرەوە، ئاوڕێك لە مێژووی کیشوەری ئاسیاش دەداتەوە، دواتر دێتە سەر باسی کەریم خانی زەند. کەریم خان ماوەیەك دەستەڵاتی ئێرانی بە دەستەوە بووە، جگە لەوەیش، پایەی لەناو مێژوودا دەستنیشان دەکات و بە کەسێکی دادپەروەر ناوی دەبات. خانا بەپێی ئەو زانیاری و خوێندنەوانەی لەناو شیعرەکانیدان، دەردەکەوێت کەسێکی زۆر وردەکار و پڕزانیاری و خاوەن سەلیقە بووە.

لە سەرەتای داستانی خوسرەو و شیرینەکەیشیدا پەیامێکی نیشتمانی و مێژوویی و نەتەوەییی زۆر بایەخدار و گرنگ ئاراستەی میللەتی کورد دەکات. ئەم پەیامە بۆ سەردەمی خۆی چەندە گرنگ بووبێت، ئەوەندەش لە ئێستادا گرنگە. ئەگەر نەی توانیبێت هەستی زۆربەی خەڵکی ئەو کاتە بە لای ئەو داستانەدا بجووڵێنێت و گیانی نەتەوەپەرەستی لەلای

نەوەکانی ئەو کاتەدا خۆشەویست بکات، ئەوا توانیویەتی پەیامێك بڵاوبکاتەوە و کاریگەریی ڕۆحی، دەروونی، نیشتمانی و مێژوویی لە ناخی خەڵکی ئەو کاتەدا دروست بکات و تا ئێستاش ئەو پەیامە ڕۆژ لە دوای ڕۆژ بە گرنگ تەماشا بکرێت. پەیامەکەش پەیامێکی گشتییە و سەبارەت بە یەکرێزیی زمان، مێژووی زمان، گەل، هۆز و نەتەوەیە.

راسـتـەن مەواچان فـــــارسی شـەککەرەن
کـوردی جـە فـــــارسی بـەڵ شیرینتەرەن
پەی چێش؟ نـــە دەوران ئی دنیای بەدکێش
مەعزووزەن هـــەرکـــــەس بە زوبان وێش

دەبێ هەموومان بە زمانی کوردی بنووسین و پەرە بەو زمانە شیرینەی خۆمان بدەین. بۆچی؟ بە بۆچوونی من خانا تەواوی شانامەی فیردەوسی و هەندێك لە کتێبەکانی ئەو دەمەی کە لەسەر شانامە و داستاننووسی و مەسەلەی زمان بوون، خوێندوونەتەوە. یاخود دەکرێت ئەو هاوکێشە سیاسی، فیکری، زمانی، ئایینی و کۆمەڵایەتییانەی کە لەو دەمەدا هاتوونەتە پێشەوە بۆ نەتەوەی کورد و فارس، لێکچووە و خانا درکی بەو بابەتانە کردووە و ویستوویەتی ئەو پەیامە بە تەواوەتی بگەیەنێت و بۆ مێژوو ئەوە بسەلمێنێت کە کورد لە ڕووی مێژوویی، ئایینی، کەلتووری و کەلەپووری زمانەوە چۆن بیری کردووەتەوە و چۆن بووە و جێدەستی چۆن دیار بووە. بە ئەمەکانە ئەو پەیامە ڕاستییەی کە لەسەر شانی خۆی ناوە، وەکو خۆی گەیاندوویەتی.

جـــە عەرسەی دنیای دوون بـــەدفەڕجام
بـــــــە دەستوور نەزم، نیزامیی مەقـــام

بـــــه لەفز کوردیی کوردستان تەمـــــام
پێش بووان مەحفووز، بـــاقـی وەسسەلام[١٣]

خانا لە سەرەتای داستانی لەیل و مەجنوونەکەیشیدا ئاورێك لە هەندێك لایەنی مێژوویی جیاواز دەداتەوە و دەڵێت:

ئـــەر تـــــەوفیق دەرۆ بینای بیهتەرین
جـــــە دمای مەکتووب خوسرەو و شیرین
عـەجـــەبتەر جـــە سیڕ سیحر ســـامیری
واچۆم وەسف عـــیشق قـــــەیس عامیری
یـــا نیهای مەجنوون مەفتوون لـــــەیلێ
دەیری دێوانـــــەی دەشتی دوجـــــەیلێ
وێڵی و مەحروومی جــــــە شادی و (...)
هـــامڕاز چــــــەنی وحـــووش و تیوور
عیشق مەجـــــازی، بـــەعدەن حەقیقی
واچۆم جـــە تـــــاریخ جـــە ڕووی دەقیقی
بـــــە واتەی حـــەکیم دانـــــای نیزامی
گــــــەنجەوی، ئــەلیاس بن یووسف نامی
شـــــــاعیرێ شـــەریف شـەفیع دەستوور
ئــــــەر پەرسۆ تاریخ ئی نامەی مەستوور
غـــــەین و قـــاف و نوون، دالی ئەبجەدی
حیساب کـــــەرۆ حەرف وێنەی عەسجەدی

[١٣] خوسرەو و شیرین خانای قوبادی (حەمەی مەلا کەریم)، (لا ١٥).

**هەزار و یـــــەکسەد، پـــەنجا و چوارەن**
**ڕەوشەنتەر جـــە سووی شوعلەی وەهارەن**

لەم چەند بەیتەدا خانا چەند لایەنێکی مێژوویمان بۆ دەستنیشان دەکات:

١- ناوی داستانی لەیل و مەجنوون کە وەری گێڕاوە.

٢- لاکردنەوەیەك لە مێژووی پێش ئیسلام.

٣- لایەنی عیشقی مەجازی و حەقیقی.

٤- ئاوڕدانەوەیەك لە مێژوو و ناوهێنانی دەقیقیی شاعیری فارس. دەشتوانین بڵێین مەبەستی بووە بڵێت ئەم چەند بەیتەی کە من باسیان دەکەم دەقیقە، واتە ڕاست و ڕەوان و بێهەڵەیە.

٥-ساڵی (١١٥٤) خانا ئاوڕێك لە هاوڕێ و برا و دۆستە زۆر نزیکەکەی (میرزا شەفیع) دەداتەوە و ناوی دەهێنێت.

٦- لێرەدا خانای قوبادی ئاماژەیەکی جوان بەوە دەکات کە ئەگەر هاتوو میرزا شەفیعی هاوڕێی و دۆستی نزیکم لە من بپرسێت مێژووی نووسینەوەی ئەم نامەیە کەی بووە، ئەوا ساڵی با بزانێت کە(١١٥٤)ی کۆچییە.

لێرەدا دەتوانم وەکو بۆچوونێك ئەوە بڵێم کە خانا بەشێك لەم داستانە یان هەموو داستانەکەی دوای تەواوبوونی وەکو نامەیەك بۆ میرزا شەفیع ناردووە. یان نوسخەیەکی لەبەر گرتۆتەوە بۆئەوەی لەلای ئەویش بمێنێتەوە، یان هەر وەکو فیردەوسی کە لە دواییدا شانامەکەی بە ناوی سوڵتان مەحموودی غەزنەوییەوە کرد بۆ ئەوەی شانامەکەی لە فەوتان ڕزگار بکات و نوسخەی بمێنێتەوە. میرزا شەفیعیش لەناو ئەردەڵانەکەدا خاوەنی پلە و پایەی بەرز بووە و لەسەر خەزێنە و خەرجی و داهاتەکانی میرنشینی ئەردەڵان بووە. ڕەنگە خاناش ویسبێتی هەر وەکو فیردەوسی بکات کە شانامەکەی ناردە لای سوڵتان مەحموودی غەزنەوی بۆئەوەی لە بەرانبەردا پارەیەکی باشی پێ بدات و شانامەکەی بە ناوییەوە کردووە،

هەرچەند غەزنەوی ئەو پارەیەی پێ نەدا بەهۆی ئەوەی تۆمەت درایە پاڵی بەوەی کە لە ئایینی ئیسلام دەرچووە، پاش ئەوەش فیردەوسی کۆچی دوایی کرد. پێ دەچێت خاناش وەهای کردبێت، بەڵام ئەم خەمسەی نیزامیی بەو شێوەیە لێ کردووە. تەنها لە لەیل و مەجنوونەکەیشدا بەو شێوەیە باسی لێوە دەکات. گومانم وایە خانا داستانی لەیل و مەجنوونەکەی دواین داستان بووبێت کە وەری گێڕابێت. هەروەها گومانیشم لەسەر ئەوە هەیە کە خانای قوبادی ئەوەی زانیوە کە فیردەوسی شانامەکەی بۆچی نووسیوە. ئەوەی من بەراوردم کردووە ئەو فکرەیەی کە خانا بۆ پرسی زمان، مێژوو، کێشەی سیاسی و سیاسەتی کۆمەڵایەتی لەناو نەتەوەی فارس لە کۆندا، بەتایبەتی لەو سەردەمەی فیردەوسیی شاعیردا، ئەو ڕووداوانەی کە هاتوونەتە پێش، لە سەردەمی خانای قوبادییشدا ڕوویان داوە.

یەکێك لەو خاڵانەی کە لە مێژووی فارسدا فارسەکان پێی دڵگرانن ئەوەیە کە لە لایەن عەرەبەکانەوە و دوای هاتنی ئایینی ئیسلام و لە ناوچوونی ئایینی زەردەشت، فارسەکان تووشی کوشتن و بڕین و لەناوچوون بوون، تووشی شەڕ و ڕووبەڕووبوونەوەی زۆر بوون و فارسەکان چەوسێنراونەتەوە.

دکتۆر ڕەیاحی لە یاداشتەکانی خۆیدا کە سەبارەت بە فیردەوسییە، زۆر بە وردی و جوان قسەی لەسەر ئەو بابەتە کردووە. لە جێگەیەکدا باس لە پرسی کوردیش دەکات. فارسەکان لەلایەن عەرەبەکانەوە هێرشی زۆریان کراوەتە سەر و ویستوویانە زمانی عەرەبی و داب و نەریتی عەرەب بە سەریاندا زاڵ بکەن و بچەسپێنن.

ئەم لایەنە لە سەردەمی خاناشدا ڕووی داوە و فارس و تورکەکان ویستوویانە کورد بەرەو لاوازبوون و لەناوچوون ببەن. تورکەکان لە قۆڵەکانی لای بادینان و بابانەوە تا سنووری چەمی سیروان کە نزیکی ئێڵی باجەڵان بووە یا تورکی بە سەر کوردیدا زاڵ بکەن. هەروەك چۆن ئەو کوردانەی لە ناوچەکانی ژێر دەستەڵاتی فارسدا، زمانی فارسییان بەسەردا سەپێنراوە، ناوچەکانی ژێر دەستەڵاتی تورك و عەرەبیش بە هەمان شێوە بووە.

باجەڵاتەکانیش سەردەمانێك سەر بە عوسمانی و ماوەیەکیش سەر بە سەفەوییەکان بوون. لە کتێبی ئێڵی باجەڵانەکاندا قسەی زۆر لەسەر ئەم باسە کراوە. خانا ویستوویەتی گیانی نەتەوایەتی لە فیکر و زیهنی منداڵان، گەنجان و تاکی کورددا بچەسپێنێت، تا نەتەوەی خۆیان خۆش بوێت. خانا هەستی بەوە کردووە کە فارسەکان چۆن دەیانەوێت کورد و مێژووەکەی لەناو ببەن، هەر کاتێکیش شەڕێك هاتبێتە پێشەوە، زۆربەی سوپاکان لە پێشەوە ئێڵە کوردەکان چاوساغییان کردوون و ئەوان پێشتر و زیاتر شەڕیان پێ کراوە.

٧- خانا بۆ مێژوو ئەوەی سەلماندووە کە چەند دەستپاك بووە و خاوەن فکرێکی پاك و ڕوون بووە. لە هەموو داستانە وەرگێڕدراوەکانیدا کە وەری گێڕاون، لە سەرەتا و لە شوێنی خۆیدا ناوی نیزامیی گەنجەویی هێناوە. کە داستانەکان هی ئەون.

زۆربەی ئەو خاڵانەی لێرەدا لە باسی مێژوو و نەتەوە و زمان و فەرهەنگ و فیکر و جیهانبینی قسەمان لەسەر کرد، لە سەردەمی فیردەوسییشدا بە هەمان شێوە بەسەر فارسەکاندا هاتووە. ئەو ڕووداوانەی کە پێش هاتوون و فیردەوسی و هاوتەمەنەکانی فیردەوسی و دوای ئەویش باسیان لەسەر ئەو ڕووداوانە کردووە. ئەو جیهانبینییەی فیردەوسی باسی لێوە کردووە، خاناش هەمان تێڕوانینی هەبووە، بەڵام لە سەردەمێکی تازە و لە کات، شوێن، نەتەوە، بیر، کەش و هەوای جیاوازدا ئەو باسانەی خوڵقاندووە.

هەموو ئەمانەی کە لێرەدا باسمان لێوە کرد، هەر یەکەیان لە ڕووی مێژوویی و مێژووی ئەدەبیات و زمان و وەرگێڕانەوە، گرنگی و تایبەتمەندیی خۆی دەبێت لە باسی ژیانی خانای قوبادیدا.

**خۆشەویستەکەی خانا**

لەناو مێژووی ئەدەبیاتی کوردیدا زۆر شاعیرمان هەیە کە بەشێك لە شیعرەکانیان تایبەت کردووە بە خۆشەویستی، بە تایبەتی دۆستەکەی. هەر یەکەیشیان بە یەکێك لە مەعشووقە بەناوبانگەکان ناویان بردوون. بۆ نموونە مەلا موستەفای بێسارانی بە زولەیخا و شیرین ناوی خۆشەویستەکەی دەبات. هەندێك بە لەیلا و هەندێکیش بە شەم، بەڵام لەلای خانا ئەم لایەنە زۆر جیاوازە، خانا ناوی ڕاستیی دۆستەکەی زولەیخایە و خەڵکی کولیایی بووە.

**زولەیخای ســـانی، زولەیخای ســـانی**
**زولەیخای بـــەگزادەی کولیای نیشانی**
**دەور بەستەن چون چـەرخ چالاك لانی**
**چەرخنا چون بـــاز شەیدای شیوانی**

زولەیخا لە بەگزادەکانی کولیایی بووە. خانمێکی شۆخ و شەنگ بووە.

بەپێی ئەو شیعرەی لەم دیوانەدا هاتووە، زولەیخایش شاعیرێکی بەدەستەڵات بووە. لەناو دەستنووسەکانی بەردەستماندا لە چەند نوسخەیەکدا دوو پارچە شیعر هەیە بە ناوی خانا و زولەیخاوە. یەکەمین جارە ئەم هۆنراوانە لە دیوانی خانادا بڵاو دەبنەوە. ئەم خۆشەویستییە دەکرێت یەکەمجار یەکلایەنە بووبێت، سەرەتاش خانا دەستپێشخەریی کردبێت و قەشەنگیی زولەیخا وای لێ کردبێت خانا بهێنێتە گۆ و وەسفی دۆستەکەی بکات. بە پێچەوانەشەوە ڕاستە. دواتر زولەیخا بەم حاڵەی خانای زانیبێت و بەم شێوەیە هاتبێتە دەنگ:

**سەرسامم کـەردەن، سەرسامم کەردەن**
**خـــانـــا دڵگیریت سەرسامم کەردەن**
**بـەو شا کە ئاگای ڕووی پشتی پەردەن**
**پـــەی کـەم دەماخیت ئیمانم هەردەن**

**ئـەڵبەت چـەندێوەن تۆ کـەم دەماخی**
**هامڕاز مـەینـەت شەریك ئـــــــاخی**

وەکو دەبینین زوڵەیخا چۆن سەرزەنشتی خانا دەکات و بەو حاڵە ناهەموارەی خانا دەزانێت و باسی لایەنە دەروونی و فیکرییەکانی خانا دەکات و دەی خوێنێتەوە. خاناش هەر وەکو خووەکەی جارانی و بە ئەدەبێکی جوانەوە دێتە گۆ و دەڵێت:

**هەر من بەندەی تۆم، هەر من بەندەی تۆم**
**خوا مەزانۆ هـــەر من بـــــەندەی تـــۆم**
**داغدار بــــــە داغمای مودام ژەندەی تـۆم**
**غوڵام قـــەدیم بـــــە زەڕ سەندەی تـــــۆم**
**نـــــــە جـە تۆ دڵگیر، نە پەی کەس داخم**
**جـــــە شادی شێوەت بـــــەرزەن دەماخم**

خانا زۆر بە ڕوونی و جوانی وەڵامی زوڵەیخا دەداتەوە. لەناو ئەو هۆنراوانەی تاکو ئێستا دەستکەوتوون، یەك پارچە شیعری زوڵەیخا لە بەردەستدایە، بەڵام چەند پارچە هۆنراوەیەکی خانا هەن کە باس لە زوڵەیخا دەکەن و بە ڕوونی ناوی زوڵەیخا دێنێت. پێ دەچێت لە نێوان ئەم دوو خۆشەویستەدا چەندین نامەی تری هەبووبێت، بەڵام ئێمە تاکو ئێستا ئەم نامەیەمان دەست کەوتووە. وەکو گوتمان چەند پارچە شیعرێکی کوردی و فارسیی خانامان لە بەردەستدایە کە تیایاندا وەسفی زوڵەیخا دەکات. لە بەیتێکی فارسیدا خانا زۆر بە ڕوون و جوانی دەڵێت: "من یووسف نیم، بەڵام من زوڵەیخایەکم هەیە، من چی خەم و هەمێکم هەیە و هەمووی بە با ڕۆیشتووە، چونکە یارەکەم ناوی زوڵەیاخە".

لەم نێوەندەدا دەبێ ئەوەش باس بکەین کە میرزا شەفیعی کولیایی بە بەینی ئەم دوو شاعیرە و عەشقەی زانیوە و بە نامەیەك بەشداریی خەم و ئازارەکانی خانا دەکات.

لەم دواییانەشدا مامۆستا موحەممەد ڕەشیدی ئەمینیی پاوەیی ئاگاداری کردمەوە کە چەند بەیتێکی شیعری خانای دەستکەوتووە کە باس لە زوڵەیخا دەکەن، بەڵام ئەم زوڵەیخایە خوشکی خانایە نەك دۆستەکەی.

ملیح لا تجرح ملومـــــــــــاء الـمی
مـر بـڕّشت استـــاد لایمـــــــوت می
یـــان دوشاخە مەرزەنگ گۆش تــــەڕ
یان دوورین جە دست سەرحەددار جە بەڕ
قـــــەسەم بـــــە دانای بینای باڵادەس
زوڵەیخا بـــە زۆر من نـــــادەم بە کەس

لێرەدا ئەوە دەبینین کە خانا زۆر پێداگری لەسەر ئەوە دەکات کە زوڵەیخا بە زۆر ناداتە کەس. ئەم لایەنەش لایەنێکی تازەیە و تاکو ئێستا لە باسی خانادا شتێکی لەم شێوەیە باس نەکراوە. من جگە لەوەی کە مامۆستا بۆی ناردووم، هیچی لەسەر نازانم، نەوەکانی خاناش دەڵێن: ئێمە ناوی زوڵەیخا لەو سەردەم و کاتانەدا شتێکی لێ نازانین و باس نەکراوە کە خوشك و کەسمان بەو ناوەوە هەبووبێت. شیعرەکەش جۆریك دەستکاری و لەنگی و بێسەروبەریی پێوە دیارە.

## هاوڕێکانی خانا

ئەوەی لە باسی هاوڕێ و دۆستەکانی خانادا باسی لێوە دەکرێت و کراوە و بەڵگەی لەسەر هەیە. دوو کەسن، یەکێکیان میرزا شەفیعی کولیاییە و ئەوی تریان عەبدوڵڵا خانی کوڕی سەفی خانی جوانڕۆییە.

میرزا شەفیعی کولیایی یەکێکە لە دۆستە زۆر خۆشەویست و نزیکەکانی خانا. ئاگاداری سەرجەم کار و چالاکییەکانی خانا بووە. ئەم دۆستایەتییەی خانا و میرزا شەفیع تەنها لە نهێنیی ئیش و کاری ڕۆژانەدا نەوەستاوەتەوە. بگرە لە نهێنیی نێوان زولەیخا و خانای قوبادییشدا خۆی نواندووە. میرزا شەفیعی کولیاییش ئاگاداری هەموو ئیش و کار و نهێنییەکانی خانا بووە، هەندێك جار بە نامەیەك بەشداریی لەو دۆستایەتی و خەمانەی خانادا کردووە.

هەروەها لە چەندین نامەی تایبەتی کە میرزا شەفیعی کولیایی باسی پیری و ئازار و مەینەتییەکانی خۆی بۆ خانای قوبادی دەکات و خاناش سەرزەنشتی دەکات و دڵی دەداتەوە. میرزا شەفیع بەڕێوەبەر و دەستەڵاتداری خەزێنە و مالیات و گەنجینەی میرنشینی ئەردەڵان بووە. لە دیوەخانی ئەردەڵانەکاندا جێگەی تایبەتی هەبووە. لەم بەیتەدا میرزا شەفیع پیاهەڵگوتنێکی جوانی بۆ خانای قوبادی هەیە و دەڵێت:

**خانای جامی خوو، خانای جامـــی خـوو!**

**خانای خاس خـەیاڵ، دانای جامی خـوو!**

خانای قوبادییش لە وەڵامی میرزا شەفیعی کولیاییدا دەڵێت: میرزاکەم! سەرمایە و دەستمایەی تەمەنی مرۆڤ لە کۆتاییدا پیرییە، ئیش و کاری دوادوایی مرۆڤ لە کاتی پیریدا هەر گریان و ناڕەحەتی و ئاه کێشانە:

میزام خوارییەن، میزام خوارییەن
ئـــاخر سەرمایەی پیری خوارییەن
پێشەش ئـــاه سەرد شین و زارییەن
مایەی بێ قەدری و کەفتەکارییەن

لە کۆتاییدا خانا بەم شێوەیە وەسفی هاوڕێکەی دەکات:

میرزای وەش کەلام هـــامدەرد دەردم
شەممەی جە پیری ها بـــەیان کەردم
شەفیع زیقەدر مستەوفی دیـــــوان
شیعرای شیرین ڕاز، جە قەسر ئەیوان
جـــەوانی لوان، ئـــــامانش نییەن
پیری دەردێوەن دەرمـــــــانش نییەن
پـــەی میرزا شەفیع برای خۆشکەلام
خانـــــا پەرێش وات: باقی وەسسەلام

خانا لێرەدا بە هاوڕێکەی دەڵێت: ئەی هاوڕێی خۆشگوفتارم! ئەی دۆست و هاودەردم! من ئەوا هەموو شتەکانی خۆمم بۆ تۆ باس کرد، میرزا شەفیعی قەدردار و بەڕێوەبەر و دەستەڵاتدار لە دیوان و خانەدان و خانەدانانی ئەردەڵان! شاعیری شیرین و ڕازدار لە دیوەخان و ئەیوان و هاوعەسری من! ئەمە بۆ میرزا شەفیعی برای خۆش قسە و کەلامم، خانا ئەم وتەیەی بۆ تۆ وتوویەتی و ئەوەی ماوەتەوە بیلێم سەلامەتیتە. دەبێ ئەوەش بلێین کە میرزا شەفیعی کولیاییش خانای قوبادیی زۆر خۆش ویستووە. ئەو خۆشەویستییەی کولیایی هیچی کەمتر نەبووە لەوەی خانا.

یەکێکی تر لە هاوڕێکانی خانای قوبادی عەبدوڵڵا خانی کوڕی سەفی خانی جوانڕۆیی بووە. ئەگەرچی ڕای جیاواز لەسەر ئەم بابەتە هەیە، بەڵام بەپێی هەندێك لەو سەرچاوانەی کە سەر بە قوبادییەکانن، دەڵێن: گوایا کاتی خۆی خانا زۆر بە دەستەڵات بووە و باوکی پێی ناخۆش بووە خانا ئەوەندە زوو زوو گەشەی کردووە. بۆیە زۆربەی زۆری دەستەڵات و سەروەت و سامانەکانی لێ وەردەگرێتەوە، چەند جارێك ئەم کارە دەکات. بەڵام خانا لەبەر ورت و وریایی و دەستەڵاتەکانی، دووبارە و چەندبارە دەوڵەمەند دەبێتەوە، هەر بۆیە باوکی ناچار دەبێت وازی لێ دەهێنێت و خانا لەگەڵ دایکیدا لە ناوچەیەکی جیاواز جێگیر دەبێت. واش دەزانم ئەو ناوچەیە هەر سەریاس تا سنووری خان ئاشوور بووە. پێ دەچێت ئەم شیعرە هەر لەو کات و ساتەدا بووبێت یان ئەو کاتەی کە خانا لەلای باجەلانەکان بەند بووە. دەکرێت هەموو ئەم پێشهاتانە لە یەك کاتدا ڕووی دابێت. لێرەدا وەکو هاوڕێیەکی خانا باسی لێوە دەکەم.

بەپێی ئەو وتانەی کە لە بەڕێز غەففارییم بیستووە، عەبدوڵڵا خانی هاوڕێی خانای قوبادی ناوچەیەکی بچووکی لە ژێر دەستەڵاتدا بووە. وەکو لە هۆنراوەکەیشدا هاتووە ناوی عەبدوڵڵا و ناوی باوکی عەبدوڵڵاش دەهێنێت، جگە لەوەش باسی دەستەڵات و موڵك و ماڵاتی عەبدوڵڵا خان دەکات کە پیاوێکی دەوڵەمەند بووە و سەروەت و سامانی زۆری هەبووە. خاناش خاوەنی عەقڵ و هۆشی کار و کاسبی نەبووە. خانا لە جێگەیەکدا دەڵێت من خاوەنی ئەم موڵك و سامان و جوگرافیایەم. لێرەدا دوای ئەوەی هەمووی لە دەست دەدات، دەڵێت:

عـــەبدوڵڵا تەرزەن، عـــەبدوڵڵا تەرزەن

ڕاستەن خـــان بـــــەور کەیانی تەرزەن

**خاستەر جـــە ئەولاد گیو و گوودەرزەن**
**سەد پـایە پایەش، جـە خانان بەرزەن**
**نوتفەی سەفی خـــان کەیخوسرەو وێنە**
**ساحێب ئـەسباب و گـــەنج و خەزێنە**
**سەد گەدای چون من، موفلیس بێبەش**
**کەردەن بـــە ساحێب بەفتان و مەفرەش**

لە هەندێك سەرچاوەشدا وەکو غەففاری (لا ٢٩) دەڵێت:

*"مەزەندە دەکرێ خانا و میرزا ئەڵماسخانی کەنوولەیی لە رێگەی میرزا شەفیعەوە پێکەوە ئاشنا بوبن. میرزا ئەڵماسخان زۆرتر موتاڵای شیعری فیردەوسی و خانای کردووە و بە کاریگەریی زمانی خانا و بیری فیردەوسی توانیویەتی شانامەی کوردی بهۆنێتەوە".*

دەڵێن گوایە مەزەندە دەکرێت لە ڕێگەی میرزا شەفیعەوە خانا و ئەڵماس خان بووبن بە هاوڕێ. بەڵام تاکو ئێستا لە هیچ جێگایەکدا نە خانا باسی ئەڵماس خانی کردووە و نە میرزا شەفیعیش ناوی دەهێنێت. لەگەڵ بەشێك لەو بۆچوونەم کە ئەڵماس خان زیاتر شیعری فارسی خوێندووەتەوە و خۆیشی زیاتر بە فیردەوسییەوە سەرقاڵ کردووە. ئەم تێڕوانینە لەناو شیعرەکانی ئەڵماس خاندا بەدی دەکرێت. بەڵام خانا زیاتر زمانی عەرەبی بەسەر شیعرەکانیدا زاڵە. هەرچەندە موتاڵای شیعری فیردەوسی، جامی، سائیب، نیزامی و خاقانیی کردووە. خانای قوبادیی خەمسەی نیزامیی وەرگێڕاوە، وەڵامی شیعری سائیبی داوەتەوە، پەیڕەوی ڕێبازی فیردەوسی و جامیی کردووە، لە چەند جێگەیەکدا دۆستەکانی بەم شێوە باسی لێوە دەکەن:

## شەرح بەیــــــان کەر خاقانی خامە

## شیعرای جـامی نەزم، نیزامی نامە

لەم بەیتەدا زوڵەیخا بە خانای قوبادی دەڵێت: ئەوەمان بۆ ڕوون بکەرەوە ئەی خانا کە پێنووسەکەت وەکو پێنووسی خاقانییە، لە شاعیرییشدا شیعرەکانت وەکو جامییە و نامەکانیشت وەکو نامەی نیزامی وایە.

ئەو بۆچوونەش ڕاستە کە دەڵێن ئەڵماس خانی کەنووڵەیی زیاتر بە وەرگێڕانی شانامەی فیردەوسییەوە سەرقاڵ بووە و ئەو پرۆژەیەی بە ئەنجام گەیاندووە، خانایش بە وەرگێڕانی خەمسەی نیزامییەوە سەرگەرم بووە. هەروەها گومانیشم بۆ ئەوە دەچێت لەبەر ئەوەی ئەڵماس خان شانامەی وەرگێڕاوە، خانا خۆی لە شانامە نەداوە و کارەکانی ئەوی دووبارە نەکردۆتەوە، بەڵام ئەڵماس خان کاری لەسەر شیرین و فەرهاد و خوسرەو و شیرینیش کردووە. بە گشتی ئەوە ڕوون دەبێتەوە هاوڕێکانی خانا تەنها میرزا شەفیع و عەبدوڵڵا خان بوون، پەیوەندییەکی ئەوتۆی لەگەڵ ئەڵماس خاندا نەبووە.

نابێت ئەوە لە بیر بکەین کە ئەو هەنگاوە ڕۆشنبیرییە شێوە گرووپییە کە لەو سەردەمە تایبەتەدا لە نێوان خانا و هاوڕێکانیدا بۆ وەرگێڕانی بە شێك لە ئەدەب و ڕۆشنبیریی فارسی بۆ ناو ڕۆشنبیریی کوردی بووە. لە دیدی ئەمانەوە هەست بە جۆرێك بۆشایی لە ڕۆشنبیریی کوردیدا کراوە. ئەم شێوە کارکردنە ئەوەندەی کارکردن بووە بۆ پڕکردنەوەی ئەو بۆشاییە فەرهەنگییە، ئەوەندە کارکردن نەبووە لەسەر ڕاپەڕینێکی تازە لە ڕۆشنبیریی کوردیدا بە بارێکی ئازاد و نوێدا.

ئەمەش لە بەرانبەردا ئەوە دەردەخات کە هەر یەك لە نالی، سالم، کوردی و مەحوی، بەشێکی دیکەی ئەو ڕۆشنبیرییە فارسییە دەهێننە ناو ڕۆشنبیریی کوردیی کە بە تێڕوانینی ئەوان بەشێکە لە هونەری پیرۆزی ئیسلامی و نزیکترین ڕۆشنبیریشە لە زایقەی کوردییەوە.

ئەمە لە دیدێکەوە، لە دیدێکی تریشەوە هەریەك لە شەفیع و ئەڵماس و خانا کاتێك بەر ئەو ڕۆشنبیرییە دەکەون، دەزانن میللەتی کورد لە چ بارێکدا بووە و پێویستی بە چ ڕۆشنبیرییەك بووە کە دەیانەوێ بیسەلمێنن کە زمان و ڕۆشنبیریی کوردی هیچی لە ڕۆشنبیرییەکانی دەوروبەر کەمتر نەبووە، هەر بۆیە دەبینین خانا هەوڵی پڕکردنەوەی ڕەهەندێکی ئەدەبی دەدات، ئەڵماس خانیش لایەنێکی تری دەگرێتە ئەستۆ و میرزا شەفیعیش لە ڕوانگەیەکی ترەوە دێتە گۆ و مێژوویەکی ترمان بۆ دەنووسێتەوە.

بەپێی ئەم بەڵگانە، ئەوەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە کە ئەم دوو شاعیرە مەزنە لە دوو ناوچەی نزیك بە یەکتر و هاوتەمەنی یەکتری بوون. خاوەن خامەی ڕەنگین و پڕبڕشت و سەلیقەی جوان بوون، ئاگاداری بەرهەم و کاری یەکتریش بوونە، ئەگەرچی پەیوەندی و دۆستایەتییەکی ئەوتۆی نزیکیان لەگەڵ یەکتردا نەبووە.

**کۆچی دوایی خانای قوبادی**

سەبارەت بە ساڵی وەفاتی خانای قوبادی هیچ بەڵگەیەکی نووسراو لە بەردەستدا نییە. بەڵام بەشێك لە نووسەران و لێکۆڵەران ڕای خۆیان سەبارەت بە کۆچی دوایی خانای قوبادی بەم شێوەیە خستۆتە ڕوو:

هەر یەك لە دانەری کتێبی گوڵزاری کوردستان، سدیق بۆرەکەیی، نامیلکەیەکی کۆن، بەگزادەکانی جوانرۆ و شێخ حامید، ساڵی کۆچی دوایی خانای قوبادییان بە ساڵی (١١٦٨ك.) داناوە. هەروەها مامۆستایانی وەکو موحەممەد عەلی سوڵتانی، سەیید تاهیری هاشمی و مارف خەزنەدار، ساڵی (١١٩٢ك.)یان بۆ کۆچی دوایی خانای قوبادی نووسیوە. جگە لەوانەی سەرەوە، مامۆستا عەلائەدین سەجادیش ساڵی وەفاتی خانای بە ساڵی (١٧٩٥ز.= ١٢٠٩ یا ١٢١٠ك.) داناوە.

ئەوەی جێگەی سەرسووڕمانە کاك حەکیم مەلا ساڵح لە یووسف و زوڵەیخاکەی خانادا (لا- ٣) ساڵی وەفاتی خانای بە ساڵی (١٧٣٢ز.=١١٤٥ك.) کۆچی داناوە. نازانم لە بەرانبەر چیدایە و چۆن لێکی داوەتەوە. لای هەمووان ئەوە ڕوونە کە خانای قوبادی لە ساڵی (١١٥٣ك.)دا داستانی خوسرەو و شیرینەکەی نووسیوەتەوە و ساڵی (١١٥٤ك.) داستانی لەیل و مەجنوونەکەی داناوە. ئەو ساڵەی کاك حەکیم بۆ ساڵی وەفاتی خانای قوبادیی داناوە، واتای ئەوەیە کە خانا پێش ئەوەی خوسرەو و شیرین و شیرین و فەرهاد و لەیل و مەجنوونەکەی بنووسێتەوە وەفاتی کردووە.

بە هەرحاڵ ئەو سەرچاوانەی کە باسیان لە وەفاتی خانای قوبادی کردووە، خانا لە ساڵی (١١٦٨ك.) وەفاتی کردووە. جگە لەو بەڵگانەی نووسەران باسیان لێوە کردووە، من هیچ دەستنووس و بەڵگەیەکم لە بەردەستدا نییە کە ئاماژە بە ساڵ و کۆچی دوایی خانای

قوبادی بکات. ڕام لەسەر ئەوەیە کە خانای قوبادی ساڵی (١١٦٨ك.) واتە لە تەمەنی (٧٠) ساڵیدا کۆچی دواییی کردووە.

## گۆڕی خانا و تەختی خانای قوبادی

سەبارەت بەوەی ئایا گۆڕی خانای قوبادی لە کوێدایە، ڕای جیاواز هەیە. وەك لە ڕیشسپییانی کۆن بیستراوە گوایە گۆڕی خانا هەر لە ناو گۆڕستانێکی شاری جوانرۆدا نێژراوە. هەندێکی تریش ڕای جیاوازیان هەیە.

بەپێی ئەو بەدواداچوون و لێکۆڵینەوانەی کردوومانە و لە نەوەکانی قوبادی ئەو ناوچەیە پرسیومانە، ئەوەمان بۆ ڕوون بووەوە کە دەبێت گۆڕی خانا لە گۆڕستانی بانی گومگان بێت لە گوندی بانی گومگان لە ناوچەی ناراو کە لە شاری جوانرۆدایە. بەپێی ئەوەی هەر لەناو ئەو گۆڕستانەدا گۆڕی سەیید ئەحمەدی گەورە و سەیید ئەحمەدی کوڕی قوباد بەگ و نەوەکانی سەیید ئەحمەد بەگ (موئمین بەگ، ئەمیر خان بەگ و خانلەر بەگ و...) لەوێدان.

وەکو لە نەوەکانی قوبادی بیستراوە و ئێستەیش دەیگێڕنەوە، کاتێك موئمین بەگ و چەند کەسێکی تریش لە نەوەکانی قوبادی لە شاری چەمچەماڵ و ناوچەکانی تری کوردستانی دیوی عێراق کۆچی دوایی کردووە، دەیگێڕنەوە بۆ ناوچەی ناراو و لە گۆڕستانی ناوبراو دەینێژن.

ئەمە لە لایەك، لە لایەکی تریشەوە خانایەك کە خاوەنی خزم و کەس و کارێکی زۆر بووبێت و ئەو دەستەڵات و هێز و توانایەی هەبووبێت، خانی ناوچەی سەریاس و (٣) سێ تەختی نیشتەجێی لە ناوچەی ناراودا هەبێت، تەختێك لە باهووی کیکەن، تەختێك لە بانی عەزیزی و تەختێکیش لە نزیك گۆڵوەنی قەمەر، لە شانی داروڕ و ناسراویشە بە پۆسنە، لە باشترین جێگای ئەو ناوچەیەدا ماڵی هەبووە، هیچ جێگەی گومان نییە گۆڕی خانا هەر لەو گۆڕستانی بانی گومگانەدا بێت.

بڕوام وایە گۆڕی خانای قوبادی لە گۆڕستانی بانی گومگانە و هەر لە لای برا و باوك و باپیرانیدا نێژراوە.

## لایەنە شیعرییەکانی خانای قوبادی

### شیعری ئایینی

شیعری ئایینی و دینی عاشقانە و زاهیدانە، خانا بە شێوازێکی قووڵ و جوان دینی عاشقانە شرۆڤە دەکات و ئاگایی باشی هەیە و لەوێوە پەیامی هونەری و ئایینیی خۆی دەگەیەنێت، لەوەشدا پێش زۆر لە شاعیرانی کورد دەکەوێت.

نوێژی عاشقان کە بەیانیان و ئێوارانە، ئاماژەیە بۆ ئەو ئایەتانەی قورئان کە هانمان دەدەن بەیانیان و ئێوان یادی خودا بکەین. ئەمە بۆ خۆی خەسڵەتی پەیامبەری ئیسلام بووە و ڕەوشتی پێغەمبەران و پیاوچاکان بووە. خانا لە نێوان عیشقی مەجازی و حەقیقی دێت و ڕوو لە یار دەکات نەك دیوار. نوێژی عاشقانە و زیکری عاشقانە دەکات و لە دینی زاهیدانەوە دەچێتە ناو دینی عاشقانەوە.

بەشێك هۆنراوە لەناو دیوانی خانای قوبادییدا هەیە کە بە بەشی هۆنراوە ئایینییەکانی خانا ناسراوە. خانا لەم بەشەدا چەندین پارچە شیعری ئایینی و زاهیدانەی هەیە.

لە هۆنراوە ئایینییەکانیدا لە لایەنەکانی ڕەوانبێژیدا وردەکارییەکی زۆری ئەنجام داوە، بۆ نموونە: خانا لە هەندێك جێگەدا کە ئایەتی لە شیعرەکانیدا هێناوە، ئایەتەکەی بۆ (١٠) بڕگە کورت کردووەتەوە، لە هەندێك جیگەی تریشدا دوو ئایەتی تێکەڵ کردووە:

**بەقیەی عەسکەرت (رباط الخیل)ەن**

**(أمَّنْ قـــانتٌ آنـــاءَ اللیّل)ەن**

خانا لە نیوەبەیتی یەکەمدا بەشێك لە ئایەتی (٦٠)ی سوورەتی (الانفال)ی هێناوە و لە نیوەبەیتی دووەمیشدا بەشێك لە ئایەتی (٩)ی سوورەتی (الزمر) دەهێنێت. لە نێوەبەیتی

دووەمدا وشەی (هو)ی لەبەر کێشی شیعرەکە لابردووە، ئایەتەکە لە بنەڕەتدا بەم شێوەیەیە: ﴿أمَّن هُوَ قانتٌ ءاناءَ اليلِ ساجد و...﴾.

(في يَــــومٍ كالمُهْل، طَعـامٌ أثيمْ
يُلقي في البطـون، كَغَلي الحَميم)

لەم بەیتەدا خانا دوو ئایەتی هێناوە و بەیتێکی لێ دروست کردووە، ئەم دوو ئایەتە لە قورئاندا لە سوورەتی (الدخان)دا بەم شێوەیە هاتوون: ﴿كالمهل يغلي في البطون(٤٥) كغلي الحميم(٤٦)﴾. لە شیعری "زوننارم بەستەن"یشدا خانا وێنەیەکی زۆر جوانمان بۆ دەکێشێت و لایەنێکی ئایین و نوێژمان بۆ دەستنیشان دەکات:

تـــــــا وە زوڵف و ڕووی تۆ تەماشامەن
ئـــــــەدای نمای فەرز سوبح و عیشامەن
سەجـــادەم وە هـــوون زامان ڕەنگ کەردەن
سوژدەم وە مێحراب ئـــــەبرۆی تۆ بەردەن

لەم بەیتەدا جگە لەوەی بنەمای نوێژمان بۆ دەستنیشان دەکات، لە هەمان کاتیشدا ئەوەمان بۆ بەیان دەکات کە ئەوەندە تەماشای خوای کردووە و نوێژی کردووە، تا بەرماڵەکەی بە خوێن سوور بووە و خوێنی ڕژاوەتە سەر بەرماڵەکەی، خانا لە دینی زاهیدانەوە دەچێتە ناو دینی عاشقانەوە.

خانا لە شیعرێکی تردا دەڵێت:

کۆن شان و شەوکەت عەبدوڵڵا و عومەر؟
کۆن تــــاج (لولاك) ڕەهنومای ڕەهبەر؟

لە جێگەیەکی تردا دەڵێت:

نییــــەن وێنەی تـــۆ ســـــەیید (لولاكْ)
شای (لَعَمرُك) تەخت، (ومـــــا أرسلناكْ)

هەروەها لە بەیتێکی تردا دەڵێت:

بـــە تـــاج لـــــــەولاك، سەیید سەروەر
شای بووراق سوار، عەرسەی ڕۆژی مەحشەر

خانا هەر وەکو شاعیرانی تر لە زاراوەی (لولاك) خۆی لا نەداوە. ئەگەرچـی ڕای جیـاواز لەسەر ئەم زاراوەیە هەیە. ئەم وشەیە ئاماژەیەکە بۆ فەرمایـشتێك کـە بـە نـاوی خـودای گەورەوە ئاراستەی پەیامبەر کراوە (لـولاك لـولاك ماخلقـت الأفـلاك) واتـە: ئەگـەر تـۆ نەبووایــەی، زەوی و ئاسمــان و ئەســتێرەکانمان دروســت نــەدەکرد. لەڕاســتیدا ئــەم وتەیــە فەرمایشتی خودا نییە و هەڵبەستراوە، پێچەوانەی ئایەتی (٥٦)ی ســوورەتی زاریاتــە کــە خودا دەفەرموویت: ﴿وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالإِنسَ إِلا لِيَعْبُدُونِ﴾. ئەڵبەتە ڕای جیاوازیش لەسەر ئەم بابەتە هەیە، لێرەدا ئەوەندەی لەسەر دەوەستین و ئەوەی تری بۆ لێکۆڵەرانی ئەو بابەتە جێ دەهێڵین.

جگە لەو بابەتانەی سەرەوە، چەندین نموونەی تـری بێوێنــە هەیــە لــە دیـوانی خانـای قوبادیدا کە پێویستە لێکۆڵینەوەی زیاتریان لەسەر بکرێـت. شـیعری ئـایینیی خانـا لـە قاڵبێکدایە، پیویستی بـە لەسەروەسـتانی زیـاتر هەیـە. لێـرەدا هــەر ئەوەنــدە لەســەری ڕادەوەستین.

**شیعری دڵداری**

خانا جگە لە داستانە شیعرییەکانی کە وەری گێڕاونەتە سەر زمانی کوردی، لەناو دیوانەکەیدا چەند پارچە شیعرێکی دڵداری بەرچاو دەکەوێت. هەرچەند ئەم پارچە شیعرانە بە نامە شیعرییەکانیشەوە زۆر نین، بەڵام زۆر گرنگن بۆ ژیانی خانا و لایەنێکی گرنگی ژیانی خانامان بۆ ساغ دەکەنەوە. ئەو نامە شیعرییەی زولەیخا بۆ خانای ناردووە یەکێکە لەو نامە گرنگانەی کە لە خاڵێکی زۆر گرنگ و شاراوە ئاگادارمان دەکاتەوە و بەرچاوڕوونیمان پێ دەدات. لەو نامە شیعرییەی خانا و زولەیخادا ئەوەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە کە خانا دۆستەکەی ناوی زولەیخا بووە و شاعیریش بووە. خاناش وەڵامی دەداتەوە و ئەوەی پێ دەڵێت کە من خەم و خەفەت و دڵگیریم بۆ تۆیە. دواتر میرزا شەفیعیش وەڵامی خانا دەداتەوە.

خانـــای دڵ وە تەنگ، خانــای دڵ وە تەنگ
پــــــەی عازیەتباری، دڵ ماوەر وە تەنگ
نـــــــەی وەر نەقــاشان دەستکار ئەرژەنگ
وە ئانقەست مەکەرد ڕەنگ هامیتەی ڕەنگ

لە شیعرێکی تردا خانا بە زمانی فارسی دێتە گۆ بۆ زولەیخا و دەڵێت (نیم یوسف ولی دارم زولیخا)، هەروەها لە چەند پارچە شیعرێکی تردا هەر بە ناوی زولەیخاوە شیعر دەنووسێت. لە شیعری "میرزام خال لەیل، زولەیخام نارە"دا وێنەیەکی جوانی دۆستەکەی دەکێشێت و دێتە وەسف و سەنای. چەندین شیعری تری خانا لایەنەکانی دڵداریی خانا دەخەنە ڕوو کە عاشقێکی ناسکنەواز و دڵداری دڵبەرەکەی بووە. چەند گوڵناسا بووە لە بەرانبەر دۆستەکەیدا!

خـــــەندەگ غـــــــەمزەی وەنەوشەخاڵان
حـــــەربەی نیم نیگای نــــــازك نەوهاڵان

ئـــــەر بگنۆ وە سەنگ کۆی سەخت خارا
مەکەرۆش وە گـــــەرد بـــــەبێ مودارا

لەنامە شیعرییەکانیشدا بۆ میرزا شەفیع بەم شێوەیە باسی گەنجێتیی خۆی دەکات:

هەتـــــا جوان بیم وەیتەور پیر نەبیم
هامراز بـــاز بیم، سۆنـــەگیر نەبیم
ئیستە هـــــا پیری سەرسامم کەردەن
وێنەی سکەی قەلب، بەدنامم کەردەن

لەم وێنەیەدا کە خانا کێشاویەتی و باسی لێوە دەکات، تەواوی جوانی و گەنجایەتی و لایەنەکانی خۆیمان بۆ دەستنیشان دەکات. تا دەگاتە پیری، ئێستە کە پیرە، ماڵ و منداڵ چیی پێ دەڵێن و منداڵانی گەڕەك و دۆست و دراوسێ و ژنی کۆڵان چۆن گاڵتە بە پیرییەکەی دەکەن. ئەم کینایە و مەجازەی خانا لەم هۆنراوەیەدا بەکاری هێناوە، جیاوازە لەوانی پێشووتر. ئەو کاتانەی گەنج و بەگوڕ بووم و وەکو ئێستا پیر نەبووم، لەگەڵ بازدا هاوڕاز بووم، ئێستا کە پیرم سۆنە ئەگرم، بەڵام ئەو کاتەی جوان بووم من لەگەڵ بازدا ڕاو و شکارم دەکرد، لێرەدا باز کینایەیە بۆ یار.

تـــــەکدا بـــــە تەشاب زەڕنیگارەوە
زوڵفش چون دوود نە دەور ئاتەشپارەوە
سەر بـــــە شەدەی شۆخ بەغدا شارەوە
بـــــــە دیدەی قـــەتران پڕخومارەوە

ئەگەر تەماشای ئەم دوو بەیتە بکەین، دەبینین خانا چەند وێنەی جوانی شۆخەکەی دەکێشێت، چ نەقش و نیگارێك دەکێشێت! خانا لە هۆنراوە دڵدارییەکانیدا هێندە وێنە و نەخش و نیگاری جوانی بۆ دۆستەکەی کێشاوە، ئەگەر نیگارکیشێکی وردی مانی ئاسا

هەبووایە، هەموو ئەوانەی بکردایە بە وێنە، ئەوا هیچی لە تابلۆکانی میشیل ئەنگڵی ئیتالیایی کەمتر نەدەبوو:

دوو دوگمەی یـــاقووت وەنەش دیارە
گرەش چون ئـــەڵماس تاج خونکارە
ناف، ناف ئـــاهووی چەردەی کۆسارە
حەیـــاتبەخش ڕووح موردەی مەزارە
کاف و نـــاف و گەنج نە چەم پێوارە
جایی سم غـــــەزال وەڵگ گوڵنارە
پۆشاکم جــــە کار کول خەبـەردارە
خانـــــا سەناگۆی ئەی سەنەم چـارە

**شیعری نیشتمانی**

لەناو ئەم دیوانە شیعرییەدا، ڕاستەوخۆ هۆنراوەی نیشتمانیی خانا بەرچاو ناکەوێت. تاکوتەرا بەیت بەدی دەکرێت کە باس لە نەتەوە و نیشتمان بکات، ئەویش لەناو داستانی سوڵتان ئیبراهیم و خوسرەو و شیرینەکەی دا بەدی دەکرێت.

شیعری "بای شەماڵ ڕێشەن"یش کە لەم دیوانەدا هەیە، زیاتر شیعری دەستەڵات و ئەو ناوچانایە کە لەژێر دەستەڵاتی خانادا بووە و کەمتر لایەنی نیشتمانیی پێوە دیارە. زیاتر لایەنی ناوچەگەرێتییە.

**بای شەماڵ ڕێشەن، بای شەماڵ ڕێشەن**
**سوفتەی دڵ بە داغ، مـەینەتان ڕێشەن**
**نە یار، نە یاوەر، نە قەوم، نـە خوێشەن**
**کـــەس نەزانان حـــاڵ من چێشەن**

لە سەرەتای ئەم هۆنراوەیەدا ناوچەگەرایی و تایفەگەرایی و دێوانە و شەیدای دەستەڵات و دڵ لەخۆچوون (خۆپەسەندی) باڵ بەسەر شیعرەکەدا دەکێشێت. ئەوەندە نابات خانا دێتە سەرخۆ و وریایانە ئەوە دەستنیشان دەکات کە ئەو تەنها لە ناو قەوم و کەسوکارەکەیدا بەناو بانگ نییە، بەڵکو پیاوێکی نیشتمانی و بەدەستەڵاتە. دەستەڵات و ناوداریی ئەو لەناو ئێران و ڕۆمەکانیشدا دەنگی داوەتەوە.

ئەو پەیامە خۆپەسەندی و خۆگەرایی و تایفەگەراییە دەگوازێتەوە بۆ هەستی نیشتمانی و نەتەوایەتی. نیشتمانپەروەری و نەتەوایەتییەکی خۆماڵی کە هەست دەکرێت ئەم شاعیرە تەنها خۆپەسەند نەبووە، پیاوێکی نیشتمانی و نەتەوایەتی بووە. ئەو پەیامەی کە لەم هۆنراوەیەدا بڵاوی دەکاتەوە، پەیامێکی عامیانەی سادەی خەیاڵاوی نییە، پەیامێکە لە قوڵاییی نیشتیماندۆستیی ناوچەییە و دەیگوازێتەوە بۆ دڵی هەموو دۆست و خزم و کەس و

ئاشناکانی، تا لەو ڕێگەیەوە هەست بە خۆشەویستیی نیشتیمان بکەن. ئەگەرچی ئەو نیشتیمانەش کە خانا باسی لێوە دەکات، نیشتیمانێکی بچووك و بەرتەسکی خێڵەکی بێت، گرنگ ئەوەیە هەموو کەسێك نیشتمانەکەی خۆی خۆش بوێت.

عێل بــــەگی و ڕەشید، میر جـافانم
پــەروەردەی ســای چین، زوڵف کلاٚفانم
بــــەور بـــــالاٚ دەس بـان شێرانم
نــــــــامیدەی ولاٚت ڕۆم و ئێرانم

خانا باس لە ناوچەیەکی بەرتەسکی کوردستان دەکات، ئەویش لەژێر دەستەلاٚتی خۆیدا بووە. واتە پرسەکە باسی کوردستانێکی گەورە و گشتگیر نەبووە.

لەناو ئەم هۆنراوانەی خانادا هۆنراوە و بەیتێکی وەها نابینرێت کە باس لەسەر مەسەلەی نیشتیمانی و خاڵێکی گرنگ بکات، لە یەك دوو بەیتدا باس لە نیشتیمان و نەتەوە هاتووە، ئەو نیشتیمانەش ناوچەیەکی خێڵەکییە، بەلاٚم لەناو داستانی "خوسرەو و شیرین"ەکەیدا پەیامێکی پیرۆزی نیشتیمانی و نەتەوایەتیی زۆر گرنگ بەرچاو دەکەوێت.

## چیرۆکە شیعر

ئاشکرایە کە خانا دەستێکی باڵای لە وەرگێڕانی داستاندا هەیە، داستان نووسینش لای خانا یەکێکە لە شاکارەکان و دەسترەنگینیی خانا لەم کارەدا لە پلەی باڵادایە. ئەو داستانانەی خانا وەری گێڕاون، زیاتر داستانی خۆشەویستییە. گومان لەوەیشدا ناکرێت کە خانا تەواوی شانامەی خوێندووەتەوە، دیوانی سائیبی تەبریزی و جامی و نیزامیی گەنجەویی بە وردی خوێندووەتەوە و تەماشای کردوون، کاریگەریی تەواویان لەسەر خانای قوبادی دروست کردووە، لە ژیان و ڕەوشتی خاناشدا ڕەنگیان داوەتەوە.

ئەم کاریگەرییەی ئەدەبیاتی فارسی لەسەر خانای قوبادی، وای کردووە کە دەست بۆ چەندین شاکاری فارسی ببات و بە شێوەی کوردانە وەریان بگێڕێتە سەر زمانی شیرینی کوردی. کاتێك ئەڵماس خان شانامە وەردەگێڕێت و هەندێك داستان دەنووسێتەوە، خانا دەست بۆ وەرگێڕانی شانامە نابات، بەڵکو خەمسەی نیزامی وەردەگێڕێت. بەشێك لە هۆنراوەکانیشی تەرخان دەکات بۆ چیرۆکە شیعر، یان داستانی شیعریی کورت.

لە مەسنەویدا هەر بەیتێك سەروای جیاوازی هەیە، واتە هەر بەیتێك لەو مەسنەوییە هاوسەروایە.

*------------ *------------
#------------ #------------
^------------ ^------------

ئەم قاڵبە شیعرییە بۆ هۆنراوەی حەماسی، مێژوویی، شانامە و کورتە چیرۆك، پەند (ئەخلاقی)، دەرسی، عاشقانە و عارفانە دەست دەدات. نابێ ئەوەش لەبیر بکەین کە خانا لە هەندێك مەسنەویدا گۆڕانکاری و دەستنەخشانێکی کردووە. خانا قاڵبی شیعریی مەسنەوی و تەرجیع بەندی تێکەڵ کردووە، مەسنەوییەکەی بەسەر چەند بەشێکدا دابەش

کردووه. له کۆتاییی هەر بەندێکدا دوو بەیتی قاڵبی شیعریی تەرجیع بەندی هێناوه. واته قاڵبێکی تازەی شیعریی دروست کردووه.

*------------- *-------------

#------------- #-------------

^------------- ^-------------

&-------------

&-------------

چەنی کیٚ تا سەر ئـــــاخر ئاوەردی؟ کیٚ داخلٚ وە شار خـــامۆش نەکەردی؟

چەنی گشت عالەم شمشێربازیت کەرد ئەوەلٚ تا ئاخـر دەستنەندازیت کـــەرد

بـــەکیٚ نـــەنمانـــای زەوق جەوانی؟ بـــــــەکیٚ ناوەردی شاد پەشیمانی؟

گـەنج داران شاد بین وە گەنج ڕێشان

جام بادەی مەوت، تۆ نۆشای پێـشان

دوو بەیتی کۆتایی دەبێته تەرجیع. ئەوانی پێشووش دەبنه بەند. خانا لەم چیرۆکه شیعریانەدا مێژوومان بۆ دەنووسێتەوە، بەڵام مێژوویەکی کورت و پوخت. سەردەمەکانی مێژوویش دابەش دەکات و هەر یەکەیان له بەشی خۆیدا دەنووسێتەوە، واته: سەردەمی پێشدادی، کەیانی، ئەشکانی و ساسانییەکان هەر له سەرەتاوه دەنووسێت. دواتر مێژووی پەیامبەران و هاوەڵانی پێغەمبەر (د. خ.) دەخاته ڕوو. له کەنار ئەم دوو مێژووەیشدا لایەك له هەندێك کەسایەتیی عارف، خواناس، دیندار و پیاوچاك دەکاتەوە، جگه لەوەش ئاوڕێك له مێژوو و داستانی خۆشەویستی دەداتەوە.

جـــــه نـــــامئـــاوەران شـاهان مازی

بــــــــه حیلەسازی کێت نـــەدا بازی؟

جە شا تـــا قەیسەر، جـە قەیسەر تا میر
قەبزەی مەرگ نە فەرق کێ نەکەردی گیر؟
جـــە پێشانیان تـــــا کـەیانییان
جـــە ئەشکانیان تـــــا ساسانییان
یـــەکایـــەك خـەرقەی رای نیهان پۆشان
بـــــەردت وە مـــاوای شار خـــــامۆشان

لێرەدا سەردەمەکان دەستنیشان دەکات، دوای ئەوە دێتە سەر باسی حەماسی و دەڵێت:

کەیوومەرس کـــــــەی بـەو کردگارەوە
تەهموورس شا بـــــەو بەزم باز شکارەوە
شا جەمشید بـــــەو زەوق نۆشای جامەوە
فەرەیدوون بـــــــەو فەڕ ڕۆی ئەییامەوە
سەلم و توور بـــــــەو سان پێشومارەوە
مەنۆچەر بـــــــــەو قین خەشم و قارەوە

خانا دوای ئەوەی باسی سەردەمەکان دەکات، دێتە سەر ناوی پاشـاکان و هەنـدێك لـە ناوی ئەوانیش دەخاتە ڕوو. کەیوومەرس، یەکێکە لە پاشاکانی کەیانیی ئێـران کـە (٣٠) ساڵ پادشایەتیی کردووە. ئەم پادشایە لەگەڵ لایەنگرانیدا لەناو کێوەکاندا ژیـاوە. ئـاژەڵی وەك پڵنگیـان دەکوشـت و پێـستەکەیان لەبـەر دەکـردن. تـەهموورس چـوارەمین پاشـای پێشدادییەکانە. دەکاتە باوکی جەمـشید، بـە تەهموورسـی دێوبەنـد ناوبـانگی هـەبووە. جەمشید، کوڕی تەهموورسی پێنجەمین پاشای پێشدادییەکان بووە. ئەفسانەکان وای دیاری دەکەن کە (٧٠٠) ساڵ فەرمانڕەوایی کردبێت، هەر وەکو دەڵێن جەژنی نەورۆزی کردووەتە ڕۆژی شادی و سەری ساڵی نوێ.

فەرەیدوون کوڕی ئابتینە، لە نەسڵی جەمشیدە، ناوی دایکی فەرانەك بووە، یەکێکی ترە لە پاشاکانی پێشدادی، بە پلانی کاوەی ئاسنگەر شۆڕشی دژی زووحاك بەرپا کردووە و بووە بە پادشا. سەلم، توور و ئیرەج سێ برا بوون و کوڕی فەرەیدوونن.

مەنۆچەهر (مەنوچەر) کوڕی فەریدوونە، لە نەوەی کچی ئیرەجە، یەکێکە لە پاشاکانی پێشدادی. بۆ تۆڵەسەندنەوەی باپیری (ئیرەج) هێرشی کردە سەر سەلم و توور و تێکیانی شکاند و کوشتنی. ئەم پادشایانە هەر یەکەیان داستان و چیرۆکی خۆیان هەیە. سەبارەت بە باسە حەماسییەکان لەناو مەسنەوییەکانی خانادا، لە چەندین جێگەدا خانا دەڵێت:

ئەردەشیر بەو هەیبەت سوپا و سانەوە
بەو ئیقلیم گیری ڕووی ئەییامەوە!
سام نەریمان بەو سپەرەوە
زاڵ زنجیربەر بەو هونەرەوە
جەنگیزخان بەو چنگ غەزەب بەندەوە
ئەو شاهی جە دەست شاهان سەندەوە
زەوارە بەو زۆر کەتف مشتەوە
چەند پەهڵەوانان بە زۆر کوشتەوە
فلامەرز یەڵ بەو سپەرەوە
جەهانبەخش بەو هەیبەت خیرەسەرەوە
تەیموور بەو کەمان، بەو تیر و سوپەر
دوشمن جە دەستش نمەشی وە بەر
جیهانگیر یەڵ مەرد دلاوەر
جە مەعرەکە و جەنگ، بە وێنەی ئەژدەر

**یـــەکایەك خـەرقەی ڕای نیهان پۆشان**

**بــــــەردت وە مـــاوای شـــار خامۆشان**

ئەردەشێریش یەکێکە لە پادشاکانی بنەماڵەی ساسانی. سام کوڕی نەریمانە، یەکێکە لە پاڵەوانەکانی شانامە و یەکێکیش بووە لـە پیـاوە گـەورە و بـە جەرگـەکانی ئێـران. زاڵ، مەبەست لە زاڵی باوکی ڕۆستەمە، یەکێك بووە لە پاڵەوانەکانی شانامە و جێگای ڕاوێژی شاهانی کەیانی بووە.

لێرەدا خانا لە دەقەکە لادەدات و دەڕواتەوە سـەر مێـژووی مەغۆڵـەکان و ئاوڕێـك لـە جەنگیزخان دەداتەوە. جەنگیزخان، سەرکردەی سوپای مەغۆل بووە، دەستی بەسەر زۆربـەی خاکی ئاسیادا گرتووە. وا پێ دەچێ خانـا جەنگیزخانیـشی لـە ڕیزبەنـدیی پاڵەوانـەکانی شانامەدا زانیبێت.

دوابەدوای ئەمە، خانـا دێتـەوە سـەر باسـی پاڵەوانـەکان، چـەند دانەیـەکی تـر لـە پاڵەوانـەکان بـاس دەکـات. زەوارە کـوڕی زاڵ و بـرای ڕۆسـتەم بـووە و یـەکێکی تـرە لـە پاڵەوانەکانی شانامە. زەوارە لە چەند شەڕێکدا شانبەشـانی ڕۆسـتەمی بـرای بەشـداریی شەڕەکانی ئێران و توران دەکـات. فلامـەرز (فرامـەرز)، کـوڕی ڕۆسـتەمی کـوڕی زاڵـە. جەهانبەخش کوڕی فەرامەرزی کوڕی ڕۆستەمی زاڵە، یەکێکە لە پاڵەوانـەکانی شـانامە. تەیموور، کوڕی برزۆیە و بە تەیمووری شۆخ کەمان بەناوبانگە. جیهانگیر (جەهانگیر) کوڕی فەرامەرزی کوڕی ڕۆستەمی کوڕی زاڵە. ئەمانەیش وەکـو پاڵەوانـەکانی شـانامە باسـیان هاتووە. لە مێژووی ئیسلامیشدا ناوی پەیامبەران و هەندێك جار نازناوەکانیش دێنێت، یان کەسێك چەند نازناوی هەبووە، لە چەند جێگەیەکدا ناویان دەهێنێت:

**داســتان ســــانی: پێغەمبــەران گــشت**

**نەبی و مورسەلان، جوملەی دای بە کوشت**

ئـەوەڵ کـە ئـــــادەم (صـفی الله) بـی
شیس چەنی ئیدریس، نووح دەریــــا بی
هەم ساڵح، هەم هوود، ئیبراهیم خـــەلیل
ڕازی بـی وە زیـبح قـــۆچ ئیـسماعیل
ئیسحاق و یەعقووب عیسا هەم ئەسبات
یووسف و شوعەیب، سیڕ غەیب جە لات
گوستاخیی مـووســـــا، ڕەشیدیی هاروون
یووشەع چەنی نوون، ئەییووب و شەمعوون
هوود و دانیــال، ئــــــەرمیا و حیزقیـل
ئیلیـــاس چـــەنی خـــزر و (ذالکفــل)
یـــوونس و داود، حـــوکم سولــــــەیمان
ڕام کــــەرد ئینس و جن بسەندش دێوان
جەرجیس و شەمعوون، عوزەیر ئـــــەعزام
یەحیا و زەکەریا، عیسا بـن مەریــــــەم
تــا هــــەجر خاتــەم، خـــەتم پێغەمـــەر
یـەعنی محەمـەد شــــــافیع مەحـشەر
یەکایەك بـادەی جــــــام تـۆ نۆشـان
بـەردت وە مـــــــاوای شـار خامۆشـان

خانای قوبادی دێتە سەر باسی داستانی دووەم و بەم شێوەیە ناوی پەیامبەران و هەندێك کەسایەتیی ناودار و پاشا و... دەهێنێت: ئادەم، شیس، ئیدریس، نووح، ساڵح، هوود، ئیبراهیم، ئیسماعیل، ئیسحاق، یەحیا، یەعقووب، عیسا، ئەسبات، یووسف، شوعەیب، مووسا، هاروون، یووشەع، نوون، ئەییووب، شەمعوون، دانیال، ئەرمیا، خزر،

حیزقیل، ئیلیاس، زولکیفل، یوونس، داود، سولەیمان، جەرجیس، عوزەیر، زەکەریا و موحەممەد (د. خ.). خانا ناوی ئەو پەیامبەرانەی ناویان لە قورئان و فەرموودەکاندا هاتووە، دەهێنێت.

هەر لەم بەندەدا خانا دووجار ناوی هوود، عیسا و شەمعوونی بردووە. هەروەکو گوتمان هەندێك جار ناوی خۆی و نازناوەکەشی هێناوە، وەکو عیسا و عیسای بن مریم. لە بەندێکی تردا خانا باس لە سوڵتان، میر، بەگلەر، غوڵام، خزمەتکار و چابوکسواران دەکات. پاشان دەچێتە سەر داستانەکانی خۆشەویستی و ئاوڕیش لە ئەوان دەداتەوە. ناوی فەرهاد، شیرین، زوڵەیخا، خەرامان، هومەیلا و لەیلای عامری دەهێنێت:

کــوا فــەرهاد چــێن کەنــدەی بێــستوون؟
جــە عیــشق شــیرین وێــش کــەردەن زەبــوون
کــــوانێ زلێخــــا گــــەردن شووشــــەی زەڕ؟
جــەمین قــورس خــۆر، بــاڵا چــون عەرعــەر
کــوا جــوانی شــیرین شــۆخ ئەرمــەنی؟
کــــوانێ خــــەرامان نــــازدار چــــینی؟
کــــوانێ هومــــەیلا، لــــەیلای عــــامریی؟
ئــەبرۆ چــون کــەمان، زوڵفــان عەمبــەری

وەکو گوتمان قاڵبی شیعریی مەسنەوی و تەرجیع بەندی تێکەڵ کردووە. خانا کۆتـاییی هەموو بەندەکانیشی بەم بەیتە کۆتایی پێ هێناوە، بەیتی کۆتاییش پێی دەڵێن تەرجیع:

یەکایــەك بــــادەی جــــام تــۆ نۆشــان
بــــەردت وە مــــاوای شــار خامۆشــان

خانا له یەك مەسنەویدا چەندین خاڵ له قاڵبی شیعری مەسنەویدا کۆ دەکاتەوە و لە یەك قاڵبی شیعریی تایبەتیدا دەیان خاتە بەردەست لێکۆڵەرانی مێژووی ئەدەبی کوردی. نابێ ئەوەش لە یاد بکەین کە خانا ئەم کورتەچیرۆکەی لەژێر کاریگەریی چیرۆکە شیعریی شیعرێکی ڕەزا خانی باوکی ئەڵماس خاندا نووسیوە. هەروەها خانا له چەند مەسنەوییەکدا و بە دەستکاری و قاڵبی شیعری تایبەتییەوە ئەم کارانەی ئەنجام داوە.

خانا وردتر و جوانتر کاری لەسەر کردوون، تەنها بە لاساییەکی سادەوە کارەکەی نەکردووە، بگرە بە شێوەیەك دەستڕەنگینیی خۆی تێدا بەکار هێناوە، هەست دەکرێت کە خانا پێشتر ئەم شاکارەی نووسیوە، یان گومان دەکرێت کە باوکی ئەڵماس خان پێشتر ئەم شاکارەی نووسیوە، ئەگەر ساڵی لەدایکبوون و مردن و سەردەمیان نەزانرێت، وا دەزانرێت کێبڕکێی شیعری بووە یان هەر یەك شیعرن. ڕەزا خانیش لە چیرۆکە شیعرییەکەیدا دەڵێت:

وە وانای تەورات، مووسا نە توورت
وە لەحن داود، ئایەی زەبوورت
وە سەحیفەی سوحف، زانۆ ئیبراهیمت
نار نەمروود کەرد وە ڕەوزەی نەعیم
بەو عەزەمەتی فورقان عەزیم
ئەبجەد تا سوورەی ئەلف و لام و میم
بە نەوحەی نووحت، وە شین شیست
بەو مەدرەسەی دەرس، عیلم ئیدریست
وە زەجر جەرجیس، وە حوکم حووتت
وە نەرمیی حەدید، نەجد داودت
بەو حیفزی یوونس، ژە بەتن حووتت
زیکر زەکەریا، زاهیری لووتت

بــەو ســـەبر دادەی، بــەڵای ئــەییووبت
وە بـــەیتلحوزن، مـــەئوای یـــەعقووبت
بەو وەعـــدەی ســدیق، ئـــەموات ئـــەحیات
بەو لیقـــای یووســف، وە حـــەیای حــەیات

خاناش چەند پارەچە شیعرێکی لەم بابەتەی هەیە، دەڵێت:

ئـــەوەڵ کـــە ئـــادەم (صـــفی الله) بـــی
شیس چەنی ئیـــدریس، نـــووح دەریـــا بـــی
هەم ساڵح، هەم هوود، ئیـــبراهیم خـــەلیل
ڕازی بـــی وە زیـــبح قـــۆچ ئیـــسماعیل
ئیسحاق و یەعقووب، عیسا هەم ئەسبات
یووسف و شوعـەیب، سیڕ غـەیب جە لات
گوستاخیی مووســا، ڕەشـیدیی هـاروون
یووشەع چەنی نوون، ئەییووب و شەمعوون
هـــوود و دانیـــال، ئـــەرمیا و حیزقیـــل
ئیلیـــاس چـــەنی خـــزر و (ذالکفـــل)
یـــوونس و داود، حـــوکم ســـولەیمان
ڕام کەرد ئینس و جـن بـسەندش دێـوان
جەرجیس و شەمعوون، عـوزەیر ئـەعزەم
یـەحیا و زەکـەریا، عیـسا بـن مەریـەم
تـــا هیجـــر خاتـــەم، خـــەتم پێغەمـــەر
یـــەعنی موحەمـــەد شـــافیع مەحـــشەر

یەکایـــەك بـــادەی جـــام تـــۆ نۆشـــان
بـــەردت وە مـــاوای شـــار خامۆشـــان

ئەگەر تەماشای ئەم دوو مەسنەوییەی ڕەزا خانی باوکی ئەڵماس خان و خانای قوبادی بکەین، ئاشکرایە کە زۆر لە یەك دەچن. وا دێتە پێش چاوان کە هەردووکیان کێبڕکێیان کردبێت، یا لە ژێر کاریگەریی یەکتردا نووسیبێتیان. لە هۆنراوەیەکی تردا خانا دەڵێت:

کوانێ ئیمامـــــان ڕەهبـــەر نـە ڕای دین؟
کۆن مووسای کـــــەلیم گوزیدەی یـەقین؟
کۆن ڕەنگ ڕەونـــەق یووسف کـــەنعان؟
کـــۆن دێوان دێو، حوکـــم سولـــەیمان؟
کۆن شوعەیب و شیس، عیسای بن مەریەم؟
کۆن (خلیل الله)، جـــەرجیس و ئـــادەم؟
کۆن سەدای تەکبیر نـــەعرەتەی حـەیدەر؟
کـــــوانێ (ذوالفقار) بڕنــــدەی دووسەر
کۆن نـــام و نیشان، ئـــەحمەد و مەحموود
کۆن نوور ســــەدای سوب نـــەغمەی داود
کۆن حـــەسەن، حوسێن ئـــال پێغەمبەر؟
کـۆن چـــوار یـــــاران ڕەسوول سەروەر؟

هەر یەکێك لەو ناوانە (شیس، ئەیووی، ئیبراهیم، جەرجیس، ئادەم، زولفەقار و ئەحمەد...) مێژوو و چیرۆکی ژیانی تایبەتیی خۆیان هەیە لە مێژووی ئیسلامدا. خوێنەر بۆ ئەوەی زانیاریی لەسەر ئەم کەسایەتی و ناوانە هەبێت، دەبێت بگەڕێتە بۆ مێژووی گشتی (ئایینی، نیشتمانی، جوگرافیایی، سیاسی و مێژوویی...) تا لەو ڕێگەیەوە بتوانێت سەبارەت بەم کەسایەتییانە چیرۆك و سەرگوزەشتەی ژیانیان بەدەست بهێنێت و بزانێت.

تەواوی ئەو پرسانەی خانای قوبادی لە شێوازی داستانبێژیدا هێناویەتی، ڕۆشنبیری و فەرهەنگی کوردیی پێ دەوڵەمەند کردووە. تەواوی ئەو شێوازەی خانا، هەم هەواڵی و هەمیش سەرسوڕمانییە، جگە لەوەیش مەعریفەیەکی وەها دەدات بە دەست خوێنەرەوە کە بە دووی ڕۆشنبیریی گشتیدا بگەڕێت. ئەم کەسایەتییانەی خانا باسیان دەکات، هەم تراژیدی و هەم کۆمەڵایەتی و مێژوویی و ئایینی و عاشقانەن. ئەگەر تەواویان لەناو پاشخانی ڕۆشنبیریی ئەو کاتەدا وجوودیان نەبوویێت، ئەوا بەشێکیان وجوودی هەبووە و خانا دەیان وروژێنێتەوە.

## خانا و تەرجیع بەند

لە دیوانی خانای قوبادیدا چەندین تەرجیع بەند بەرچاو دەکەوێت، وەك: حەوت تەرجیع بەند، داستان لە شێوەی تەرجیع بەند، نامەی شیعری لە شێوەی تەرجیع بەند... ئەگەرچی تەرجیع بەند قاڵبێکی تایبەتی خۆی هەیە لە شیعری عەرەبی، فارسی، تورکی و کوردیدا، بەڵام لەلای خانای قوبادی و لە شێوەزاری گۆرانیدا ئەم قاڵبە گۆڕانی بەسەردا هاتووە.

ئەم قاڵبە شیعرییە بریتییە لە غەزەلانێك کە هاوکێشن و لە سەروادا جیاوازن، نیوەبەیتی یەکەم و دووەم هاووکێش و سەروان، سەروای نیوەبەیتی دووەمی هەر بەیتێك لەگەڵ سەروای بەیتی یەکەمدا هاوکێش و سەروان. بەیتی کۆتاییی هەر بەندێکیش کە (تەرجیع)ە وەکو بەیتی یەکەم هاوسەروایە.

تەرجیع، وشەیەکی عەرەبییە، کوردییەکەی دەبێتە گەڕانەوە. شایانی باشە شێوەیەك لەم تەرجیعە ئێستا لە شیعری ئازادیشدا وجوودی هەیە و تا ئەو ئەندازەیەی ئێمە ئاگاداری بین، ئەم شێوەیە لە شیعرەکانی فەیلەسووف و ئەدیبی ئەڵمانی، نیچەدا زۆر بە زەقی پیادە کراوە و هەیە.

| | |
|---|---|
| ❊--------------- | ❊--------------- |
| --------------- | ❊--------------- |
| --------------- | ❊--------------- |
| --------------- | ❊--------------- |

❊---------------

❊---------------

ئەم قاڵبە شیعرییە لەلای خانای قوبادی بە چەند شێوەیەك هاتووە. واتە بە شێوەی قاڵبی تایبەتی قاڵبە شیعرییەکە هاتووە، بەڵام لەسەر کێشی دە بڕگەیی.

قــــەدیم موتلــەق، قـــــەدیم موتلــەق!
یا قـــایم بـــە زات قـــەدیم موتلەق!
حـــــەیی بێزەواڵ، قـــەییووم بەرحەق!
نیگارندەی نەقش نـــۆ تـــــاق ئەزرەق!
لاهووت، بێشەریك، بینـــــای بێمانـــەند!
یەکتای بێنەزیر، بێمیسل و پـــــــەیوەند!
(واجــب الـــوجــود لا احصی ثنــــا)
مونـــەززەه جـە عەیب، عاری جە مەنــــا!
مونشیی ڕەقەمسەنج، ئینشای شادی و زەوق
بێپەروا جە تەعن، ئەشیای تەحت و فـەوق!
بـــــەخشندەی بزورگ، بێبــــاك جـە تانە
نـــــازکێش زومرەی خوێش و بێگانـــــە!
بۆ بەشق ئـەو شا، بێ حـــــەد سیفاتـــــەن
بــــاعیس ئیجاد گشت مەخلووقاتـــەن
بــــاجــــەتی ســـەیید (ختم المرسلین)
شای (قــــــاب قوسین)، (رب العالمین)!
بـــــە حەقق ئەربـــــاب شەوزیندەداران
بـــــە ئیخلاس پـــــاك تـاعەتگوزاران
(خانـــــای قوبـــــادی) مەعسییەت بارەن
فریفتەی شەیتــــان شووم بـــــەدکارەن

جــــــه فيتنەی شەيتـــان شەيتەنەت پيشە
جە شوومی، ئەی نـەفس، دوور جە ئەندێشە
تـــــــا (يوم الممات) نيگاهداريش کەرا
عيلاج دەردان شەرمەساريش کـــــــەرا
پـــــەی چێش؟ نافەرمان شێت و مەغروورەن
چون بێدەوڵــــەتان جـــە تاعەت دوورەن
مەگـــەر هەم بــــــە ڕەحم چون تۆ ڕەحيمێ
(عميم الاحسان)، عــەتـــــا عـــــەزيمێ
ببۆ بـه ئيخلاس گونــــــاکاريی ئــــــەو
ئـــــەی کـەم خدمەتی و شەرمەساريی ئەو
وەرنـــــــه بـــــــەزاتت جـــەلای زات تۆ
مەکەرۆن ڕۆی حـــــــەشر، من شکات تـۆ!

لە شێوەزاری گۆرانیدا کێشی شیعری دە بڕگەیی، سەرەتای نیوەبەیتی یەکەم بەم شێوەیە دەست پیێ دەکات:

قەديم موتڵەق، قەديم موتڵەق
يا قايم بە زات، قەديم موتڵەق

هەر بەیتێکیش قافییەی جیاوازی خۆی هەیە، واتە لە شێوەی غەزەلدا نییە کە بەیتی یەکەم هاووەزن و قافییە بێت.

هەروەها سەروای بەیتەکانی تر کە بە دوايدا دێن، واتە: سەروای نیوەبەیتی یەکەم وشەیەك بێت و سەروای نیوەبەیتی دووەمی هەموو بەیتەکانی تری هاوسەروایە. بەیتی تەرجیعەکەیش هاوسەروایە. لە قاڵبی شیعری دە بڕگەییدا نیوەبەیتی یەکەم دابەش دەبێت بەسەر دوو بەشدا و هەر بەشێك پێنج بڕگەیە. لە نیوەبەیتی یەکەمدا پێنج بڕگەی یەکەم

لە پێنج بڕگەی دووەمدا دووبارە دەبێتەوە. لەنیوەبەیتی دووەمیشدا پێنج بڕگەی سێیەم جیاوازە، پێنج بڕگەی چوارەم وەکو پێنج بڕگەی یەکەم و دووەمە.

**قەدیم موتلـەق (٥ بڕگەی ١) قەدیم موتلەق! (٥ بڕگەی ٢)**

**یا قایم بە زات (٥ بڕگەی ٣) قەدیم موتلەق! (٥ بڕگەی ٤)**

نابێ ئەوەش لە یاد بکرێت کە ئەم قالبە چەسپێنراو نییە و مەرج نییە سەرەتای هەموو بەندەکان بەم شێوەیە بێت. هەروەها مەرجیش نییە سەرەتای هەر بەیتێك لە قالبی کێشی دە بڕگەییدا بەم شێوەیە دابەش ببێت. واتە پێنج بڕگەی یەکەم و دووەم و چوارەم وەکو یەك بێت و پێنجەمی سێیەم جیاواز بێت. وەکو ئەم بەیتەی مەولەوی کە جیاوازە:

**نەوبارەی خـەیاڵ مـەحرووم دانا**

**ڕەدیف لەتیف زەریف خـانـــا**

ئەوەی گرنگە لێرەدا بیڵێم خانا لە حەوت تەرجیع بەندەکەیدا، لە هەموو بەندەکانی حەوت بەندەکەدا تەخەلّوسی خۆی هێناوە. لە هەندێك تەرجیع بەندی تریشدا ئەمەی کردووە. لە هەندێکی تردا ئەم کارەی تەنها لە کۆتاییەوە ئەنجام داوە، واتە تەنها لە بەیتی کۆتایی یا پێش کۆتایی بە جارێك یا دوو جار تەخەلّوسی خۆی هێناوە.

لە قالبی شیعری گۆرانیدا گوتمان هەردوو نیوەبەیتەکان هاوقافییەن. بەیتەکانی بەندەکەش هەموویان دوابەدوای یەك هاوقافییەن و تا بەیتی پێش تەرجیع ئەم کارە دەڕوات. بەیتی تەرجیعەکەش لە کۆتاییی هەر بەندێکدا وەکو یەکن.

**وەرنە بـــــە زاتت جـــــەلای زات تۆ**

**مـەکەرێن ڕێی حەشر، من شکات تۆ!**

ئەم قاڵبە شیعرییە (تەرجیع بەند) زیاتر بۆ شیعری عارفانە و عاشقانەیە. هەموو بەندەکانیش پێکەوە یەکیەتیی بابەتیان تێدایە. ئەم بابەتەیش زیاتر بۆ پێداهەڵدان و وەسف و عیشق و عیرفانە.

ئەم تەرجیع بەندە لای خانا ئەگەرچی هەندێك گۆڕانکاریی بەسەر لایەنەکانی بڕگە و شێوەی قاڵب و سەرواکەدا هاتووە، بەڵام لە تایبەتمەندیی "یەکیەتیی بابەت" لای نەداوە. بابەتەکەش لە بابەتی عیشق، خواناسی و عیرفانە. سەبارەت بە تەرجیعیش هەڵگەڕانەوەیە بۆ بابەتەکە.

یـــــا ڕەب من بـەندەی نافەرمان تۆم!
بێپەروا جـــــە فیعل عیسیان بێشۆم
حەییی لاشەریك فـــــەرد فەریادڕەس
کەریم کارساز پـــــەی بێکەسان کەس
چون من گونابـــــار مەینەت بە کۆیی
چون تۆ بەخشندەی کەرەم بێشۆیی
چون من شەرمەسار شووم بـــــەدکاری
چون تۆ کـــــــــەرەمدار نیکۆ کرداری
چون من نـــــــافەرمان، خەتا عەزیمی
چون تۆ ساحێب ڕەحم فـــــەرد ڕەحیمی
چون من ڕووسیای جـــە تاعەت دووری
چون تۆ پادشای فـــــــەرد غەفووری
سەوگەند بە زاتت، یـــــەکتای یەگانە!
نییەن نــــــــە عەرسەی دەور زەمانە

مەعلوومەن جـــە لات حەییی تەوانا!
قەییووم قـــــائیم، قـــــەدیم دانا!
جەو پەی جـــە عیسیان دلێریم کەردەن
تەقسیرم جـــــە حەد حیساب وییەردەن
ئەر ئەی فیدات بـــام نامت غەففارەن
بەخشندەگی و عـــەفوو تۆ بێشومارەن
(یـــــا عظیم العفو، لا أحصی ثنا)
ئـــــەر تۆ بـــە تاعەت ببەخشی گونا
ئەمرت موتاعەن حوکم هەر حوکم تۆن
بەڵێ فیدات بـــام سا عەتای تۆ کۆن؟
من ئومێدم هەن جــــە تاعەی کوبرا
بە ئەڵتاف وێت بیێ بـــــــەیع و شەرا
خانای خەم خەیاڵ خـاترشاد کـــــەری
جە عەرسەی مەحشەر سەرئـازاد کەری
وەرنە بــــە زاتت جــــە لای زات تۆ
مەکـــەرۆن ڕۆی حەشر، من شکات تۆ

ئەمەش بەندی دووەم. دەبینین یەکیەتیی بابەتی پاراستووە. بابەتەکەش بابەتی خواناسی و پێداهەڵگوتن و وەسفە. لە گەڕانەوەدا دێتەوە سەر ئەوەی ئەگەرنا خودایە سوێند بە زاتی خۆت لە ڕۆژی دواییدا لەلای زاتی پاکی خۆت شکایەت دەکەم، لە کۆتایی هەر بەندێکیشدا ئەم گەڕانەوەیە ئەنجام دەدات.

لە تەرجیع بەندێکی تردا، گۆڕانکارییەکی بێوێنە ئەنجام دەدات، ئەویش تەرجیع بەندێکی تازە دروست دەکات و لەناو تەرجیع بەندەکەدا قاڵبی گفتوگۆ هەیە. ئەم شێوەیە ئەگەرچی لەوانەیە تازە نەبێت، بەڵام تا ئێستا من بەرچاوم نەکەوتووە. هەر وەکو لە پێشەوەدا باسی بەیتی یەکەم و دابەشبوونی بەیتی یەکەمم بەسەر چوار بەشدا کرد، لێرەشدا هەمان شێوەیە، بەڵام لەم بەندانەدا خانا بابەتێکی تازە باس دەکات، بابەتەکەش بە ناوی "نیاز و خانە" هەر بەندێك تایبەتە بە یەك کەس، واتە بەندی یەکەم تایبەتە بە "نیاز" و بەندی دووەمیش تایبەتە بە "خانا"، بەندی یەکەم دابەش بووە بەسەر چوار بەشدا و نیاز دەستپێشخەرە، خاناش هەمان کار دووبارە دەکاتەوە. لە بەندەکانی تردا ئەم کارە بە شێوەی سەربەخۆ دەڕوات و دابەشکردنی تێدا نییە.

**نیازوات:**

**زەریف خـــەندەوە، زەریف خەندەوە**
**زەریفی زەریف هـــا بەو خەندەوە**
**یەکش باف زەڕین گرت و چەندەوە**
**خەنە هـــا وە لای زەڕڕەی قەندەوە**

**خانە وات:**

**شیرین خـــەندەوە، شیرین خەندەوە**
**شیرینی شیرین هـــا بۆ خەندەوە**
**دەست خەناڕەنگ گرت وە چەنـــەوە**
**خاس خەنە کەردی هەم بە خەنەوە**

دەتوانین بۆ ئەم قاڵبە شیعرییە دوو ناو دابنێین: تەرجیع بەند و تەرکیب بەند. چونکە ئەم دوو قاڵبە شیعرییە زۆر لە یەکەوە نزیکن. لە تەرجیعیشدا تەنها نیوەبەیتی دووەمی

هەموو بەندەکان وەکو یەکن. دەبینین خانا گۆڕانکاریی زۆری بەسەر قاڵبە شیعرییەکاندا هێناوە. ئەم گۆڕانکارییانەش ئاماژەی دەسترەنگینی و ورت و ورياییی خانان.

لە حەوت تەرجیع بەندەکەدا ئەندێشەیەکی فراوان و فکرێکی وەهای بەیان کردووە کە لە چەندین شێوە و قەبارە و لایەندا خوێنەر لێی ڕامێنێت. ئەو ئەسپ تاودانانەی خانا وای لە خوێنەران و لێکۆڵەرانی شیعر کردووە کە زیاتر ورد ببنەوە و کۆشش بکەن بۆ ئەوەی بگەن بە خاڵێك لە هۆنراوەی ئەودا کە پێشتر کاری لەسەر نەکرابێت و بە بایەخەوە تەماشای بەرهەمەکانی بکرێت.

کاتێك تەرجیع بەندەکانی خانا دەخوێنیتەوە، هەست دەکەی ئەم پیاوە عەرەبیزان و فارسیزانێکی تەواو بووە، لە بواری شەریعەت و زانستەکانی قورئان و لایەنەکانی زمانی عەرەبی و فارسیدا تەواو شارەزا بووە، بە شێوەیەك لە هەر جێگەیەکدا تووشی چەڵەمەیەك بووبێت، توانیویەتی بە شێوەیەك چارەسەری بکات کە خوێنەر لەو ڕێگەیەدا سەرگوم بکات و ناچاری بکات تێی ڕامێنێ، وەکو لە حەوت تەرجیع بەندەکەیدا وای لە خوێنەری خۆی کردووە بڵێن خانا تەکفیر کراوە. خانا ویستوویەتی مێشکی پەنگ خواردووی ئەو خەڵکانەی تەنها لە یەك قاڵبدا وەستاون و ناجوڵێنەوە، بخاتە جووڵە و گۆمی نەجووڵاوی ئەو کۆمەڵگایە بەم شێوەیە بخاتە شڵەژان و بەهۆشی خۆیان بهێنێتەوە، ئەمەیش لە زانایی و داناییی خانادا بووە و وای کردووە خەڵکانی دوای خۆی بەو شێوەیە گومان لە خانا بکەن.

(واجب الـوجـود لا احصی ثنـــــــــا)
مونـــــەززەھ جـــە عەیب، عاری جە مەنـا!
مونشیی ڕەقەمسەنج، ئینشای شادی و زەوق
بێپەروا جـە تەعن، ئەشیای تەحت و فەوق!

پەند و ئامۆژگاری، عاشق و مەعشوق، خواناسی و عیرفان و ڕەخنە، لە شێوەی تەرجیع بەند و تەرکیب بەند و گفتوگۆدا دەهۆنێتەوە. هەر کەسێك بیەوێ لەسەری بدوێت، دەبێ شارەزاییەکی باشی هەبێت لە مێژوو و ئایین و ڕەمزەکانی خوداناسی و عیرفان و عیشق. هەروها لە شیعری "دڵ بییەن سەر شار"دا دەڵێت:

دڵ بییـــەن سەرشار، دڵ بییـــەن سەرشار
دڵ بییەن جـــە جام، مەعسییەت سەرشار
کــــــەس نییەن چون من خـــاتی خەتابار
عیبرەت لێم گرتەن تـــــــائیفەی کوففار
(یــــــا دائم الفضل)، ڕەحمەت بێشومار!
(إحفظني بـــالفضل، من عذاب النـــار)!

لەم تەرکیب بەند و تەرجیع بەندەدا، خانا قاڵبێکی شیعریی دروست کردووە بێ ئەوەی لە یەکێتیی بابەت لابدات. جوانکاری و ڕەوانبێژی و دەسترەنگینیی خانا لە قاڵبەکەدا بە شێوەیەکە هەست دەکەیت تەرجیع بەندە، بەڵام کاتێك سەرنج بە لای تەرکیب بەندا دەدەیت، دەڵێیت هۆنراوەکە بە تەواوی تەرکیب بەندە و هیچی دی. بەم پێیە تێڕامان لە قاڵبەکە لە پێش هەموویەتی، بابەتیبوون و ڕەوانبێژی و جوانکاری و خۆشکاندەوەی خۆیشی بۆ خۆی بابەتی تێڕامانێکی دیکەیە. خانا زۆر بە جوانی و بە شێوەیەکی ناوازە کارەکەی کردووە، هەروەها لەم تەرجیع بەندەدا جوانکاری و تێکهەڵکێش و لێوەرگرتن (اقتباس)ێکی ناسکی کردووە کە لە ناو هۆنراوەی نیاز و خانەیشدا ئەم جۆرە داهێنانانە بە شێوەیەکی کوردانە و ناوازە دەردەکەوێت.

**نامەی شیعری**

لە باسی هاوڕێکانی خانا و مەعشووقەکەیدا باسی هەندێك نامە و شیعرەکانی خانامان کرد، لێرەدا بە کورتی باسێکی تری لێوە دەکەین.

خانا لەگەڵ مەعشووقەکەیدا نامەی گۆڕیوەتەوە، کاتێك کە زوڵەیخا نامەی بۆ خانا ناردووە و خانا وەڵامی داوەتەوە، یەکێك لەو دۆستانەی تر کە خانا وەڵامی داوەتەوە، میرزا شەفیعی کولیاییە. ئەم سێ کەسە ئەوەندە ڕۆشنبیر و فیکر کراوە بوون، لەناو نامەکاندا جگە لەوەی لایەنی عاشق و مەعشووق باس کراوە، لایەنی برایەتی و مەحەببەت و ڕۆشنبیرییش باس کراوە.

لە نێوان خانا و میرزا شەفیعی کولیاییدا چەندین نامەی جوانی دۆستانە هەیە. نامەکان پڕاوپڕن لە بۆن و بەرامەی دۆستایەتی و مەحەببەت، تك تك گیانی برایەتی و خۆشەویستییان لێ دەتکێت و لە ناو قوڵاییی دڵەوە وشەکان دەرهاتوون، میرزا شەفیعیش لە وەڵامی نامەیەکی خانای قوبادیدا هۆنراوەیەك دەنووسێت و دەڵێت:

خانای جامی خوو، خانای جامی خوو!
خانای خاسخەیاڵ، دانای جامی خـوو!

خاناش لە وەڵامی میرزا شەفیعی کولیاییدا دەڵێت:

میزام خـــوارییەن، میزام خوارییەن
ئـــــاخر سەرمایـەی پیری خوارییەن
پێشەش ئـــاهی سەرد شین و زارییەن
مایـــەی بێقـەدری و کەفتەکارییەن
سەرمایـــەی ســـــەودای بازاڕ پیری
هەر ئـــــاخ و داخەن ئەندۆ و زویری

هێما تــۆ خـــــاسى بەحر مەعانى
قـــــەدرى عافييەت ئەوسا مەزانى

خانا لە کۆتاییدا بەم شێوە وەسفی میرزا شەفیعی کولیایی دەکات:

پــەى میرزا شەفیع براى خۆشکـــەلام
خانـــا پەرێش وات: بـــاقى وەسسەلام

لە نامەیەکی تردا میرزا شەفیع بۆ خانا دەنووسێت:

ئیختیار وێش بـــــــە وێش نـــــەمەندەن
عەقڵ و هۆش یەکسەر جە دەستش سەندەن
غولوو سەرکەردەن جـــــە بیاوانـــــــان
مەنشوور نامەى جـــەورت مەوانـــــــان
نەهەنگان مەجـــــەر، شێران جـــە هامۆن
ئینتیهاش زەلیل، حـــــــەڵقەى دام تـــۆن
هــــــەزاران عوسرەت نیگاهشــــانــــەن
هەزار چـــــون شــــەفیع، غوڵامشانـــــەن

خاناش لە وەڵامی ئەم دۆستە گیانی بە گیانییەیدا دەڵێت:

شـــــەفیع شیفتە، براى هـــــامفەردم
گۆش دەر وە موفـاد خـــــاتیمەى دەردم
حەیفەن پەى تۆ چـون، زى فـەزڵ فەزڵان
حەزین بۆ جـــە دەس بەعزێ بـەدئەسڵان
خـانــــــا چون تۆ پیر، تۆ پیر چون خانـا
هــــەر دوو خـــــاك پـــــاى پیران دانا

ئەم نامانەی لە نێوان میرزا شەفیع و خانادا پڕاوپڕن لە هەست و نەستی برایەتی و هەستێك کە پێناسەیەکی دیاریکراوی نییە. ئەگەر تەماشای نامەکانی میرزا شەفیع بکەین و تۆزێك نیگەرانییان تێدا بەدی بکرێت، دەبینین خانا ئومێدی بە میرزا شەفیع بەخشیوە، بە پێچەوانەشەوە ڕاستە. ئەگەر میرزا شەفیع لە پیری نیگەران بووبێت و تەواو بێزار بووبێت لە دەست پیری و ئازار و مەینەتی، ئەوا خانا ئامۆژگاریی دەکات و ئومێدی دواڕۆژی پێ دەبەخشێت کە دواڕۆژی گەشە. پێی دەڵێت: کە شانازی بە پیرییەوە بکە، چونکە پیری جێگای شانازییە و هەموو پیاوە دانا و گەورەکان بە پیرێتی سەریان ناوەتەوە، شانازییان بەو پیرییەوە کردووە، تۆش شانازیی پێوە بکە. ئەمەش بە پێچەوانەوە ڕاستە.

## خانا و پیری

نالاَندن بە دەست دەرد و میحنەت، یان جودایی مەعشووق و جەوری زەمانەوە، تەواوی ئەدەبی نەتەوە جۆراوجۆرەکانی تەنیوە، بە تایبەتیش نالاَندن بە دەست پیرییەوە کە بۆ خۆی بیٚ خەم و کەسەر نییە. لای هەندێك مایەی نەنگییە و لای هەندێکی تریش مەقامی پیاوچاکانە، پلە و پایەی پیر بە هەموو کەسێك نەدراوە.

زۆربەی شاعیران کاتێك نیشانەی پیری لە جەستەیاندا دەردەکەوێت، دەست دەکەن بە نالّە و فیغان. پیری و نیشانەکانی پیری لای خانا جۆرێکی ترە. خانا شانازی بە پیری و نیشانەکانییەوە دەکات، بەلاّم میرزا شەفیع پێچەوانەی خانا بیری کردووەتەوە. خانا ئومێدی بە پیری هەیە و میرزا شەفیع عەسا و کەشکۆلّ دەدات بە شاندا.

دەروێشیمانەن، دەروێشیمانەن!
میرزام ئەساسەی دەروێشیمانەن!
کەسیٚ نەواچی جە وەشیمانەن
جە تاوشت دەرد دلّرێشیمانەن
ئیرادەم کەردەن بشۆن وە شاران
هیممەت بوازۆ جە تەکیەداران
ئەللّا دۆس کەرۆن جە شای دەروێشان
ئیحسان کەران پێم کیسوەتی وێشان
تاج دەروێشی خەرقەی عیبادەت
جام جلّ کلید سەنگ قەناعەت
موهر و موهرەبەند، حەلّقەی زوننار کێش
جل بەندی جزوان دەروێشان پێش

**لۆنگ و شاڵ، دەستماڵ کەمەربەند، زەنجیر**
**بەند شێر، قوڵلاب، ڕشتەی شاخ نـــەفیر**
**عەسای بـــــادەم چـــۆ خرخـاڵان قۆڵ**
**جبەی یــــــەقەدرێز کەڵپۆس و کەشکۆڵ**

خاناش بەم شێوە وەڵامی میرزا شەفیع دەداتەوە:

**میرزام یـــە چێشەن، میرزام یـــــە چێشەن؟!**
**ئەز دڵڕێشی بــــرام نـــــــە چێشـــەن؟!**
**پـــــــەی ماڵ دنیا خـــــــاترت ڕێشەن؟!**
**ڕاس واچە جــــــە لام مـەلوولیت چێشەن؟!**
**ئـــــەی دەم و دەستگای دەروێشیت چێشەن؟!**
**ئـــــەی گەشت و گوزار، دڵ ڕێشیت چێشەن؟!**
**پـــــەی چێش مەگێڵی پەی فریشتەی وێت؟!**
**پـــەی چێش وێت کەردەن وە ئەبڵەی سەرشێت؟!**

لەم نامەیەدا وەڵامی میرزا شەفیع بەوە دەداتەوە ئەم هاتوهاوارەی لەبەر چییە و بۆچی وەها دڵگران بووە؟ دەبێ پیر بیکەیتەوە و چاوێك لەوانەی پێشوو بکەیت، هەر لەکۆنی کۆنەوە و شای مەردان و کەیقوباد و هەموویان پیر بوون و گەیشتوون بەو قۆناغە، خانا زۆر جوان بیری لە پیری و نیشانەکانی پیری کردووەتەوە. هەوڵیشی داوە دۆستەکانی وەکو خۆی بە وردی و جوانی لە پیری و نیشانە و قۆناغەکانی پیری بڕوانن. بە جوانییش ڕێزی لێ بگرن.

**شــــــەفیع شــاعیر، نیزامی سیفەت**
**موجری مەعـــــــانی کان مەعریفـــەت**

برای بڵند قەدر، دانـــــای گەوهەر ڕێز
لاڵ بەخش قەید، بــــــە وێنەی پەروێز
میرزای موعتەبــەر مەرتەبەی عـــالی
مودیر مەحـــزەر مـــەخسووسەی والی
موونشی بـــاشی باش، خاسەی سەرتەلاّن
موستەوفیی دیوان خـــــان ئەردەلاّن
چەند خۆشنویسان وێت ئاسای ڕووی دەور
شیرین کەلامان، شیرین تـــــەرز و تـەور
مەعلومات بێ شۆ، موعتەبەر مەشهوور
مەعریفەت مـــانیع بە دانش مەغروور
ئیفلاتوون فامـــان ئـــــەرستۆ دەستوور
لوقمان لوقمانان، نـــە خاك بین مەستوور
ئەوان نەیان کرد دونیا تـــــەمـــامە
میرزام گێڵیای دەور دونیـــــای تۆ کامە؟!

لە چەند پارچە شیعرێکی تریشدا ئەمە بەرچاو دەکەوێت. بەڵام نابێ ئەوەش لە یاد بکەین کاتێك کە خانا تەواو پیر دەبێت، ئازار و مەینەتی زۆری بۆ دەهێنێت، بەم شێوەیە هاوار لە دەست پیری دەکات:

خانـــا فکرت کەر، ئـــەی خەیاڵ خامەن
(مَلك الموت) ئـــــامان کارت تەمامەن
ئەر مەردەی مــــەزار بـــەیۆ وە بیسات
تۆیش مەشی وە نرخ جـــەوانی ئەوسات

گلەییت جە دەس چـــــەرخ گەردوونەن
فـــائیدەش نییەن فکرت زەبوونــــــەن
دوعـــــای خـــاتیمەی حوسنای ئەبەدی
بکـــــەر جــــــە دەرگای دانـای سەمەدی
عـــاقیبەت خـــەیری پـەی پیری خاسەن
جە دەرگای خودا ئومێد هــــەر پـاسەن
کەرۆم وە توفەیل موستەفـــــای مورسەڵ
جە هەردوو دنیا هـــەر ئـــــەوەن ئەفزەڵ
یە خانـــــا واتــــەن بـــــــە دڵ زەویری
هانـــــاشەن جــــــە دەس ماجەرای پیری

هاتوهاوار لە دەست پیری، بەڵام عاقیبەتخێری بۆ هەردوو دونیا باشە. ئومێدیش لەلای خوداوەیە و خودا ئومێد بەخشە و کەس بێئومێد ناکات. بێتاقەتی و نارەحەتیی پیری وای لە خانای قوبادی کردووە بڵێت هانا و هاوارمە لە دەسەت داستان و بەسەرهاتەکانی پیری. لە جێگەیەکی تردا بۆ میرزا شەفیع دەنووسێت:

خانا چون تۆ پیر، تۆ پـیر چون خانا
هەر دوو خاك پـــای پیران دانـــا

خانا ئەوەی باش لە پێش چاوە کە پیر بووە، شانازییشی پێوە دەکات. کاتێکیش وەڵامی میرزا شەفیع دەداتەوە، دەڵێت میرزا شەفیعی برای قسەخۆشم، ئەمەی من بۆتم نووسیوە، هی خانای پیرە. خانا لە جێگەیەکی تردا دەڵێت:

خانا وێنەی تۆ، تۆیش وێنەی خـانا
دەورەمان ویەرد هانــــــا سەد هانا

**خانا و زمانی فارسی**

خانا یەکێکە لەو شاعیرانەی تری ئەدەبیاتی کوردی کە وێڕای ئەوەی زمانی دایکی (کوردی)ی زانیوە، زمانی فارسی و عەرەبیی زۆر بە جوانی و تەواوی زانیوە. هەر ئەم زمانزانی و شارەزاییەی لە ئەو دوو زمانەدا وای لە خانا کردووە دەست بداتە وەرگێڕانی خەمسەی نیزامی. وەرگێڕانەکەیشی بە شێوەیەك بووە، هەست دەکرێت تەنها وەرگێڕان نییە، بەڵکو دەڵێی بە زمانی شیرینی کوردی نووسراوە.

جگە لەوەش زمانزانییەکەی تەنها بۆ وەرگێڕانی داستانەکان بەکار نەهێناوە. ئەگەر بە وردی تەماشای هۆنراوەکانی تری بکرێت، ئەوە باش دەزانرێت کە خانا چەند داهێنان و جوانکاریی لە شیعرەکانیدا کردووە، ئەمەش بە هۆی زانینی ئەو زمانەی ترەوە بووە کە تەواو دەستەڵاتی بە سەریدا هەبووە و لە شیعرەکانیدا ڕەنگی داوەتەوە. ئەگەرچی نامۆ نییە تا بەر لە چاپکردنی بەشێك لە دیوانی شیعری خانا ئەوە نەزانرابێت کە خانا شیعری بە زمانی فارسی هەیە، چونکە هەموو هۆنراوەکانی خانای قوبادی لە بەردەستدا نەبووە.

سەیر نییە ئەگەر خانا قەسیدە، غەزەل، بەیت، چوارینە و پێنج خشتەکییشی بە زمانی فارسی هەبێت، چونکە خانا وێڕای ئەوەی کە شاعیرێکی مەزنە، لەبەردەم ئەزموونێکی گەورەی ئەدەبیی پێش خۆیدا، لە هەموو ڕەهەندەکانەوە، خۆی دەبینێتەوە، لەوانەیە شاعیرێکی گەورەی وەکو سەیدی، بەو هەموو شارەزایی و ڕەوانبێژییەوە لە پێش خانا ئەزموونێکی بچووك نەبێت بۆ خانا. وێڕای ئەزموونە ئەدەبییەکانی فارس و عەرەب، هەر بۆیە غەزەلنووسین نە بۆ خانا و نە بۆ هیچ شاعیرێکی دیاری دیکەی کورد شتێکی نەکردە نییە. هەر بۆیە سرووشتییە کە خانای قوبادی لە هەموو بوارێکدا شیعری هەبووبێت.

بە سوپاسەوە مامۆستا موحەممەد عەلی قەرەداغی ئەو دەستخەتەی پێ داین کە پێشتر لە شاری کەرکووك نوسرابووەوە. زیاتر ئەوەمان بۆ ڕوون بووەوە کە خانا قەسیدە، غەزەل،

بەیت و پێنج خشتەکییشی بە زمانی فارسی هەیە، لەم دیوانەی خانادا بەیتێکی فارسی هەیە کە بۆ زوڵەیخا نووسراوە، هەروەها غەزەلێکیش هەیە لە وەڵامی "سائیب"دا.

دەکرێت لێرەدا پێناسەیەکیش بۆ غەزەل بهێنینەوە: غەزەل واتا: گفتگۆی عاشقانە، بە زاراوەیش بە شیعرێك دەڵێن کە سەروای نیوەبەیتی یەکەم و نیوەبەیتی دووەم وەکو یەك بن، نیوەبەیتی دووەمی هەموو بەیتەکانی تریش دەبێ وەکو نیوەبەیتی یەکەم و دووەم بێت بەبێ دووبارەبوونەوەی سەروا. زۆر جار هەر بەیتێکیش مانای سەربەخۆی هەیە. وا باوە غەزەل نابێت لە پێنج بەیت کەمتر و لە پانزدە بەیت زیاتر بێت. زۆر جار شاعیر لە کۆتاییشدا نازناوی شیعریی خۆی دەهێنێت.

※----------------- ※-----------------
----------------- ※-----------------
----------------- ※-----------------
----------------- ※-----------------
----------------- ※-----------------

دەتوانین ئەو حوکمە بدەین و بڵێین خانا تەنها لە کێشی دە بڕگەییدا شیعری نەگوتووە، تەنها لە زمانی فارسیشدا ئەو کارەی نەکردووە، لە شیعری کوردییشدا خانا ئەو ئەسپەی تاوداوە. ئەو غەزەلەی خانا کە لە وەڵامی سائیبدا گوتوویەتی، نیشانەی بلیمەتی و دەستڕەنگینیی خانایە، بەڵام ئەوەی جێگەی نائومێدییە ئەوەیە کە تاکو ئێستا تەنها یەك نوسخەی ئەو غەزەلەمان دەست کەوتووە، لەبەرئەوەی کاتبەکەی کۆلکە خوێنەوار بووە، غەزەلەکە لەنگی و ناتەواویی تێ کەوتووە. خانا دەڵێت:

**آن خـــــوش نظر برآمــــد، پر از خمار دیده**
**کاکل چو افعی بر دوش، جامی ز می کشیده**

لە کۆتاییشدا خانا بە سائیب دەڵێت:

آتش فتاده خـــانـــا، بر صائبا ز نظمت
تا دیــد این غزلها، هوش از برش رمیده

هەر لەناو ئەو دەستنووسەی لای مامۆستا قەرەداغیدا پێنج خشتەکییەکی خانای قوبادی بە زمانی فارسی بەرچاو دەکەوێت، بەداخەوە ئەم پێنج خشتەکییەش ناتەواوە و هەمووی نییە، لە دەستنووسەکەدا هەر ئەوەندەی ماوەتەوە، لەو پێنج خشتەکییەدا خانا دەڵێت:

ای که از هر چه بگویم لطف تو بـالاترست
در شرافت چون شریفی حسن رویت انورست
گر کسی پـاکیزه طبع نیك و روشن اخترست
گر به تخت پادشاهی نـــاکسانش همسرست
می شمارندش به ناکس گر چه او پیغمبرست

## خانا و زمانی عەرەبی

لەناو شیعرەکانی خانادا زۆر ئایەت و عیبارەت و بەیتی عەرەبی بەدی دەکرێت. واش نازانم ئەم پیاوە کەم شارەزا بووبێت لە زمانی عەرەبیدا. شارەزا بووە لە زمان، فیقهـ، عەقیدە، ئوسووڵ، عیرفان، فەرموودە، قورئان و ئەحکامە شەرعییەکانی ئایینی ئیسلام. وەکو دەڵێن: مەلای دوانزدە عیلم بووە.

خانا هەر وەکو چۆن لە زمانی فارسی و کوردییەکەدا زۆر شارەزا بووە، لە هەمان کاتدا لە زمانی عەرەبییشدا شارەزا و لێزان و وردەکار بووە. تا ئەندازەیەکی باش دەستی بەسەر ئەم زمانەشدا زاڵ بووە.

(عَزيزُ الغَفّـــار، عَــزيزُ الغَفّـــار)!
(يـــــا عَظيم العَفو عَزيزُ الغَفّـــار)!
ساحێب نـــەفخ سوور، (في يَوم القَرار)
(واحُشرني مَعَ النَبيّ المُختــــــــــار)
(في يَــومٍ كالمُهْل، طَعــــــــــامٌ أثيمْ
يُلقـي في البطون، كَغَلـــــــي الحَميم)
شادم جـــــە واتـــــەی بینای بێنەزیر
(بِمَغـفِرةٍ وأجُـــــــــــــرِ كَــــبير)
ماوەرەم نــــە سلك زومرەی (مُشرِكون)
(ضَلّ عَنهُم مـــــــــا كانوا يَدّعـون)

ئەگەر تەماشای ئەم شیعرە بکەین، وشە و زاراوەکانی زمانی کوردیی کەم تێدا بەدی دەکرێت. دەتوانین بڵێین خانای قوبادی ئیقتیباسی لە زمانی کوردیدا کردووە نەك لە عەرەبیدا. هەموو ئایەت و عیبارەت و وشە عەرەبییەکانیش بە خاڵی بنچینەیی دابنرێت و

کوردییەکانیش بە ئیقتیباس. ئەم هۆنراوەیە وەکو شیعرێکی عەرەبی تەماشای دەکرێت، هەروەها دەتوانین لایەنەکانی ڕەوانبێژی لەم شیعرەدا زۆر بدۆزینەوە و بە هۆنراوەیەکی تەواو واتاداری دابنێین. یاخود لەم هۆنراوەیەی خوارەوەدا خانا هەموو وشە و ئایەت و زاراوەکانی زمانی عەرەبیی بەکارهێناوە، تەنها ناوی خۆی وەکو وشەیەکی کوردی هێناوە. ئەم شیعرەش یەکێکە لە شیعرە عەرەبییە بەهێزەکانی خانای قوبادیی و دەستڕەنگینیی خانای زۆر تێدا بەدی دەکرێت. لەم دوو شیعرەی خانادا بۆمان دەردەکەوێت کە خانا لە زمانی عەرەبیدا چەند شارەزا و لێهاتوو بووە، چەند وردەکار و خامەڕەنگین بووە، بەدوای چیدا گەڕاوە؟ ئارەزووی لە چی بووە؟ چۆن داهێنانی کردووە؟ لە هەموویشی گرنگتر ئایەتەکانە کە چۆن ڕێکی خستوون؟

یا أولي الألباب، یا أولي الألباب!
تَقسَموا بِـالله، یـــا أولي الألباب!
مَن مِلَّةَ الکذبْ، في یَـوم الحسابْ؟
لا یُخَفَّفُ عَنهُمُ العَـــــــذابْ
یـــــا أیها الناس نَحو المشرکین
وَلا تَکـــونَنَّ مِـــــــن المُمتَرین
فَـــاستَعِذ بِـــــالله، سَمیعُ بَصیر
مِن عَذابِ النــــــارْ وَبِئس المَصیر

**کاریگەریی شاعیرانی فارس لەسەر خانای قوبادی**

وەکو لە هەندێك جێگا و شوێنی ئەم نووسینانەدا ئاماژەمان پێ داوە کە خانای قوبادی سەرقاڵی خوێندنەوەی شیعری فارسی بووە، لەناو هۆنراوەی خانای قوبادی و دۆستەکانیشیدا ڕەنگی داوەتەوە.

خانا زیاتر شیعرەکانی فیردەوسی، خاقانی، جامی، سائیب و نیزامیی خوێندووەتەوە. هەروەها کاریگەرییشیان لەناو ڕەوشت و کردارەکانی خانادا ڕەنگی داوەتەوە، وەکو پێی دەڵێن: "خانای جامی خوو" و "خاقانی سیفەت".

خانای قوبادی ئەگەرچی فیردەوسیی خوێندووەتەوە، بەڵام شانامەی وەرنەگێڕاوە، هیچ ئاماژە و بەڵگەیەکیش لە بەردەستدا نییە کە خانا شانامەی وەرگێڕابێت، ئەوەش بە دروست دەزانم کە خانا زانیویەتی ئەڵماس خان شانامەی وەرگێڕاوە، لەبەر ئەوە خۆی لە قەرەی شانامە نەداوە، دواتر خەمسەی نیزامیی وەرگێڕاوە.

لە ژێر کاریگەریی ئەو ڕووداوانەی کە لەسەردەمی فیردەوسیدا ڕووی داوە، ئەمیش خەمسەکەی پێشکەش بە میرزا شەفیعی کولیایی کردووە، هەتا لەو ڕێگایەوە بە میرنشینی ئەردەڵانی بدات. ئەمە لەلایەك و لەلایەکی تریشەوە لە داستانی لەیل و مەجنوونەکەیدا ئەوەی تا ڕادەیەك بە ڕوونی هێناوە، بەڵام ئامادەکارانی کتێبەکە ئەوەیان بەسەردا ڕۆیشتووە.

وەرگێڕانی خەمسەی نیزامییش یەکێکە لەو کاریگەرییە گەورانەی کە بە ڕوونی لەسەر خانا دیار کەوتووە و ڕەنگی داوەتەوە. لە لا (١٤٤)ی داستانی لەیل و مەجنوونەکەیشدا دەڵێت: "نیزامی جە قەوڵ دانای بەغدادی/..."، "نیزامی بە قەوڵ بەغدادی سەلام/...". هەروەها خانا لەسەر زاری نیزامییەوە مردنی لەیلا و ئاگاداربوونی مەجنوون لەو بابەتە دەڵێت: "نیزامی پەی فەوت لەیل عامیری/ بەی تەور دان داد شیعر و شاعیری"، دەکرێت خانا هۆنراوەی شاعیرانی تری فارسی خوێندبێتەوە، بەڵام وەکو ئەو چەند شاعیرەی کە

ناومان بردن، کاریگەرییان لەسەر خانا دروست نەکردبێت، ئەو کاریگەرییەش ئەوەندە لەسەر خانای قوبادی زاڵ بووە و ڕەنگی داوەتەوە کە گەیشتۆتە خاڵێك میرزا شەفیع و زوڵەیخا بەو هەڵسوکەوت و کاریگەرییە بزانن و لە شیعرەکانیاندا ئاماژەی پێ بکەن:

**شەرح بەیان کـــــەر خاقانی خامە**

**شیعرای جـامی نەزم، نیزامی نامە**

**کاریگەریی شیعری عەرەبی لەسەر خانای قوبادی**

خانا لەناو شیعرەکانیدا زۆر ئایەتی قورئان و عیبارەت و وشەی عەرەبیی بەکار هێناوە، ئەگەرچی ئێمە پارچە شیعرێکی عەرەبیی خانا، یان چەند پارچە شیعرێکیمان لەم دیوانەدا هێناوە، هەر وەکو چۆن زمانی فارسی و شیعری شاعیرانی فارسی کاریگەرییان لەسەر خانای قوبادی هەبووە، هەروەها دەتوانین بڵێین زمانی عەرەبی و شیعری عەرەبی کاریگەرییان لەسەر خانا هەبووە، وەکو پێویستییەك لە پێویستییەکانی شیعر لە کاتی پێویستدا سوودی لە زمانی عەرەبی و هۆنراوە و زاراوە و دەستەواژە و گوزارشتی جۆراوجۆری عەرەبی وەرگرتووە.

هەر وەکو چۆن لە داستانی خوسرەو و شیرینەکەیدا زیاتر سوودی لە زمانی فارسی وەرگرتووە، لە داستانی لەیل و مەجنوونیشدا سوودیشی لە داستانی لەیل و مەجنوون بە زمانی عەرەبی و فارسی وەرگرتووە.

**نیزامی جـــە قەوڵ دانای بەغدادی**
**وەی تـــــەورە ڕێژان تەرح ئوستادی**

یان لە جێگەیەکی تری ئەم داستانەدا دەڵێت:

**نیزامی جـــــــە قەوڵ بەغدادی سەلام**
**وەی تەور تەنزیم کەرد ئی شیرین کەلام**

مامۆستا سەیید تاهیری هاشمی لە گوڵزاری ئەدەبدا کە وتارگەلێکن سەبارەت بە خانای قوبادی و زیاتر باس لە خوسرەو و شیرینەکەی خانای قوبادی دەکات، ئەم بابەتەی لە ڕادیۆی کوردیی ئێران لە ئەو کاتەدا خوێندووەتەوە، لە وتاری ژمارە (٥)یدا نووسیویەتی:

*"... سەبارەت بە حاڵی خوسرەو و شیرین دە شیعر یا زۆرتر لە خوسرەو و شیرینی نیزامیی و خانا دێنین. تا دەرکەوێ کە خانا ئیقتیباسی کردووە نەك تەرجەمە".*

لە خوسرەو و شیرینی نیزامی:

و زان سو آفتـــاب بت پرستـــان
نشسته گرد او ده نـــار پستـــان
فرنگیس و سهیل سرو بـــــالا
عجب نوش و فلکنـــاز و همیلا
همایـــون و سمن ترك و پریـــزاد
ختن خاتون و گوهر ملك و دلشاد...

خانای قوبادی:

ئـەوڵ سەوڵبـــاڵای سەوڵ جەننەت ییز
بەی تەور کەرد ڕیزەی ڕازان شەکەر ڕیز:
"گەنجێ سەر بـە موهر شایستەی شاهی
کەمتەر بـەهاشەن جـــە مەه تا ماهی
برپـــا بـــە سەرکار فەرەیدوون فەرێ
تـاج و کەمەرلاڵ، مەسنەد جە زەڕێ"...

لەناو شیعرەکانی ئەم دیوانەشدا بەڵگەی تری لەم بابەتانە هەیە و بەرچاو دەکەون. لەبەر ئەوەی پێشووتر لە باسی زمانی عەرەبیدا نموونە و بەڵگەی زیاترمان هێناوەتەوە، لێرەدا دووبارەی ناکەینەوە.

**کاریگەریی شاعیرانی کوردی پێش خانا لەسەر خانای قوبادی**

لە باسی شاعیران و شیعر و زمانی عەرەبی و فارسیدا وتمان کاریگەرییان بەسەر ژیان و شیعری خاناوە هەبووە، لە هەمان کاتیشدا هەندێك شاعیری کوردی پێش خانا هەبوون کاریگەرییان لەسەر خانای قوبادی هەبووە. ڕەنگ و بۆی شیعرەکانیان لە ناو هۆنراوەی خانادا بەدی دەکرێت.

لەناو ئەم دیوانەدا چەند پارچە شیعرێك هەیە کە کاریگەریی شاعیرانی کوردی پێش خانا لەسەر خانای قوبادیی بە ڕوونی دەردەخەن. خانا چۆن سوودی لە شاعیرانی عەرەب و فارس وەرگرتووە، بە هەمان شێوە سوودی لە شیعر و شاعیرانی کوردیش وەرگرتووە و لەناو شیعرەکانیدا ڕەنگدانەوەی ئەو شیعرە کوردییانە بە ڕوونی دەبینرێت.

بێسارانیی شاعیر یەکێکە لەو شاعیرانەی کە کاریگەریی لەسەر خانای قوبادی هەبووە. لە شیعرێکدا بێسارانی دەڵێت:

نـــاڵەی دەردەدار بێ ئـاخ نمەبۆ
دەروون عـــــاشق بێ داخ نمەبۆ
عاشق، تا دەمێ جـــەفاش نمەبۆ
بێ جەفا، هەرگیز سەفاش نمەبۆ

خاناش دەڵێت:

وەلاڵ نمەبـــۆ، وەلاڵ نمەبـــــۆ
سیاسەنگ هەرگیز، وەلاڵ نمەبـۆ
ئەتڵەس و خـارا، وە شاڵ نمەبـــۆ
ئەبلە وە خەیـــاڵ، وە ماڵ نمەبۆ

ئەم شیعرەی بێسارانی خۆی لە (٨) بەیتدا دەبینێتەوە، بەڵام ئەوەی خانا (٦٠) بەیتە.
بێسارانی لە هۆنراوەیەکی تردا دەڵێت:

نەوبەر نـــــەمامێ، نـــــــەوبەر نەمامێ
ئارۆ دیم وە چەم، نـــەوبـــــەر نـــــەمامێ
زوڵف پێچ کەمەند، خـــەیـــــاتەی خامێ
حۆری سروشتێ، جـەمین چـون جـــــامێ
بـــازی شەش دانگی شیرین تـــــــــەوارێ
شاهین تیژپـــــــــەڕ، جۆیـــــــای شکارێ
نیگاش نیگای چەرخ، ماڵ نـــەسەر کاوان
زیـــــانش وە چەند مەلا و شێخ یـــــــاوان
شێخش کەردەن شێت، فەقێ سەرگـــەردان
مەلا چون سەنعان، دین جـــە دەست وەردان

خاناش دەڵێت:

سینە زەڕ وەرەق زیبـــــای ئـــــەلوانی
یـــــا (حور العین) بــــاغ ڕیزوانی
بریقەی بــەی چــون دوڕ بەحرولئەمانی
پـــــــەروەردەی سەهەند خامەی کەتانی
نـــاف قوتووی مەعجوون دەوای لوقمانی
زەڕ بـــــافتەن جە تەرح ڕشتەی ڕیزوانی
جـــایی سم غەزاڵ، چـــەرخ جیسمانی
بیلاتـــەشبی کاف نـــــوون قورئـــانی

وەڵـــــــەد ڕەفتارێ، خۆش خـەرامانی
مەر بــــــانۆ هەرسین یا دوڵبەر جانی
مەتەرسوون جـــە لوتف زوڵێخای سانی
خانـــــە بـــەر وە تەبع شێخ سەنعانی
یـــــە خانە واتەن هەر وە بێ مەرکەو
جەهد و جەخت لە من، مەرحەبا لە ئەو

وەکو دەبینین لە تەوسیف و چواندن و حاڵ و ئەحواڵدا هەردوو شاعیر لە یەکەوە نزیکن دەڵێی لە یەك جێگەوە ئیلهامیان بۆ هاتووە، وەکو ئەوەی بڵێی یەك هۆنراوەیە و بووە بە دوو پارچەوە، یان تەواوکەری یەکترین، ئەوەندە لێکچوون و لێکچواندنەکان لە یەکەوە نزیکن ڕەزا خانی باوکی ئەڵماس خانیش لە شیعرێکدا دەڵێت:

ڕاز نیـــــــازان، ڕاز نیـــــازان
بەو ڕاز کــــــەڵکێ ڕاز نیــــازان
جەلادان جەلد، وە جــــــای پەروازان
سەرش وە میسری مەینەت ئــــەندازان
سانیعان وە سونع، سونعەت نـــەکار بی
ئولفەتبەخش بییەن، سەلج وە نـــار بی
حاکمی حەکیم، حوکمت مەحکــــەمەن
نەهەیبەت مونکەر، ئەمرت موبرەمـەن

خاناش دەڵێت:

دنیـــــا مەککارە، دنیـــا مەککارە
دنیــــای حیلەبــاز، کۆنەی مەککارە

بیوەی حیلەساز بـــــەد پـــەتیـــارە
پێچاپێچ وەردی، چـــــەواشە چـــارە
موتریب مووکـەش، مەیبەخش مەستان
زەواڵ ســـاکین، زۆر زەبـــــەر دەستان

هەر لەسەرەتای هۆنراوەکەوە کاریگەرییەکە بە شێوەیەکی زۆر سادە دەردەکەوێت، بەڵام دواتر ڕەزا خان چۆن لایەنەکانی جوانکاریی "تەفسیل و تەوسیل"ی بەکار بردووە، خانای قوبادییش بە هەمان شێوە ئەو کارەی ئەنجام داوە. دوابەدوای ئەمە ئەوەندە کاریگەرییەکە قووڵ دەبێتەوە، گومان دەکرێت لەوەی کە ئەم شیعرانە تێکەڵاو بکرێن یان تێکەڵ کرابن. ڕەزا خان دەڵێت:

وە قـــــەدر جـەلال، جـــای سولەیمانت
وە عیسای مریـەم، مووســـای عیمرانت
بـەو بینای مـــەنزڵ کــەعبەی خەلیلت
بـــەو دیدەی ئیسحاق، هەم ئیسماعیلت
وە زیکر و دوعـــای ســـــالح پێغەمبەر
نـــاقەی سەرئـــاوەرد، ژە بەتن حەجەر
بـــەو خزر و ئیلیاس، یووشەع و ئیشمیل
هـــەم بەو زولقەرنەین، لەقەب زولکیفل

خاناش دەڵێت:

گوستاخیی مووســـا، ڕەشیدیی هـــــــاروون
یووشەع چەنی نوون، ئــــــەییووب و شەمعوون
هـــوود و دانیـــــال، ئـــــــــەرمیا و حیزقیل
ئیلیـــاس چــــــــەنی خــــــزر و (ذالکفل)

یوونس و داود، حوکـــم سولـــــــــــەیمان
ڕام کـــــــــــەرد ئینس و جن بسەندش دێوان

وەکو لە نموونەکانی سەرەوە ئەوەمان بۆ دەرکەوت خانا زۆر سوودی لەو قاڵبە شیعرییە و لەو جۆرە داستانانە وەرگرتووە. واش دێتە پێش چاو ئەم قاڵبە شیعرییە لەناو ئەدەبی کوردیدا زۆر بووبێت، بە تایبەتی بە ماوەیەکی کەم بەر لە ژیانی خانا و سەردەمی خانا و دواتر درێژەی پێ دراوە. ئەمانە و چەندین نموونەی تر هەن لە هۆنراوەی خانادا کە کاریگەریی شاعیرانی کوردی پێش خۆی بەسەرەوە دیارە.

**کاریگەریی خانا لەسەر شاعیرانی کورد لە دوای خۆی**

خانا جگە لەوەی کاریگەریی شاعیرانی پێش خۆیی لەسەر بووە، لە هەمان کاتیشدا کاریگەریی لەسەر شاعیرانی هاوتەمەنی خۆی هەبووە. یەکێك لەوانە میرزا شەفیعی کولیایی بووە. هەندێك شاعیریش هەبوون بەریەرەکانیی شیعرەکانی خانایان کردووە. هەروەها خانا کاریگەرییشی لەسەر شاعیرانی پاش خۆی هەبووە، لەوانە: مەولەوی، حەیران، کۆماسی، عەبدالّ، شەهاب، مەحرووم و مەحزوون. نموونەش لەسەر ئەم بابەتە زۆرە. خانا لە هۆنراوەیەکدا کە بە "سەیید سالار" دەست پێ دەکات، کاریگەری لەسەر عەبدالّی گەرمیانی دادەنێت و دەڵێت:

سەيید سـالار، سەيید سـالار!
يـا ڕەسوولەڵلا، سەيید سـالار!
سپەهـدار تیپ ڕۆی (يـوم القرار)
پەنـای عاسییان، بـەندەی شەرمەسار
پـاسەبـان جێش پەیغەمبەران گشت
بـاعیس ئیجاد کولل زیبـا و زشت!

ئەمەش سەرەتای شیعرەکەی عەبدالّە:

سـەيید سالار، سـەيید سالار!
يـا ڕەسولـەڵلا سەيید سـالار!
پەنـای عاسیان بەنـدەی شەرمـەزار
موختار بێعەیب، پـادشای غەففار
شیفاخـوای ئوممەت سـەردار مەحشەر
بوزرگ جـە لای حەق ئەڵلاهوئەکبەر

لە کەشکۆڵی کەلەپووری ئەدەبی کوردیدا (ب٥، لا٥٠) هۆنراوەیەك لەسەر ئەم قاڵبە هەیە. شیعرەکە بە ناوی حەسەن ناوێکەوە هاتووە. لە ئەدەبی کوردییشدا شاعیری زۆرمان بە ناوی حەسەنەوە هەیە، نازانین کام حەسەن ناوە، سەرەتای هۆنراوەکەش بەم شێوەیە دەست پێ دەکات:

**سەیید سەروەر، سەیید سەروەر!**
**سالار موختار، سەیید سەروەر!**

لە هۆنراوەی "زوننارم بەستەن"یشدا خانای قوبادی کاریگەریی لەسەر فەخرولعولەمای سنەیی (حەیران) دروست کردووە. لەو شیعرەدا خانا دەڵێت:

**زوننارم بەستەن، زوننارم بەستەن**
**جەو ساوە پەی تۆ زوننارم بەستەن**
**شیشەی نام و نەنگ تەقوام شکەستەن**
**ئەعزام جە بادەی مەیل تۆ مەستەن**

حەیرانیش دەڵێت:

**ئازیزم بەستەن، ئازیزم بەستەن**
**جەو ساوە جە ڕات زوننارم بەستەن**
**شیشەی نام و نەنگ، تەقوام شکەستەن**
**ئەعزام جە بادەی مەیل تۆ مەستەن**
**ئەزانم سەودای سەدای باڵاتەن**
**قەدقامەتم زکر باڵای ئاڵاتەن**
**تا وە زوڵف و ڕووی تۆ تەواشامەن**
**ئەدای نمای فەرز سوبح و عیشامەن**

سـەجادەم وە هـوون گوڵناری کەردەن
سوجدەم وە میحراب ئـەبرۆی تۆ بەردەن
ئەدا زەکاتم نسـارم ڕۆحـەن
وە خـاک پـای تۆ، هـەزار فتووحەن

هەروەها خانا کاریگەریی لەسەر مەولەوی هەبووە و مەولەوییش بە شیعری خانا زۆر کاریگەر و دڵخۆش بووە. ئەو حەقەی کە خانا بە هۆنراوەکانی داوە، وای لە مەولەوی کردووە کە زۆر ڕاستگۆیانە و ڕوون لە وەڵامی شیعری مەحروومییدا بڵێت:

مەحرووومی:

مـەعدووم ڕاس خـانـا سۆزان عـەشق بی
کەی وێنەی مـەحرووم هـەر عەشقش مـەشق بی؟

وەڵامی مـەولەوی:

نەویـاوەی خەیـاڵ مـەحرووم دانـا
ڕەدیف لـەتیف زەریف خـانـا
یـاوا، وە دیدەی کـەمبینام ساوا
جە نەو بینایی پـەی دیدەم یـاوا
پەیڕەوی خانـات یـاد ئاوەردە بێ
ئەو ئەسڵ و وێت فەرع حەساو کەردە بێ
لاکین زادەی تـەبع بـۆ عەنبەرینت
دەسڕێسەکـەی فیکر بیکر شیرینت
پەسەندیدەی فـام عەقڵ دانـا بی
خاستەر جە خـەیاڵ خـاسەی خانا بی

**زیـــــادە پـــەی فەرع وە سەر ئەسلەدا**
**خاسەی واتەی تـۆن جـەی سەر فەسلەدا**

مەولەوی چەند بە ڕاستگۆیی و بێ پێچ و پەنا و دادپەروەرانە هەڵسەنگاندنەکەی کردووە. هەقی هەردوو لای وەکو یەك داوە و لایەنگریی هیچ لایەکیشی نەکردووە. بڕیارەکەشی بڕیارێکی تەواو ڕاست و دروست بووە. هەروەها لە شیعری پیرییەکەیشیدا خانا کاریگەریی لەسەر مەولەوی دروست کردووە.

**پایەی شاعیریی خانا لەناو ئەدەبی کوردیدا**

خانا لەناو مێژووی ئەدەبی کوردیدا پلە و پایەی تایبەتی هەبووە، هەندێك شاعیر ڕەدیفی بوون و هەندێکیش ئاوڕیان لێ داوەتەوە. یەکێك لەو شاعیرانە مەحروومی بووە و ڕەدیفی خانا بووە. ڕەنجووریی شاعیریش لە شیعرێکدا ناوی چەند شاعیرێکی فارس و کورد بەیان دەکات، لە شیعرەکەیدا بەم شێوەیە باسی خانای قوبادی دەکات:

**شوعەرای کـــوردستان گۆیندان خاس**
**هەرچی مەشهوورەن پەرێت کەرۆ باس:**
**مـــەلا نـــەجەف نـــام، خانای قوبـادی**
**یەك مەلا ســالح جەرگـــەی مـــورادی**[١٤]

لەم هۆنراوەیەدا پەڕەیەکی دیمان لە باسی ژیانی خانا بۆ ڕوون دەکاتەوە، لێرەدا ڕوون دەبێتەوە ناوی خانای قوبادی تەنها لەناو ڕۆژهەلاتی کوردستاندا بلاو نەبووەتەوە و تەنها لەوێدا بەناوبانگ نەبووە، بەلکو لە باشووری کوردستانیشدا ناوبانگی هەبووە. ڕەنجووری ئەو هۆنراوەی بۆ یادکردنەوەی شاعیرانی فارس و کورد نووسیوە، هەر چەندە باسی ساڵ و ساڵی دیاری کراو بۆ شیعرەکە نەخراوەتە ڕوو، بەلام پەردە لەسەر ئەوە هەلدەماڵێت کە خانا تاکو سەرەتای تەمەنی ئەو شیعرە لە دنیادا بووبێ یان نەبووبێ، ئەم شیعرە ئەوەمان پێ دەلێت کە لە ناوچەی کەرکووکیشدا ناوبانگی خانا بلاو بووەتەوە. ئەو دەستنووسەیش کە چەند پارچە شیعری خانای تێدایە و لە ناوچەی کەرکووکدا نووسراوەتەوە، شیعری فارسیی خانای تێدایە، گومانەکان لەسەر ئەوە کەم دەبنەوە کە خانا ناوی هەر زوو بە زۆر ناوچەی کوردستان و ئێران و ڕۆمدا بلاو بووەتەوە. ئەو بەیتەی خانایش بەلگەیەکی ڕاست و ڕەوانە و بێ هۆ ئەو بەیتەی نەگوتووە.

---

[١٤] دیوانی ڕەنجووری، موحەممەد عەلی قەرەداغی، لاپەڕە (٧٠).

ئەگەرچی لەو دەمەدا سنوورەکان بەسەر دوو دەستەڵاتی فارس و عوسمانیدا دابەش کرابوون، بەڵام هاتوچۆ دانەبڕاوە، توانراوە هاتوچۆ بکرێت، هەر چەندە نازانرێ ئەو شیعرە لە چ ساڵێکدا نووسراوە، خۆ ئەوە ئاشکرایە مەلا عومەر ناوبانگی خانای بیستووە و لە شیعرەکەیدا یادی کردووەتەوە. دیسان ئەگەر بڵێین: چەند ساڵێك بووبێ خانا مردبێت، یان مابێ، هەردوو حاڵەتەکە ڕێی تێ دەچێ، چونکە دەقاودەق نازانرێ خانا لە چ ساڵێکدا وەفاتی کردووە، بەڵام بەپێی ئەم بەڵگە و ئەو بەڵگانەی تر کە خراونەتە ڕوو، ئەگەری ئەوە بەهێزە کە خانا هەتا (١١٦٩ك.) ژیابێ و مەلا عومەری ڕەنجووریش لە تەمەنی لاویدا ئەو شیعرەی نووسیبێت. دەکرێت بڵێین: ڕەنجووری ئەو شیعرەی لە نزیکەی (٢٠-٣٠) ساڵیدا نووسیبێت. ئەمەش تەنها گریمانەیە و هیچی تر. چونکە نێوانی لەدایکبوونی ڕەنجووری و وەفاتی خانا ئەوەندەی نێوان نییە تاکو بڵێین خانا زوو لەبیر کراوە و شوێن قەڵەمی لەناو ئەدەبیاتی کوردیی ئەو سەردەمەدا کوژاوەتەوە.

لە دەستنووسی سەڵسەییشدا هۆنراوەیەك هەیە، مامۆستا قەرەداغی ناوی خانای قوبادیی لەسەر نووسیوە، بەڵام هۆنراوەکە هی خانا نییە، و هی "داخی"ی شاعیرە، شاعیر لە چەند بەیتێکی هۆنراوەکەیدا ناوی چەند شاعیرێك دەهێنێت، لەوانە: مەعدوومی (مەولەوی)، یووسف، خانا، فیردەوسی، مەلاکەی گۆران و شەفیع، "داخی" سەبارەت بە خانای قوبادی دەڵێت:

ئـــــــەشعار یووسف، ئـــەبیات خانا
جــــە خـــەیاڵ خاسیش وە هیچ مەمانا
فیردەوسی مـــــەزموون مەڵلاکەی گۆران
ئەبیات تورکی مـــــــەدح شێرا و بەوران

**واتــــــه داشى وەند خــاناى دڵ غەمگين**

**فــــــەرموودەى شەفيع دەروون ماتەمين**

لەم ساڵانەى دواييشدا حاجى شێخ حاميد حيسامى بە دێڕە شيعرێك يادى خاناى قوبادى دەكاتەوە و دەڵێت:

**كوردى گۆرانە خــــاناى قوبادى**

**خەسرەو شيرين بكــەرۆ يـــادى[١٥]**

هەر يەك لە سەييد تاهيرى هاشمى -كە بە چەند بابەت و لێكۆڵينەوەيەك لەسەر شيعر و ژيانى خانا دواوە- و موحەممەد عەلى سوڵتانى، مامۆستا قەرەداغى، دكتۆر خەزنەدار، شەپۆل، مامۆستا جەعفەر، دكتۆر فەرهاد حاجى قادر و سەفى زادە و چەندانى تريش كە لێرەدا باسيان كراوە يان ئێمە بەرهەميمان بەرچاو نەكەوتووە، باس و خواسيان لەسەر ژيان و بەرهەمى خاناى قوبادى كردووە، يان لێكۆڵينەوەيان لە ژيان و دانراوەكانى خاناى قوبادى نووسيوە و بڵاويان كردووەتەوە.

[١٥] يادى شاعيرانى كورد: حاجى شێخ حامد حيسامى، چاپى يەكەم، ساڵى ١٣٨٢ى هەتاوى- لا (٧٥).

# هۆنراوە ئایینییەکان

## ئەر هەی بلّند ماڵ *

ئەر هەی بلّند ماڵ، ئەر هەی بلّند ماڵ!
ئەر هەی یانە بەرز، بینای بلّند ماڵ!
ئەرێ مایەی نوور، سوبح زەڕین باڵ!
ئەرێ ئاگادار هەم حاڵزان حاڵ!

---

* ئەم شیعرە لە ڕۆژنامەی هاوکاری ژمارە (٤٢٥) ڕێکەوتی (٨-٥-١٩٧٨) لە لایەن مامۆستا کەمال نووری مەعروفەوە بڵاوکراتەوە. مامۆستا عوسمان هەورامییش لە گۆڤاری ڕۆشنبیریی نوێی ژمارە (٧٦) لە ئەیلوولی (١٩٧٩)، لا (٣٣ – ٣٦)دا وتارێکی بە ناوی "دەربارەی بەرهەمی خەلیل منەوەر و هۆنراوەیەکی خانای قوبادی" نووسیوە و بڵاوی کردۆتەوە. لەو وتارەدا دەربارەی ئەم شیعرە زۆر دواوە، هەندێك لە هەڵەکانی چاك کردووەتەوە. لە پرۆژەیەکی هاوبەشی دەستنووسی ناوچەی گەرمیان لەگەڵ مامۆستا هەردەوێڵ کاکەییدا، دەستنووسێکی چەند لاپەڕەیی بۆ ساغکردنەوە و هێنانە سەر ڕێنووسی نوێی کوردی بۆ هێنام، لە نێو ئەو دەستنووسەدا ئەم شیعرەی خانای قوبادیم دیسانەوە دەست کەوت، بۆیە بێ سێ و دوو هێنامە سەر ڕێنووسی نوێ و لەگەڵ پارچە بڵاوکراوەکەدا بەراوردم کردن، لێرەدا دەبینرێت پارچە شیعرەکەی لای مامۆستا هەردەوێڵ تەواوترە، جگە لەوەی هەندێك جیاوازیی کەمی تێدا بەدی دەکرێت، جێگای خۆشحاڵییە و پێویستە دەسخۆشیی لێ بکەم. نابێ ئەوەش لە یاد بکەم کە مامۆستا کەمال نووری هەندێك دەستکاریی پارچە شیعرەکەی کردووە، دواتر مامۆستا عوسمان هەورامی لە وتارێکدا پارچە شیعرەکەی ڕاست کردۆتەوە و ئاماژەی بۆ ئەوەش کردووە کە مامۆستا کەمال نووری یانزە بەیتی لە پارچە شیعرەکە پەڕاندووە و چەند بەیتێکی لە حەوت تەرجیع بەندەکەی خانای قوبادی هێناوە و کردوویەتی بە کۆتاییی ئەم پارچە شیعرە، لێرەدا تەنها چەند جیاوازییەکی کەمی پارچە شیعرەکە دەخەمە ڕوو، مەبەستم ئەو وشانەیە کە پێویستە لێرەدا بخرێنە ڕوو.

ئەر هەی (لا إلـه، إلاّ هُـوَ الحَـق)![1]
ئەر هەی لامەکان،[2] سەردار موتلەق!
ئەر هەی ساعەتساز، بەستەی ماه وساڵ!
(واقِفُ الأسرار، علی کُلِّ حال)[3]
ئەر هەی زات پاك، فەرد نیهانی!
ئەر ئاگای ڕاز سیڕڕِ پەنهانی!
ئەر هەی عەتابەخش، (معطي کلّ شيء)![4]
ئەر هەی (لایموت)،[5] حەیاتبەخش حەی!
ئەر هەی نوور نەڕۆی خاسان عەیان کەر!
عاشقان مەجنوون، شەیدای جیهان کەر
هەی نوورت مایەی ڕەوشەنیی دڵان!
ئەرێ زینەتبەخش شکۆفەی گوڵان!
ئەرێ بێ عیللەت، بێ فیکر و خەیاڵ!
کاتب قودرەت، مونشیی نوقتەی خاڵ

---

[1] واتە: هیچ خودایەك نییە جگە لە خودای حەق، لێرەدا لەبەر کێشی شیعرەکە لە بری (اللّٰه) حەق دانراوە.

[2] لامەکان: بێشوێن و جێگا، مەبەست لە خودای گەورەیە.

[3] مەبەست لە خودای گەورەیە کە لە هەموو نهێنییەکان شارەزایە و مردن و ژیان بە دەستی ئەوە.

[4] ئەگەر (اعطی کل شيء) بێت، ئەوا ئاماژەیە بۆ ئایەتی (٥٠)ی سوورەتی (طـه)، (معطي) نووسراوە، لە ڕاستیدا خۆی ئاماژەیە بە بەخشندەییی خودای گەورە، جگە لەوە شتانێکی دیکەم لەو بارەوە دەستگیر نەبووە.

[5] ئەم دێرە واتاکەی بەستراوە بە دێرەکەی پێشەوە و دەکرێ ئاماژە بێ بۆ ئایەتی (١٣)ی سوورەتی (الأعلی)، ئەوانەی خودای گەورە دەیانخاتە ناو ئاگرەوە، نە دەمرن، تا بحەسێنەوە، نە دەژین، ژیانێکی وایان هەیە ئیسراحەت و حەسانەوەی تێدا بێت.

ئەرێ هەی کارساز، کاربەدەست ئاسان!
ڕۆشنیی دەروون، نێك و بەد ناسان
ئافریدەت کەرد، فریشتەی شەریف
وێنەی مەلائیك، سەرتاپا زەریف
بەدەن چون مینای بلووری بێگەرد
سافتەر جە سافیی مەوج (ماءُ الورد)[٦]
بنازۆن وە تۆ تاك تەنیای فەرد
ئەوڕۆ ئاڵتوونت بە خەڵق ئیزهار کەرد
بە زات بێچوون،[٧] بێشوبھ و میسال
بەڵام وات: جەواب (ذات ذوالجلال)
عالیم ئەقدەس، حەیی تەوانا
بەڵا بێ جەواب، قەییووم دانا
چون حازر وە زات، شاه ئەقدەم بیم
دڵ بێزار[٨] جە لەفز، (لا) و (نعم) بیم
ئەز سەبەب چێش بەختم زەبوون بی؟
ڕەفیقم شەیتان، مەلعوون دوون بی

[٦] گوڵاب: ئارەقی گوڵ، گوڵاو.

[٧] لای (هرد) ئەم وشەیە بە "پەی چوون" نووسراوە، دیارە هەڵەیە و بێچوون ڕاستترە.

[٨] لای (هرد) و (کم) نووسراوە "بێزار"، بەڵام (هەور) دەڵێت: دەبێ "بێدار" بێت، وەکو لە کەشکۆڵەکەدا "بێزار" نووسراوە هەر ئەوەم نووسی.

ئەورۆ ڕەها بیم جە بەتن مادەر
ئامام وە سەفەر، دنیای پەڕ خەتەر
چێش بی وە بەختم،[٩] غەمانم کۆ بی؟
سەودام[١٠] فیراوەن، جە فام بێ شۆ بی
مەحرووم چە جەماڵ جەمین جامان بیم
غەمناک غەمین، خەیات خامان بیم
بێبەری جە باغ نەونەمامان بیم
داغدار پەڕ دەرد، هەم بێسامان بیم
خەتا نەکەردەم بەرگ (بیت الله)[١١]
بت پەرست نەویم (والله وبالله)
چون یەزید[١٢] وە قەتڵ کەس سەڵا نەویم
هاجەنگ حسێن،[١٣] کەربەلا[١٤] نەویم

---

[٩] لای (هەور) و (کم) نووسراوە "بی بەختم"، لای (هرد) نووسراوە "بی وە بەختم" و ئەومان بە ڕاستتر زانی.

[١٠] لای (کم) و (هەور) نووسراوە "سوودم"، لای (هرد) نووسراوە "سەودام"، ئەمەیان ڕاستترە.

[١١] خەتا نەکەردم: لێرەدا زیادەڕۆییەك هەیە، بەڵام پێغەمبەرمان موحەممەد (د.خ.) دەفەرموێت (کل بني ادم خطأ وخير الخطائين التوابون)، چونکە هیچ کەسێك لەم ڕووی زەمینەدا نییە خەتا و گوناه نەکات.

[١٢] مەبەست لە یەزیدی کوڕی مەعاویە بوو کە پلانی کوشتنی بۆ ئیمامی حوسێنی کوڕی ئیمامی عەلی دانا، دوای شەڕ و بەربەرەکانییەکی زۆر لە دەشتی کەربەلا بە خۆی و هاوەڵانییەوە شەهید کران.

[١٣] مەبەست لە ئیمامی حوسێنی کوڕی ئیمامی عەلیی کوڕی ئەبووتالیبە.

[١٤] کەربەلا: یەکێکە لە پارێزگاکانی عێراق و شەڕەکەی یەزیدی کوڕی موعاویە و ئیمامی حوسێن لە کەربەلادا ڕوویدا.

وە تیــــــغ بێــــــڕام، بڕنــــــدەی خەتـــــەر
چـــون (ابـــن ملجـــم)[١٥] نەکوشـــتەم حەیـــدەر[١٦]
چـــون نـــەمروود عاســـی، شـــای جـــەلیل[١٧] نـــەویم
نـــا ئـــەمری فـــەرمان ڕای خـــەلیل[١٨] نـــەویم
وە مووســـــام نەکـــــەرد ســـــیحر ســـــامری[١٩]
نـــــەوی جـــــە لای مـــــن مـــــەیل کـــــافری
قـــاپیم هـــۆر نەکەنـــد جـــە (بیـــت العقیـــق)[٢٠]
چـــون ئیبلـــیس[٢١] نـــەویم جـــە عیـــسیان غـــەریق
ڕاهگـــــیر کەعبـــــەی موعـــــەززەم نـــــەویم
مـــــوددەعیی ڕەســـــوول مووکـــــەڕڕەم نـــــەویم
نووتفـــەی ڕەســـوولم جـــە بـــێخ هـــۆر نەکەنـــد
تـــێغم نـــە ڕۆی پـــاك پێغەمبـــەر نەشـــەند

---

[١٥] ئەو پیاوەیە کە لە ئیمامی عەلی (ڕ.خ.)ی داوە و شەهیدی کردووە.

[١٦] نازناوی ئیمامی عەلیی کوڕی ئەبووتالّبە.

[١٧] یەکێکە لە ناوەکانی خودای گەورە.

[١٨] دیسان یەکێکی ترە لە ناوە جوانەکانی خودای گەورە.

[١٩] سامیری: ئەو جادووگەرە بوو لە سەردەمی پێغەمبەر مووسا (س.)دا گوێرەکەیەکی دروست کرد دەنگێکی تایبەتی لێوە دەهات و بەنی ئیسرائیل سوژدەیان بۆ دەبرد.

[٢٠] مەبەست لە کەعبەی پیرۆزە کە موسوڵمانان لە کاتی نوێژکردندا ڕووی تێ دەکەن.

[٢١] ئیبلیس: شەیتان، لە قورئاندا بە شەیتان و ئیبلیسیش ناوی هاتووە.

تەورات و ئینجیل[٢٢] تەحسیل نەکەردم
وە بەدنام پاك جوبریل نەوەردم
بیغەیر جە قورئان دەرسم نەوانا
غەیر جە تۆ بە کەس کەسم نەزانا
چون گومڕا کەم بەد، وەیسی یەمەن ماڵ
نەکەردم ئاهیر، سۆزان و زووخاڵ
جووق مەلایك، حامڵان عەرش
زومرەی ئەسحابان، فریشتان فەرش
هیچ کامێن بە دەست من نەوی ئەسیر
زانووی حەیدەرم نەپێکا وە تیر
ڕای حاجیانم نەبەست چون ڕاهزەن
ناقووسم نەژەند وێنەی ئاهریمەن
زەکەریام وە زام ئەڕڕە لەت نەکەرد
میر حەمزەم[٢٣] وە زەرب شمشێر قەت نەکەرد
نام ئەسحابان پاك دین ئیسلام
هیچ کەس وە بێ قەدر وە حەب نەوانام

---

[٢٢] دوو کتێبی پیرۆزن کە خودای گەورە ناردوونی بۆ بەندەکانی خۆی لە سەر زەوی.

[٢٣] ئیمامی حەمزە یەکێکە لە یارانی پێغەمبەر (د.خ.)، حەمزە کوڕی عەبدولموتەلیبی کوڕی هاشمی کوڕی عەبدولمەنافی کوڕی قوسەیە، لە هۆزی قوڕەیشە و پشتگیریی تەواوی پێغەمبەری دەکرد لە بیر و باوەڕدا و دەکاتە مامی پێغەمبەر، لە شەڕی بەدردا بە دەستی کۆیلەیەك شەهید بووە.

چون فیرعەون دەعوای خودابیم نەکەرد
جە دین ڕەسوول جودابیم نەکەرد
چون قاروون بە گەنج بە ماڵ نە نازام
چەنی ساز و باز دنیا نە سازام
ئەز جە دەرگات کەچبازیم چێش بی؟
پەی چێش دڵ وە خار خەتەرناك ڕێش بی؟
پەی چێش بێبەهرەی زەوق دنیا بیم؟
ڕەنجیدەی ئافاق، شادی سەنیا بیم
دڵ بی وە کۆرەی سەردی هەناسان
بێ نەسیبیت کەرد جە بالای خاسان
حەق بە دەست تۆن، شای نەزا و نە مەرد
نەکێشانت جەور، جەفا و داخ و دەرد
وە ڕەنجەڕۆیی و وە نامورادی
نەیاوا وەکام **خانەی قوبادی**[٢٢]

[٢٢] خانەی قوبادی: خانای قوبادی، مامۆستا عوسمان هەورامی پێی وایە مامۆستا کەمال نووری بە هەڵە ناوی خانای قوبادیی نووسیوە، بەڵام لە ڕاستیدا ناوەکەی خانا تەواوە و هیچ هەڵەیەکی تێدا نییە، بەڵکو خانای قوبادی خۆی بەو شێوەیە ناوەکەی بەکارهێناوە، لە چەند جێگەی تردا نووسیویەتی "خانەی قوبادی".

# میعراجنامە*

جـــە شــــەمع خــــاوەر، جـــە شــــەمع خــــاوەر
شــــەویٚ ڕۆشـــــنتەر جـــە شــــەمع خــــاوەر
نەغمـــــەی[١] نەســـــیمش چـــون دوود مەجمـــــەر
مـــــەبیٚزا بــــۆی چـــین[٢] زولـــف بـــۆ عەنبـــەر[٣]
عەرســـەی ســـەماوات، ســـەرزەمین جـــە نــــوور
مەدرەخــشا چــون شــەمع، تەجــەللای کــۆی تــوور[٤]

* ئەم میعراجنامەیە مامۆستا محەمەد عەلی قەرەداغی لـە بـەرگی پێنجـەمی کەشـکۆڵی کەلـەپووری ئـەدەبی کوردی لاپەڕە (١٠٥ – ١٠٩)دا بڵاوی کردۆتەوە. هەروەها مامۆستا محەمەد ڕەشید ئـەمینی لـە بـەرگی دووەمـی کەشکۆڵی هەوراماندا هێناویەتی و لە چەند لاپەڕەیەکدا بۆمانی ڕەوانـە کـردووە. ئـەم دوو دەقـە زۆر جیاوازییـان تێدایە، لە هەندێك شوێندا ئاماژەم پێ کردووە. ئەم میعراجنامەیە لەگەڵ میعراجنامەکـەی داسـتانی خوسـرەو و شیریدا لە هەندێك جێگادا وەکو یەکن و لە هەنـدێك کـی تـردا جیـاوازی زۆریـان هەیـە، لێـرەدا هەنـدێك لـەو جیاوازییانەمان خستۆتە ڕوو.

[١] لای (مع) نووسراوە "نەفخەی"، بەڵام لای (مپ) نووسراوە "نەغمەی"، "نەغمەی"م بە ڕاستتر زانی.

[٢] لای (مع) "مشك" نووسراوە، لای (مپ) نووسراوە "چین"، "چین"م بە ڕاستتر زانی.

[٣] لە (شین)دا دوو بەیت هاوشێوەی ئەم بەیتە هەیە:

چەتر چین چەرخ چون دیبای گوڵدۆز
مەدرەوشا جە دوڕ نەجم شەبنەفرۆز

لە بەیتێکی تردا هاتووە:

نــــەسیمش بۆی زوڵف شیرین مەبیٚزا
جەوهەرش بۆی موشك خوتەن مەخێزا

[٤] ئەم بەیتە لە (شین)دا بەم شێوەیە هاتووە:

شەویٚ وێنەی شەمع تەجەللای کۆی توور
عەرسەی سەرزەمین ڕەوشەن بی جە نوور

هـــه‌واش چـــون نه‌ســـیم،[١] وه‌نه‌وشـــه‌ی چـــه‌مه‌ن
مه‌به‌خـــشا بـــۆی موشـــك مـــودبیره‌ی[٢] خوتـــه‌ن
ئـــه‌و شـــه‌و (حَـسْبَ الحُكـم)[٣] به‌خـــشنده‌ی داوه‌ر
ســـــه‌یید ئـــــه‌فلاك، نـــــامووس ئه‌كبـــــه‌ر
چـــون مـــورغیٚ نه‌به‌نـــد قه‌فـــه‌س بـــۆ ڕه‌هـــا
پـــه‌رواز كـــه‌رد جـــه بـــورج (ســـدر المنتهـــی)[٤]
زومـــره‌ی موكـــه‌ڕڕه‌م، مـــه‌لائیك[٥] ســـه‌ف ســـه‌ف
هـــه‌ر یـــه‌ك یـــه‌ك ته‌بـــه‌ق، توحفـــه‌ی نـــوور بـــه كـــه‌ف
چـــه‌نی ئـــه‌و بـــوراق،[٦] چـــون بـــه‌رق ڕووی هـــه‌ور
بـــه یـــه‌ك ده‌م تـــه‌ی كـــه‌رد، جـــه مـــه‌ه تـــا بـــه ســـه‌ور
زیـــن نـــوقره‌ی ئه‌بیـــه‌ز، ســـه‌رزین حه‌ولـــه‌ی نـــوور

---

[١] لای (مع) نووسراوه "هەوا چون نەسیم"، لای (مپ) بە"هەواش چون شەمیم" هاتووە. "هەواش چون نەسیم" دروستترە.

[٢] ئەم وشەیە لای (مع) بەم شێوەیە نووسراوە "مدبرە"، ڕاستی وشەکە بەم شێوەیەیە "مودبیرەی"، واتە: ڕێکخەر، ئامادەکراو، دروستکراو، پێکهاتوو، چاودێر، دابینکەر.

[٣] بەپێی بڕیارەکانی خۆت، مەست لە بڕیارەکانی خودای گەورەیە.

[٤] داری سیدرەتولمونتەها، دارێکە لە ئاسمان. ئەم بەیتە لە (شین)دا بەم شێوەیە هاتووە:

میڕیخ ڕیکابش بۆســــا بـــــە ئیعزاز
پەی نەسرش هەم نەسر تایر کەرد پەرواز

[٥] لای (مع) نووسراوە "مەلایك موکەڕەم"، لای (مپ) بە "موکەڕدم مەلائیك" هاتووە، "موکەڕڕەم مەلائیك"م بە ڕاستتر زانی.

[٦] لای (مع) بە"چەنی بوراقی" نووسراوە، لای (مپ) بە "چەنی ئەو بوراق" هاتووە، "چەنی ئەو بوراق" دروستترە.

یـــالْ چـــون جەعـــد زولْـــف پـــڕ گـــرنج حـــوور[١]
ســـم چـــون قـــورس نـــوور خورشـــید ئـــەنوەر
نـــالْ وێنـــەی هـــیلال دوو هەفتـــەی قەمـــەر[٢]
بـــە حـــوجرەی شـــەریف شـــای (خـــیر الأنـــام)[٣]
بەردشـــان تەشـــریف، بـــە ســـەد ئیحـــتیرام
ســـوپادار جـــەیش، زومـــرەی ڕۆحـــانی
(حامِـــلُ الأحکـــام)، وەحیـــی ڕەببـــانی
بـــە میروەحـــەی بـــالْ، ئـــالای بـــۆ عەنبـــەر
بێـــدار کـــەرد ســـەیید ســـالار ســـەروەر[٤]
بـــە ئـــەدەب پـــێش وەنـــد کەلیمـــەی ئەســـرا[٥]
پـــەی ســـیرِ (آیـــاتْ، رِبِّـــهِ الکُـــبرَی)[٦]

---

[١] لە (شین)دا بەم شێوەیە هاتووە:

لوجام لاجیوەرد، سینەبەند جە نوور
ڕەشك تـوورەی زولْف پەڕ گرنج حوور

[٢] لە (شین)دا بەم شێوەیە هاتووە:

سم قورس یاقووت، سیای پەڕ شەفـاف
نالْ نوقرەی نەبیەز، مێخ مرواریی ساف

[٣] ئاماژەیە بۆ محەمەد پێغەمبەر (د. خ.).

[٤] لە (شین)دا بەم شێوەیە هاتووە:

بە میروەحەی بالْ قورس بۆ عەنبەر
بێدار کەرد جە خاو سالار مەحشـەر

[٥] ئاماژەیە بە ئایەتی (١) لە سوورەتی (الاسراء) لە قورئانی پیرۆزدا.

[٦] بەشێکە لە ئایەتی (١٨)ی سوورەتی (النجم) و ئایەتەکەش بەم شێوەیەیە: (لقد رأى من ءايت ربه الكبرى).

ئــــاخر وات: یــــا شــــەمع بــــەزم ڕیــــسالەت!
(قــــامعُ الأرکــــان)،[١] کــــوفر و زەلالــــەت
شــــای (کــــثیرُ اللُطــــف)،[٢] تــــەڵەبکارتــــەن
زومــــــرەی مــــــەلایك ئینتزارتــــــەن[٣]
ئەمــــشەو بــــە دەوڵــــەت، (ســــیّد الکــــونَــــین)[٤]
عــــەرش عــــەزیم کــــەر، بــــە فــــەرش نەعلــــەین[٥]
ڕەســــوول ئێــــد شــــنەفت، جــــە (روحُ الأمــــین)[٦]
خێــــزا بــــە ســــورعەت، نیــــشت وە پــــشت زیــــن[٧]
مــــەلایك یــــەك یــــەك، شــــاهانە دەســــتوور
دەرلاد کەردشــــان، زەڕفــــشان جــــە نــــوور

---

[١] بەرپەرچدانەوەی کۆڵەکەکان.

[٢] مەبەست لە سیفەتی خودایە و یەکێکە لە سیفەتە جوانەکانی خودای گەورە.

[٣] لە (شین)دا ئەم بەیتە بەم شێوەیە هاتووە:

شای (کثیر اللطف) بێــهەمتای وەهھاب
جە ڕای مەرحەمەت کەردش موستەجاب

[٤] ئاماژەیە بۆ پێغەمبەرمان محەمەد (د.خ.)، بە سەروەری هەردوو دنیا ناودەبرێت.

[٥] لە (شین)دا بەم شێوەیە هاتووە:

پۆسە ڕەزاشەن پــــادشای کەونــەین
تەخت عەرش کەری بە فەرش نەعلەین

[٦] دیسان مەبەست لە محەمەد پێغەمبەرە (د.خ.).

[٧] لای (مپ) ئەم تاکە بەم شێوەیە هاتووە: "هورێزا و خێزا نشت نەخان زین".

ســـا كـــه رايـــى بـــى، شـــاى شـــيرين خيتـــاب
هـــەر چـــوار موقـــەڕڕەب، گرتـــشان ڕيكـــاب[١]
چـــون نەســـيم ســـوبح، ئـــالآى ڕووح ئـــەفزا
ڕووشـــان كـــەرد نـــە ڕاى (مـــسجِد الأقـــصى)[٢]
ڕووح پـــــڕ فوتـــــووح، ئـــــەنبيا و ئـــــادەم
كـــەردن ئيـــستيقبال، ئـــەو شـــاى موكـــەڕڕەم[٣]
چـــەوگە بـــە لـــوتفى پـــەناى بنيـــاد خـــشت[٤]
بـــى بـــە پێـــشەواى پێغەمبـــەران گـــشت
ئـــاخر يـــەك ســـاعەت بـــە ئـــەمر داوەر
يـــاوا بـــە مـــەقام، ســـپەهر[٥] ئـــەخزەر

---

[١] لە (شين)دا بەم شێوەيە هاتووە:

ئيسرافيل چەنى مەلائيك بـە دەور
گرتشان ڕيكاب هومايوون ئـەو

[٢] لە (شين)دا ئەم بەيتە بەم شێوەيە هاتووە:

جوبرەئيل چـــەنى مەلەء ئـــەعلا
ڕووشان كەرد نە ڕاى (مسجد الاقصى)

[٣] لە (شين)دا بەم شێوەيە هاتووە:

ڕۆح هومايوون ئەنبيا و ئـادەم
ئامان وە پێشواز سـەييد خاتەم

[٤] ئەم تاكە لاى (مع) نيوەى نيشانەى (!)ى لە سـەر دانرابوو، بەڵام لاى (مپ) ڕاستتر نووسرا بوو.

[٥] ئەم وشەيە لاى (مع) نيشانەى (!) لە سەر دانراوە، بەڵام لاى (مپ) خوێنراوەتەوە و من چاكم كرد.

خـــرۆش کـــەفت نـــە ئـــەهل (أعلـــی عِلّـــیین)
هـــا تەشـــریف ئـــاوەرد، (فَخـــرُ العـــالمین)[١]
جـــە ســـومعەی قودســـی کـــەڕووبی کـــەنیا
کـــــۆس فـــــەزڵ زات، ئەحمـــــەدی ژەنیـــــا
چـــەند هـــەزار مەلـــەك، چـــەنی (حـــورُ العَـــین)
ئامـــــا بـــــە پێـــشواز، شـــــەفیع دارەیـــــن
زومـــــرەی ڕۆحـــــانی، قودســـــیان تـــــەمام
گـــشت ئامـــان وە کـــۆی ئـــەو خەیرولئـــەنام[٢]
مـــانگ و خـــۆر چـــەنی ناهیـــد و بـــەرجیس
بۆساشـــان ڕیکـــاب، بـــە ڕەسمـــیێ تـــەمیس[٣]
عـــــەتارود دەرلاد، نەخامـــــەی نـــــامیش
ڕەقـــەم دا بـــە شـــای ئینـــشای غـــولامیش

---

[١] هەم دیسان مەبەست لە محەمەد پێغەمبەرە (د.خ.). ئەم بەیتە لە (شین)دا بەم شێوەیە هاتووە:

چەنی چەندین فەوج (اعلی علیین)
بشی وە پای تەخت (رب العـالمین)

[٢] ئەم دێرە لای (مع) نییە.

[٣] لای (مع) ئەم وشەیە بەم شێوەیە نووسراوە "ڕەسم سیس"، بەڵام لای (مپ) بەم شێوەیە نووسراوە "ڕەسمیێ تەمیس"، لای (مپ) ڕاسترە. هەروەها لە (شین)یشدا بەم شێوەیە هاتووە:

بەرجیس و ناهید، کەیوان و بەهرام
بە خەتت شەریف عەتارید تەمـام

شـــيعرەى يـــەمانى، چـــون شـــيعراى قابـــڵ
ئينـــشاى مـــەدحش وەنـــد، بـــە ديـــد و بـــە دڵ[1]
ســـوغرەى مونقـــەليب،[2] ســـەماك ئـــەعزەل
هـــەر دوو بـــين پـــابۆس، بەشـــير مورســـەل[3]
چـــەنى جـــەوزا و شـــوور، عـــەزراج و زوهـــەر
وێنـــەى بەنـــدەگان، بەســـتـــشان كەمـــەر
ســـا كـــە باڵاتـــەر، هـــەم كـــەردش عـــورووج
پـــا نيـــا نـــە خـــەت (مَنطِـــقُ الـــبروج)
ســـتارەى زوحـــەل، ئـــەكليل دڵجـــۆ
ســـونبولە و ئەســـەد، مـــەريخ بـــەدخۆ
بۆساشـــان ڕيكـــاب، ســـەعادەتمەندش
دامـــان خەرقـــەى داناپەســـەندش
بـــاقى ئەنجوومـــەن، چـــەنى ســـوورەيپا
واتـــن: يـــا ڕەســـوول! بـــە ئـــەمر ئـــەڵلا
ئامـــا بـــە پێـــشواز، شـــاى شـــەوكەت ليقـــا
(تعـــال يـــا ســـلطان)، ســـيڕ ســـەر والآ

[1] ئەم تاكە لاى (مع) خاڵ لە جێگەى دانراوە، ديارە بۆى نەخوێندراوەتەوە، بۆ ساغكردنەوە سوودمان لە (مپ) وەرگرتووە.

[2] لاى (مع) ئەم وشەيە باش بۆى نەخوێندراوەتەوە و بەم شێوەيە نووسراوە (سقر مقطب!).

[3] لە (شين)دا بەم شێوەيە هاتووە:

سەبعەى سەييارە چەنى ماه و خۆر
كەردشان پابۆس سەييد ســەروەر

ئـــاخر بـــه فـــه‌رمان، لامـــه‌كان مـــاوا
فـــه‌ڕڕ مه‌قـــده‌مش بـــه ســـیدره یـــاوا[١]
جوبره‌ئیـــل پـــێچ وه‌رد، وێنـــه‌ی زوڵـــف یـــار
عـــه‌رز كـــه‌رد بـــه جـــه‌ناب، ســـه‌یید موختـــار
واتـــــش: (یـــا رَســـول! اللهُ مَعَـــك
هـــذا فِـــراقٌ بَینـــی وَبَینَـــك)
ڕه‌ســـوول وات: یـــا بـــه‌حر فـــه‌زڵ ڕه‌ببـــانی!
تـــۆ مـــن بـــه تـــه‌نیا، ئـــه‌و كـــۆ مـــه‌كیانی؟
جوبره‌ئیـــل واتـــش: (یـــا خَـــیر البَـــشَر)
ئـــه‌ر زه‌ڕێـــو جـــه‌ی جـــا، پـــا بنیـــۆ وه بـــه‌ر
ده‌رلاد بـــه شـــوعاع، شـــه‌مع ئـــالآی نـــوور
مه‌سووچـــۆن ده‌رلاد، په‌روانـــه ده‌ســـتوور
ڕه‌ســـوول ئێـــد شـــنه‌فت جـــه (روحُ الأمـــین)[٢]
شـــێویا چـــون زوڵـــف، زه‌ریـــف موشـــكین

---

[١] له (شین)دا ئه‌م به‌یته‌ش به‌م شێوه‌یه هاتووه:

بـــه تـــه‌ئید زات حـــه‌یی بێـــهه‌متا
ته‌شریف به‌رد به سه‌در سیدره‌ی مونته‌ها

[٢] لێره‌دا مه‌به‌ست له جوبره‌ئیله، هه‌ر چه‌نده به پێغه‌مبه‌ر ده‌ڵێن: (روح الأمین)، به‌ڵام دوو جار ناوی پێغه‌مبه‌ر له یه‌ك نیوه دێردا بێت، مانای دێره‌كه ته‌واو ناكات، بۆیه خانا به پێغه‌مبه‌ر ده‌ڵێت: ڕه‌سوول و به جوبره‌ئیل ده‌ڵێت: (روح الأمین).

چـــون نەســـيم جـــە چـــين زولـــف بـــۆ عەنبـــەر
جـــە ســـەواد عـــەرش عـــەزيم كـــەرد گـــوزەر
مـــــەحرەمان غـــــەيب، دەرلاد بـــــە زەروور
ئـــاوەردەن پـــەرێش ژە ڕەفـــڕەف جـــە نـــوور
ســـەوار بـــى ڕەســـوول بـــە ڕەفـــڕەف، هـــەى كـــەرد
عەرســـەى لامـــەكان بـــە يـــەك دەم تـــەى كـــەرد[1]
وەقـــتێ بـــــە ئەقـــساى لامـــــەكان يـــاوا
لـــــەرزا وێنـــــەى تـــــوولْ نـــــەوخێز ســـــاوا
ئامـــا نيـــدا لـــێش: خـــەوف مەكـــەر جـــە مـــن
(ادنِ يـــــــا محمـــــــود! مُجتَبـــــــى ادنِ)
ســـا كـــە ئێـــد شـــنەفت، دەرلاد بـــە عيـــززەت
يـــاوا بـــــە مـــــەقام، فەرخونـــــدەى وەحـــــدەت
چـــەوگە زەبـــان بەســـت، يەكـــسان بـــى خـــامۆش
چـــون مەســـت موشـــكين، تـــەمام بـــى مـــەدهۆش
جـــەو دەمـــــدا وات پـــێش فەرخونـــــدەى داوەر:
(سَـــلامٌ عَلَيـــكْ يـــا خَـــيرُ البَـــشَر!)[2]

---

[1] لە (شين)دا بەم شێوەيە هاتووە:

قۆلش گرت جەناب جوبرەئيل بە ناز
سوار بى حەبيب حەيى بێنيـــــاز

[2] واتە: سەلامت لێ بێت، ئەى ئەو كەسەى كە باشترين كەسى بۆ مرۆڤايەتى.

چێشەن موددەعات، من پەی تۆ کەسم؟
عەرز کەر وە جەناب زات ئەقدەسم
ڕەسوول وات: یا حەی (لا یموت سامِع)[1]
موبەڕڕا جە شیرك، سەعتی بێ مانیع!
ئیستیدعام ئێدەن جە (یومُ القَرار)
زومرەی ئومەتم، شوومەن، شەرمەسار
ببەخشی بە فەزڵ بێشومار وێت
بە عەفوو عەزیم کەس نەدار وێت
حەق وات: یا ڕەسوول، نادیرەی ئەییام!
تۆنی خۆ شەفیع زومرەی خاس و عام
چونکە من دایم عادەتم عەتان
زات ئەقدەسم، بەخشندەی خەتان
ها بەخشام بە تۆ، ئومەتان تەمام
وەش ئامای بە خەیر، (باقی والسلام)
ڕەسوول جەی موژدە، شادیی یاوا پێش
سوجدە بەرد بە زات، بینای بێئەندێش
موراجەعەت کەرد جە سەفەر بە شەوق
یاوا بە جای وێش، بە سەد شادی و زەوق

---

[1] مەبەست لە خودای گەورەیە.

یـــا قـــەیووم فـــەرد، مونفەریـــد بـــە زات!
نەقـــشبەند تەســـویر کولـــل مـــەوجوودات!
بـــە فـــەزلّ ڕەســـوول ســـاحێب تـــەخت و تـــاج
ئـــەو شـــەو بـــە عیـــززەت بـــەردت وە میعـــراج
**خانـــای قوبـــادیی** خـــاتر بەڕکەنـــدەن
پـــەی چـــی جـــەی دنیـــا، عاســـیی شـــەرمەندەن؟[1]
ببەخـــشیش تەقـــسیر جـــە (یـــومُ الحـــساب)
نـــەدارۆ تاقـــەت، ئەشـــکەنجەی عـــەزاب
نییـــەن غـــەیر جـــە تـــۆ، ئومێـــدش بـــە کـــەس
جـــە یاگـــەی تەنگـــدا، بـــە فـــەردیادش ڕەس

[1] ئەم تاکە لای (مپ) بەم شێوەیە نووسراوە "پەی چێش جە دنیا عاسی و شەرمەندەن".

# وەلاڵ نمەبۆ *

وەلاڵ نمــەبـــــۆ، وەلاڵ نمـــەبــــۆ
سیــــــاسەنگ هــــەرگیز، وەلاڵ نمەبۆ

* ئەم هۆنراوەیەم لە کەشکۆڵی عەبدولڕەحمانی کوڕی شێخ عەباسەوە وەرگرتـووە، شـیعرێکی پەنـدئامێزە و لـە بەرگی یەکەمی حەدیقەی سوڵتانیدا بە ناوی "پەندنامەی میرزا شەفیع"ی کولیاییەوە هاتووە و لـە تەنیـشتییەوە نووسراوە (مشکوك). گومانم لەوەدا هەیە کە مامۆستا سوڵتانی بۆچی لەم بەشـەیدا بـە نـاوی مـیرزا شـەفیعەوە نووسیویەتی و دواتـر گوتوویـەتی: نـازانم هـی کێیـە. هـەروەها لـە لای مامۆسـتا ئـەمین کوجـەرییش کـە لـە سەفەرێکمدا بۆ بەرهەمەکانی میرزا شەفیعی کولیایی داوای یارمەتیم لێ کرد، تەماشام کـرد ئـەم شـیعرەی بـە ناوی میرزا شەفیعەوە لە هەمان سەرچاوەوە وەرگرتـووە و هـیچ ئاماژەیـەکی پـێ نـەکردووە، هەڵبەتـە ئـەوەم پـێ ڕاگەیاند کە ئەم پارچە شیعرە لە کەشکۆڵێکدا بە نـاوی خانـای قوبادییـەوە لای مـن و مامۆسـتا حەمەڕەشـیدی ئەمینی هەیە و کەشکۆڵەکەش جێگەی بڕوایە، ئیدی نازانم مامۆستا کوجـەری دوای مـن دەسـتکاریی کارەکـەی دەکات یان نا؟! دەبێ ئەوەش بڵێم هەتا ماڵئاواییم لێ کرد، دڵنیای کردمەوە کـە کۆپییـەکی ئـەو دەستنووسـەی خۆیم پێ دەدات، تا ئێستا هیچ شتێکیم بە دەست نەگەیشتووە. بەداخـەوە ئـیتر وەڵامـی تەلەفۆنیـشی نەدامـەوە، هەروەها لە نوسخەکانی مامۆستا حەکیمیشدا بە جیاوازییەوە هەبوو. ئەم پارچە شیعرە لـە حەدیقـەی سـوڵتانیدا (٦٢) بەیتە و لە کەشکۆڵەکەدا (٦٠) بەیتە، جیاوازی لە نێوان دەقەکەیشدا بەدی دەکرێت. بێسارانیی شاعیریش پارچەیەك شیعری هەیە لەسەر هەمان کێش و وەزن و بریتییە لە (٨) بەیتـە شـیعر، بـەڵام خانـای قوبـادی ئـەم شیعرەی لەژێر کاریگەریی بێسارانیدا هۆنیوەتەوە:

نــــاڵەی دەردار بێ ئاخ نمەبۆ          دەروون عـــاشق بێ داخ نمەبۆ
عاشق تا دەمی جـــەفاش نمەبۆ          بێ جەفا هەرگیز سەفاش نمەبۆ

دیسانەوە مەلا عومەری ڕەنجووریش هۆنراوەیەکی لە ژێر کاریگەریی بێسارانیی شاعیردا گوتووە و بریتییـە لـە (١١) بەیت:

نــــاڵەی دەردار بێ ئاخ نمەبۆ          دەروون عـــاشق بێ داخ نمەبۆ
عاشق تا دەمی جـــەفاش نمەبۆ          بێ جەفا هەرگیز سەفاش نمەبۆ

بەڵام مەلا عومەری ڕەنجووری وەکو خانای قوبادی نەیتوانیوە ڕێچکەکەی بێسارانی بگرێت و پەرەی پێ بدات.

ئــــەتلەس و خــــارا، وە شــال نمەبۆ
ئــــەبلە وە خـــــەیال، وە مال نمەبۆ
گول غونچەی گولان، بیّ خــــار نمەبۆ
یاری بیّ بەینەت، وە یـــــــار نمەبۆ
نــاقابیل هەرگیز، قــــــابیل نمەبۆ
خاسی جە نــــــاکەس، حاسل نمەبۆ
یـــــــەکڕەنگان دەور، دووڕەنگ نمەبۆ
دۆستی و موحـــەببەت، وە جەنگ نمەبۆ
ئــــــــەسیل و نەجیب، نــاکەس نمەبۆ
بەدئەسل و نـــــاکەس، وە کەس نمەبۆ[1]
قومری و قــاژە[2] و قووش، قەقنووس نمەبۆ
بولبول وە توتی و کـــــەرکـــەس نمەبۆ
ڕوبا موبــــاریز، پـــــــەی شێر نمەبۆ
دێوانــــــە دانـــــــا، حیز ژێر نمەبۆ
جــــــە موردار نـــافەی تەتار نمەبۆ
دەبــــــاغی، دووکان عەتتـــــار نمەبۆ
دانشمەند هەرگیز، فـــــــانی نمەبۆ
پیری چون ئــــــــامــا، جوانی نمەبۆ

[1] بەیتە لە (حد)دا هاتووە و لە کەشکۆلەکەی لای مندا نییە.

[2] ئەم وشەیە لە کەشکۆلەکەدا نووسراوە "تاژ". لە (حد)دا نووسراوە "قاژ". ئێمە "قاژ"مان بە دروستتر زانی.

هونەرمەند هەرگیز کـــــەم چیز نەبۆ
خواتـــــەرس هیچ وەخت[٣] خوونڕێز نەبۆ
زاهید هیچ وەختێ[٤] غـــــەمبار نەبۆ
بێئەسڵ و نـــەسەب تـــەییار[٥] نەبۆ
دز[٦] و درۆزن، ســــــــــادق نەبۆ
فـــاڵگیر وە حەکیم حـــــــازق نەبۆ
مـــــورشـید بێعیلـــم، وە پـــیر نەبۆ
ئـــەمانەت فـــــەرزەن،[٧] دەستگیر نەبۆ
سۆفی وە حـــــەی حـەی، دڵساف نەبۆ
مـــــەردی و شوجاعەت، وە لاف نەبۆ
دەروێشی وە پـــــرچ، وە دەف نـەبـــۆ
ئـــــــەڵماس وە ڕەفیق، خەزەف نەبۆ
شێخی وە شونیل کـــــــەڵپۆس نەبۆ
عاشق بە نەعرەی یـــــــا دۆس نەبۆ

---

[٣] نووسراوە "وەقت".
[٤] لە (حد)دا نووسراوە "وەقتێ".
[٥] لە (حد)دا نووسراوە "تەبار".
[٦] نووسراوە "دزد".
[٧] بە "فەرزییەن" هاتووە.

سەڵتەنـــەت وە زوڵم، وە جـــەور نمەبۆ
قەزاوەت وە خوڵق، بـــــەدتـەور نمەبۆ
بزورگی بیٚ ســـــەرف نـــــەزەر نمەبۆ
پووڵ،[٨] ڕاحـەت جـــــــە ڕاگوزەر نمەبۆ
عالمی بـــــەداد، بـــــەقاڵ نمەبۆ
بیٚتەحسیل عیلم، چـــــەند ساڵ نمەبۆ
بیٚ پـــــەیڕەوی شـــــەرع، ئیسلام نمەبۆ
حـــــەلاڵ وە هـــامتای حەرام نمەبۆ
عـــــــادڵ هیچ وەختیٚ[٩] گومنام[١٠] نمەبۆ
نیکوکار هیچ وەخت بـــــەدنـام نمەبۆ
زاڵم وە هـامتەرز عـــــــادڵ نمەبۆ
ســـــــــەفیه وە هامڕاز عاقڵ نمەبۆ
مـــەستی و مـــــەدهۆشی، وەکار نمەبۆ
زاڵم ســـــــەفیه، هـــــــۆشیـار نمەبۆ
قومارباز هـــــەرگیز، مـــــاڵدار[١١] نمەبۆ
بیٚ پـــــــــەڕوپۆ، مورغ، بـاڵدار نمەبۆ

---

[٨] نووسـراوە "بەل".
[٩] بە "وەقتیٚ" نووسراوە.
[١٠] نووسراوە "فام".
[١١] نووسـراوە "باڵدار".

فیتنە و قسەی بەد،[12] وە دۆس نمەبۆ
بێوەی بەدفەڕجام، عەرووس نمەبۆ
زاڵمزادە شەخس، عادڵ نمەبۆ
بەین ساحێب شەرت، باتڵ نمەبۆ
خەرموورەفرۆش، لاڵناس نمەبۆ
شیشە وە ڕەفیق ئەڵماس نمەبۆ
ڕوبا وە سنجاب، سەموور نمەبۆ
بوڵەندی و ئیقباڵ، وە زوور نمەبۆ
نامەرد وە گەزاف، وە مەرد نمەبۆ
هیچ ئادەمیزاد، بێدەرد نمەبۆ
مەینەت دونیا، هیچ کەم نمەبۆ
دڵ ئەگەر سەنگ بۆ، بێغەم نمەبۆ
بەزم بزورگان، بێساز نمەبۆ
نازداران تا سەر، وە ناز نمەبۆ
ئەشرەفی هەرگیز وە خاک نمەبۆ
خانەی گومانان، دڵپاک نمەبۆ

[12] نووسراوە "بەر".

ڕاستی جـــــه ژەنان،[13] مـەیسەر نمەبۆ
وەفاشان پـــــەی کەس تـــا سەر نمەبۆ
تەڕیدە تـــــا سەر، ئــــازاد نمەبۆ
مـــــایـــــەی حەرامی، زیاد نمەبۆ
دوشمنی ئـــــەیلات، عـــەبەس نمەبۆ
شیشەی شکستە پـــــــەیوەس نمەبۆ
کاسبیی حـــــەڵاڵ، بــــــەریاد نمەبۆ
هـــــــەم کەسب حـەرام، زیاد نمەبۆ
ســـــــــەرحەد نشینان، بێخۆف نمەبۆ
کـــــوێستان[14] بێبـــەرف، بێتۆف نمەبۆ
زاڵم وە مـــــــــەحبووب بێچوون نمەبۆ
هـــــەم مەزڵووم تا سەر، زەبوون نمەبۆ
سکەی قـــــــەڵب هەرگیز ڕەواج نمەبۆ
نـــــــاکەس وە تەوبیخ، عیلاج نمەبۆ
دەوڵـــــــەتمەند[15] هەرگیز، بێفەڕ نمەبۆ
هـــــــــەم مەرد سەخی، دەسبڕ نمەبۆ

---

[13] مامۆستا ئەم وشەی بۆ نەخوێنراوەتەوە و خاڵی بۆ داناوە، بەڵام لە لای (سوڵتانی) بە "ژنان" هاتووە، منیش ئەو وشەیەم بە پێویست زانی و ئەو شوێنەم پێ ڕاست کردەوە.

[14] لە نوسخەکەی تردا بە "کۆهستان" هاتووە.

[15] لە نوسخەکەی تردا بە "دانشمەند" هاتووە.

بـــــــەخیل و حەسوود، مەشهوور نمەبۆ
بـــــەخشەندە و دڵپاك، مەقهوور نمەبۆ
پـــــــــاك و خولاسە، ناپاك نمەبۆ
مونعیم هیچ وەختێ،[١٦] غـــەمناك نمەبۆ
گوفتار وە[١٧] بێ پوول، قـــــەبووڵ نمەبۆ
نـــان جــــــە لای مەلا، وسووڵ نمەبۆ
ئــــــــــاغە وە بابۆی[١٨] نۆکەر نمەبۆ
عاتیفە و ڕەعیەت تـــــــا سەر نمەبۆ[١٩]
بـــــــــەدتەور جە بەدی، تەفریق نمەبۆ
تــــــا سەر چەنی کەس، شەفیق[٢٠] نمەبۆ
جــــــــە لای نۆ، کیسە، تامڵ نمەبۆ
مــــــــەرد کەللەدێز،[٢١] عـــاقڵ نمەبۆ
خـــــــــاس بە واتەی بەد، وە بەد نمەبۆ
قـــــــــــاڵی وە هامتای نمەد نمەبۆ

---

[١٦] بە "وەقتێ" هاتووە.
[١٧] ئەم (وە) لە (حد)دا نەهاتووە.
[١٨] لە (حد)دا بە "ئاغەبان و بێ" هاتووە، ئێمە ئەوەی نوسخەکەمان بە دروستتر زانی و دامان ناوە.
[١٩] لە نوسخەکەی تردا بە "عاتیفە تاسەر، ڕەعیەت نمەبۆ" هاتووە.
[٢٠] نووسراوە "ڕەفیق".
[٢١] لە نوسخەکەی تردا بە "کەللە و دێز" هاتووە.

هەرزەکـــەلامان خـــــــــامۆش نمەبۆ
عـــــەیبجۆ، سوخەنچین، سرپۆش نمەبۆ[٢٢]
نـــــامەڵاح هیچ وەخت،[٢٣] غەوواس نمەبۆ
هەورێشم[٢٤] وە پۆی پـــــــــەڵاس نمەبۆ
ئەسڵ و نــــــەسەب[٢٥] خاس، بەدنام نمەبۆ
ئـــــــــادەمی عـــــــاقڵ، نـــەفام نمەبۆ
ڕەفیق عـــــــــــەقرەب، بێ نێش نمەبۆ
بێگانە هـــــــــــەرگیز، وە خوێش نمەبۆ
گوڵ بێ خـــــــــــار، ئاگر بێ دوود نمەبۆ
سەرمایەی حـــــــــــەڵاڵ، بێسوود نمەبۆ
خـــــــــــاس وە بێ خراو، قەدرش نمەبۆ
تـــــــــــا هیلال نـــەبۆ، بەدرش نمەبۆ
بـــــــــــــەهار بێ باران، وە فەڕ نمەبۆ
ئـــــــــــاهەن، پۆڵا و مس وە زەڕ نمەبۆ
ئـــــــــــاینەی ڕەوشەن، وە ساج نمەبۆ
بـــــــــاغە و شێر مایەی وە عاج نمەبۆ

---

[٢٢] ئەم بەیتە لە (حد) وەرگیراوە و لە کەشکۆڵەکەی لای مندا نییە.

[٢٣] بە "وەقت" هاتووە.

[٢٤] لە نوسخەکەی تردا بە "ئەبرێشم" هاتووە.

[٢٥] لە نوسخەکەی تردا بە "مەنسەب" هاتووە.

نــــــاخەڵەف جادار[٢٦] سەلەف نمەبۆ
هــــــەر قەترە جادار، سەدەف نمەبۆ
مــەرد نامەرد، نامەرد، وە مەرد[٢٧] نمەبۆ
تــــاق وە جفت زەوج هەمفەرد نمەبۆ[٢٨]
شەخسێ شکــــەمدۆس، بێدەرد نمەبۆ
ڕاسگۆ جــــە دارەین، ڕەنگ زەرد نمەبۆ
کــــەمخۆر هیچ موحتــاج دەوا نمەبۆ
پــــــەڕخۆری دەروون، دەوا نمەبۆ
خانـــــا[٢٩] بێ پەند و ئەندەرز نمەبۆ
پــــەندش[٣٠] شیرینتەر جەی تەرز نمەبۆ
هــــەر مەردیش بێچەم، بێگۆش نمەبۆ
جــــە واتەی خانـــا،[٣١] خامۆش نمەبۆ

---

[٢٦] لە دەستنووسەکەدا بە "جاکەس" هاتووە.

[٢٧] لە بری "وە مەرد" نووسراوە "نامەرد وە مەرد".

[٢٨] ئەم نیوەبەیتە لە (حد)دا نووسراوە: "تاق وە جوفەت زەوج، هەم وە فەرد نمەبۆ".

[٢٩] نووسراوە "شەفیع وە بێ".

[٣٠] نووسراوە "پەندیش".

[٣١] لە بری "خانا" نووسراوە "شەفیع".

## زوننارم بەستەن*

زوننارم بەستەن، زوننارم بەستەن
جەو ساوە پەی تۆ زوننارم بەستەن
شیشەی نام و نەنگ تەقوام شکەستەن
ئەعزام جە بادەی مەیل تۆ مەستەن
ئەزانم سەودای سەودای بالآتەن
قەدقامەتم زکر خالّ ئالآتەن
تا وە زولّف و رووی تۆ تەماشامەن[1]
ئەدای نمای فەرز سوبح و عیشامەن
سەجادەم وە هوون زامان رەنگ کەردەن
سوژدەم وە میحراب ئەبرۆی تۆ بەردەن
هوونم چ حاکم، چ قازی، چ شێخ
واجب مەزانان برێزان وە تێغ
جار بدەن وە ناو کووچە و شاراندا
وە عیببەرتم کەن جە بازاڕاندا

---

* هەمان سەرچاوەی پێشوو. (مپ).

[1] ئەم دێڕە شیعرەیش لە لاپەڕەی (١٣٧) دیوانی مەولەویدا وەك تاكە دێڕێك هاتووە، لێرەیشدا بە ناوی خاناوە دەركەوتووە، وا دەردەكەوێ ئەو تاكە دێرە هی مەولەوی نەبێ، هەر ئەم پارچەیە لە كەشكۆڵی بەرگی یەكەمدا وەك بەشێك لە پارچە شیعرێكی "فەخرولعولەما" هاتووە، وا دەردەكەوێت كە هی خانا بێت و كەڵكی لێ وەرگرتبێت. دیارە ئەم شیعرەی لەو كاتەدا داناوە كە هەندێك لە زانایان و دادوەران فتوای كوشتی خانایان داوە، ئەوە تەنها وەك بۆچوونێكی خۆمە و بەس. (محەمەد ڕەشیدی ئەمینی- پاوە).

**بواچـــــان: خانـــــای قوبـــــادی مەســـــتەن**
**بـــەد عەهـــدی کـــەردەن زوننـــارش بەســـتەن**
**نـــــەزانان خانـــــا وە مـــــەیلت مەســـــتەن**
**جانفیـــــدای ڕۆژ (یـــــوم الألـــــســـــت)ەن[٢]**

[٢] ئاماژەیە بە ئایەتی (١٧٢) لە سوورەتی (الأعراف)، ئایەتەکە درێژە و خانا ئاماژەی پێ کردووە.
"فەخرولعولەمای سنەیی"ش لە ژێر کاریگەریی هۆنراوەکەی خانادا هۆنراوەیەکی بەم شێوەیەی نووسیوە:

ئـــــازیزم بـــــەستەن، ئـــــازیزم بـــــەستەن
جـــــەو ســـــاوە جـــــە ڕات زوننـــــارم بەستـــــەن
شیـــــشەی نـــــام و نـــــەنگ، تەقـــــوام شکەســـــتەن
ئەعـــــزام جـــــە بـــــادەی مـــــەیل تـــــۆ مـــــەستەن

بەشی کۆتاییی هۆنراوەکەی فەخرولعولەما:

ئـــــەدا زەکـــــاتم نـــــسارم ڕۆحـــــەن
وە خـــــاك پـــــای تـــــۆ، هـــــەزار فتـــــووحـــــەن
وە حـــــەڵقەی زولفـــــت هـــــا زوننـــــار بەســـــتم
"ســـا عـــالـــــەم زانـــــۆ، ســـــەنەم پەرەســـــتم"
وە بـــــادەی دیـــــدەت مـــــەســت ئەلـــــەستم
"ســـا عـــالـــــەم زانـــــۆ، ســـەنەم پەرەســـتم"
سەرحـــــەڵقـــــەنـــــشین بـــــەزم مـــــەیخانەم
تـــــەرســـــا پەرەســـــتم، کڵێـــــسا یـــــانـــــەم
ســـــەرنوویـــــشت وێـــــش، بوتپەرەســـــتم کـــــەرد
ســـــاقی جـــــە ئـــــەزەڵ وە مـــــەی مەســـــتم کـــــەرد
خـــــۆ ســـــروشت گـــــشت بـــــە دەســـــت وێـــــشـــــەن
مـــــن بەدسروشـــــتم ســـــا چـــــارەم چێـــــشـــــەن

## تؤتي من تشاء*

(تـــؤتي مـــن تـــشاء، تـــؤتي مـــن تـــشاء[١]
يـــا مالـــك الملـــك! تـــؤتي مـــن تـــشاء[٢]
واجـــب الوجـــود! لا احـــصى ثنـــا)
مونـــەززەھ جـــە عـــەیب، عـــاری جـــە مـــەنا
لاشـــەریك بـــە زات، یـــەكتای یەگانـــە
نـــازكێش زومـــرەی قـــەوم[٣] و بێگانـــە
حـــەیی لایـــەمووت، بـــیٚ میـــسل و مانەنـــد
بینـــای بێنـــەزیر، بێهـــەمتا و فەرزەنـــد
بێتـــەحت و بێفـــەوق، یـــەمین و یەســـار
بێفـــەنا و عـــەدەم، (واحـــدُ القهـــار)[٤]
قـــەییووم و قـــایم، قـــەدیم موتڵـــەق[٥]
فەرازەنـــدەی ســـەقف،[٦] نـــۆ تـــاق ئـــەزرەق

---

* هەر لەو سەر چاوەیەدا ئەم پارچەیش بە ناوی "موناجاتی خانا"وە هاتووە. (محەمەد ڕەشید ئەمینی- پاوە). دواتر لەناو نوسخەكانی مامۆستا حەكیم مەلا ساڵحیشدا ئەم شیعرە هاتبوو، هەردوو نوسخەكەمان بەراورد كرد. هەندێك بەیت لای مامۆستا حەكیم هەبوون و لە نوسخەی سەرچاوەدا نەبوون. هەر بەیتێك لە جێگەی خۆیدا دامان ناون و ئاماژەمان پیٚ كردوون.

[١] بەشێكە لە ئایەتی (٢٦)ی سوورەتی (آل عمران).

[٢] دیسان بەشێكە لە ئایەتی (٢٦)ی سوورەتی (آل عمران).

[٣] لە (حك)دا نووسراوە (قەوم).

[٤] دوو ناون لە ناوەكانی خودای گەورە.

[٥] هەموویان ناوی خودای گەورەن.

[٦] لە (حك)دا نووسراوە (تاق).

قەدیر و سەمیع، بەسیر و وەحید[٧]
دانای بێزەواڵ، عالم و مورید
جە نوورت نە میهر، زەڕڕێو دان دیار
جەو زەڕڕەی زەڕ بۆ کەردەن ئاشکار
هەر پەستی بە[٨] ئەوج، عیززەت ڕەسانی
بە پەستی ئەفگەن، هەر حوکمڕانی
کەریم کارساز، فەرد (کُن فَکان)
عەلیم وە ئەسرار، ئاشکار و نەهان
(یالمحیّ الموت موجود المواد!
یا منوّعات صبور الایجاد![٩]
یا صانع بصنع)، ئەشیای تەحت (و)[١٠] فەوق!
یا غەمرەوای ڕەنگ، خاتران بە شەوق![١١]
یا بێ (اکل و شرب)،[١٢] ئەهل ڕۆحانی!
یا ڕازق ڕیزق، زومرەی نەفسانی!

---

[٧] ئەمانەش هەموویان ناوی خودای گەورەن. ئەم بەیتە لای (حك) نیوەبەیتەکانی پێش و پاش خراون.
[٨] لە (مپ)دا نووسراوە (بەو).
[٩] ئاماژەیە بە ئایەتی (٢١) لە سوورەتی (المعارج).
[١٠] لێرەدا پیتی (واو)ێکی کەم بوو، بە باشمانزانی کە ئەو پیتە لێرەدا زیاد بکەین.
[١١] ئەم بەیتە تەنها لە (حك)دا هەیە.
[١٢] بەشێکە لە ئایەتی (٢٨)ی سوورەتی (القمر).

زینـــەتئارای نـــەقش، ئـــەنجووم نـــۆ ئـــەفلاك!
یـــا ترازەنـــدەی گـــولآن نـــە ڕووی خـــاك!
بـــە حاجـــەتی نـــوور پـــاك بولبەشـــەر
بـــە شـــەهد شـــیرین، جـــام جـــۆی کەوســـەر
بـــە ئـــەسمای شـــەریف، عـــەزیم ئـــەعزەم
بـــە وانـــای ئایـــەی: (ظلمنـــا)ی[١٣] ئـــادەم
بـــە تەهلیلـــەی زیکـــر، حـــامیلان عـــەرش
بـــە تەســـبیح ویـــرد، ســـاکینان فـــەرش
بـــە شـــاخەی شـــەهپەڕ، بـــاڵ جوبرەئیـــل[١٤]
بـــە قـــەبز ئـــەرواح، دەســـت عیزرائیـــل[١٥]
بـــە پەیمانـــەی ڕیـــزق کـــەیل میکائیـــل[١٦]
بـــە زەمزەمـــەی نـــەفخ ســـوور ئیـــسرافیل[١٧]
بـــە نـــەجات نـــووح، نـــە گـــێج تۆفـــان
بـــە خـــوان ئـــیخلاس، خـــەلیل ڕەحمـــان
باجـــەتی ئیلیـــاس، ئـــیخلاس ئـــامێزەن[١٨]
کەشـــتیان جـــە بـــەحر بێپایـــان ڕێـــزەن

---

[١٣] ئاماژەیە بۆ ئایەتی (٢٣)ی سوورەتی (الأعراف).
[١٤] یەکێکە لە فریشتەکانی خودای گەورە کە پەیامی خودای بۆ پێغەمبەران دەهێنا.
[١٥] فریشتەی گیانکێشان. ئەم نیوەبەیتە ئاڵوگۆڕ کراوە لەگەڵ نیوەبەیتی دووەمی بەیتی دواتردا.
[١٦] لە لای (حك) لەبری "کەیل" نووسراوە "وست".
[١٧] ئەو فریشتەیەیە کە لەلایەن خودای گەورەوە بە لێدانی نەفخی سوور تایبەت کراوە.
[١٨] لە (حك)دا نووسراوە "ئاخێزەن".

بە حاجەتی خزر[١٩] دەور دنیا دەر
گومڕاهان نە ڕای خەتەر خەلاس کەر
بە وانای لاحەول یوونس پێغەمبەر
جە بەتن ماهی، نە دەریای بێدەر[٢٠]
بە سەبر ئەییووب مووبتەلای کرمان
بە نەغمەی زەبوور[٢١] داود نە ئەلحان
بە زوهد یەحیای مەقتوول مەعسووم
بە زیکر ئەڕڕەی زەکەریای مەزڵووم
بە جەور یووسف نە دەست ئیخوان
بە سۆز ئەسرین یەعقووب کەنعان
بە نار نەمروود، گوڵشەن پەی خەلیل
بە قۆچ قوربان قورب ئیسماعیل
باجەتی کەلیم کۆی توور ئەعزەم
بە ئیعجاز پاك عیسای بن مەریەم

---

[١٩] مەبەست لە پێغەمبەر خدر (خضر)ە.

[٢٠] نووسەرەوەی دەستنووسەکەی لای (حك) ئەم بەیتەی دوو جار هێناوە و هەڵەی تێدا کردووە. نیوەبەیتی دووەمی بەیتی پێشووی لە جێگەی نیوەبەیتی دووەمی ئەم بەیتە داناوە. دواتر کە ئەم بەیتەی نووسیوەتەوە، وشەی "ماهی"ی لەبیر چووە و لە سەرەوەی نووسیویەتی.

[٢١] مەبەست لە دەنگخۆشیی پێغەمبەر داودە کە لە قورئاندا ئاماژە بە زەبوور کراوە و دەڵێن: لە بەهەشتدا پێغەمبەر داود زەبوور بەو دەنگە خۆشەی بۆ خەڵك دەخوێنێتەوە.

بە عیزز حورمەت پێغەمبەران گشت
بە نەشئەی نەسیم کۆی باغچەی بەهەشت
بە تاج لەولاك سەیید سەروەر
شای بوراق سوار عەرسەی ڕۆی مەحشەر
بە کۆری دیدەی تایفەی کوففار
پەیدا کەرد نە سەنگ نەخڵ پەڕ ئەشجار
بە سەبابەی نوور، شەهادەت ئەسەر
موعجیز نمای عەین (وَانشَق القَمَر)[٢٢]
بە ئایەی شەریف (لولاك لولاك)
بە (شأن لَما خَلَقتُ الافلاك)[٢٣]
بە حیلم بووبەکر، حەیای (ذالنّورین)[٢٤]
بە عەدل عومەر، سەخای بووسیبتەین
هەم بە موعجیزات حەیدەری کەڕڕار
قەتڵ کونەندەی تایفەی کوففار
بە ئال ئەبرار خەتم مورسەلین
بە زومرەی ئەسحاب، هادیان دین[٢٥]

---

[٢٢] بەشێکە لە ئایەتی (١)ی سوورەتی (القمر).

[٢٣] ئەم بەیتە تەنها لە (حك)دا هاتووە. لە نوسخەکەدا نووسراوە (بشأنشی)ی هاتووە و هەڵەیە.

[٢٤] مەبەست لەو دوو خێزانەی عوسمانی کوڕی عەففانە کە هەردووکیان کچی پێغەمبەر (د.خ.) بوون.

[٢٥] ئەم بەیتە لە (حك)دا هاتووە و لە نوسخەکەی تردا نەهاتووە.

بە ئایەی قورئان،[٢٦] سیڕڕ سوبحانی[٢٧]
بە سوورەی ئەسرا، (سبعُ المَثاني)[٢٨]
بە ئەولیاهان قوتب دەریا دڵ
بە تاعەت پاکان،[٢٩] شێخان کامڵ
بە تەدریس عیلم، عالمان پاك
بە ئاه ئەسیران، سەرد[٣٠] ستەمناك
بە یاهور یاهووی زاهیدان پێش
بە هووی سەحەر زووی دەروێش دڵ ڕێش
بە ڕای (بیت الله)، حاجیان تەی کەر
بە ئاهی یەتیم، وەخت سوب سەحەر
بە سۆز سینەی پیران مەزڵووم
بە ئەسر دیدەی توفلان مەعسووم
بە فەرش و کورسی، بە لەوح و قەڵەم[٣١]
بە سەدر و مەکان مونتەهای ئەعزەم

---

[٢٦] لە (حك)دا نووسراوە (فورقان).

[٢٧] مەبەست لە سەفەری پێغەمبەرە بۆ ئاسمان، لە قورئاندا لە چەند شوێنێك وشەی (سبحان) هاتووە، بە هاتنی سوورەی ئیسرا لە نیوەدێری دووەم، واتاکەی زیاتر ڕوون دەبێتەوە.

[٢٨] مەبەست لە سوورەتی (الفاتحە)یە، کە حەوت ئایەتە، ئاماژەیشە بۆ ئایەتی (٨٧)ی سوورەتی (الحجر).

[٢٩] لە (حك)دا نووسراوە "بە تاعات پاك".

[٣٠] لە نوسخەکەی (حك)دا بە (سەردی) نووسراوە و هەڵەیە، دەبێ (سەرد) بێت.

[٣١] مەبەست لە عەرش و تەخت و لەوحولمەحفوز و قەڵەمی خودایە، کە هەموو شتێك بە دەستی خۆیەتی.

باجەتی کەونەین، (ما فیها ایجاد)
ئەزەڵ تا ئەبەد، مەبدە تا مەعاد[٣٢]
بە یەگانەگیی لاتەناهیی وێت
بە یەکتاهیی زات شەهنشاهیی وێت[٣٣]
ببەخشەم وە جوورم بێحەد کەردەنم
فەرمان ئیبلیس بە ڕاه بەردەنم[٣٤]
دڵ بە هەوای نەفس شووم شەڕ دادەم
سەر نە سەرای سەرد، ڕیسوا[٣٥] نەهادەم
ئەمر مەعرووفت بە ڕا نە بەردم
نەهی، مونکیرات، عەمەل پێ کەردم
شەو و ڕۆ نە شەوق شادی دڵکەفتە
نە سەودای بێسوود، ساتێ نەسرەفتە
مەغروور ئەغوای نەفس ئەمارە
فریفتەی شەیتان، شووم بەدچارە
بەندەی نەو عەرووس، دنیای دەنی بیم
نە خاسەی حەرس حەرام غەنی بیم

[٣٢] لە (حك)دا بە (میعاد) هاتووە و هەڵەیە، دەبێ (مەعاد) بێت.
[٣٣] ئەم نیوەبەیتە لە (حك)دا بەم شێوەیە هاتووە: "بە عیز و مەعبوود، پادشاهیی وێت".
[٣٤] ئەم بەیتە تەنها لە (حك)دا هاتووە.
[٣٥] لە (حك)دا نووسراوە "سەوداهی".

مەســـت (لایعقـــل)، دوور جـــە ڕای دیـــن بـــیم
خـــیلاف ڕای شـــەرع (حَـــق الـــیَقین) بـــیم
مەعلوومـــەن ئـــەو وەخـــت نـــادانیم بییـــەن
توغیـــان مەســـتی جـــەوانیم بییـــەن[٣٦]
ئیـــستە ســـەرگەردان ڕای نەدامـــەتم
شـــەرمەندەی عەرســـەی ڕۆی قیامـــەتم
نـــا ئومێـــد جـــە فیعـــل عەمـــەل کـــەردەی وێـــم
ئیمـــان ئاوبـــەردەی عوســـیان وەردەی وێـــم
مەگـــەر هـــەم بـــە فـــەزڵ کەرەمـــدار[٣٧] وێـــت
بـــە عـــەفوو عـــەزیم بێـــشومار وێـــت
بویـــەری نـــە جـــورم بێحـــەد[٣٨] و زیـــادم
نـــە بـــەحر عوســـیان عـــەزیم ئوفتـــادم
وەرنـــە ڕووســـیای قـــاپیی ڕەحمـــەتم
ئەرامەنـــدەی حەشـــر ڕۆی قیامـــەتم[٣٩]

---

[٣٦] بێسارانییش دەڵێت:

ئینە گرد جە وەخت نـــادانیم بییەن
فـەسڵی سەرمەست و جەوانیم بیـەن

[٣٧] لە نوسخەکەی (حك)دا هەردوو وشەی (کەرەمدار و بێشومار) بە (کەرەمداری) و (بێشوماری) هاتووە و هەڵەیە، دەبێ (کەرەمدار) و (بێشومار) بێت.

[٣٨] لە (حك)دا نووسراوە "جە".

[٣٩] لە (حك)دا ئەم بەیتە نیوەبەیتەکانیان جێگۆڕکێیان پێ کراوە.

هـــەر چـــەندە خانـــا پـــەڕ گونـــەهكارەن[٤٠]
بـــــــه (لا تقنطـــــوا)[٤١] ئومێـــــــــــدەوارەن

---

[٤٠] ئەم نیوەبەیتە لە (حك)دا لە بری "خانا" نووسراوە "خانە" و لە بری "پەڕكەندە" نووسراوە "پەڕ گونەهكارە". ئێمە "پەڕ گونەهكارەن"مان بە ڕاستتر زانی و داماننا.
[٤١] بەشێكە لە ئایەتی (٥٣)ی سوورەتی (الزمر).

## گوناکاری وێم *

گوناکاری وێم، گوناکاری وێم
گرانتەر جە سەنگ، گوناکاری وێم
عەمەڵ نامەشرووع، شەرمەساری وێم
فەردا شەرمەندەی بەدکرداری وێم
دڵ سیا و ڕوو زەرد، خجلاتی وێم
موتەحەییر مات، موشکلاتی وێم
جە تاو عەزاب گیان کەنیشت وێم
ڕۆی سەفەر موفلیس، خاڵی موشت وێم
چەنی خاو مەرگ، سەرین سەنگ وێم
بێماوا و بێدەر، قەبر تەنگ وێم
چەم وە بان فەرق، دەربەدەری وێم
شەرمەندەی خودام جە[1] بان سەری وێم
سەرئەفکەندەی جورم بێحیسابی وێم
بە ئایر دۆزەخ، دڵ کەبابی وێم
بە کردەی شەیتان، ماڵ وێران وێم
چون تەیر بێپەڕ، دڵ بوریان وێم

---

* هەر ئەو سەرچاوەیە دووبارە لە خانا. (مپ). هەروەها لە ناو نوسخەکانی مامۆستا حەکیم مەلا ساڵحیشدا ئەم شیعرە هاتووە و لەگەڵ ئەم نوسخەیەدا بەراوردمان کردووە.

[1] لە (حك)دا نووسراوە "خوداجای".

بەنـــــدەی شـــــەرمەندەی[٢] نافـــــەرمان وێـــــم
گرفتـــــــار دەرد بێـــــــدەرمان وێـــــــم
یـــــاران هـــــا دەوای دەرد وێـــــم بـــــەردم
بـــە ئـــیخلاس پـــاك، تۆبـــەی وێـــم کـــەردم[٣]
وەرنـــــە نافـــــەرمان، نائومێـــــدی وێـــــم
ئـــــاخر خەجاڵـــــەت، دۆزەخ زێـــــدی وێـــــم

[٢] لە (حلك)دا نووسراوە "شەرمەسار".
[٣] لە (حلك)دا ئەم بەیتە بەم شێوەیە نووسراوە:
یـــاران ئـــوردرای دەرد وێم بـــەردەم
بە ئیخلاس یەك تەوبەی وێم کەردەم

## چەند دێڕ لە سەڵاواتنامە*

یـــــا ڕەب بـــــە حاجـــــەت زات بێعـــــەیبت!
بـــە ســـیڕڕ تەقـــدیر، جـــە عـــیلم غـــەیبت!
ئانـــا فەئانانـــەن، ســـاعەت بـــە ســـاعەت
جـــە ڕۆی ئـــەزەل تـــا ڕۆی قیامـــەت
هـــەر لـــەحزە هـــەردەم، هـــەر ڕۆ زیاتـــەر
ســـەڵاوات بـــۆ بـــەنوور پـــاکی پەیغەمبـــەر

---

* ئەم چەند دێرە شیعرەم لە گۆڤاری گەلاوێژ دەست کەوت، شیعرەکە بەشێکە لـە وتـاری نـاجی عـەباس کـە لـە گۆڤاری گەلاوێژی ژمارە (٨)ی ساڵی (١٩٤٣)، لاپەڕە (١٣)دا کە بەشی سێیە، دەڵێـت: "سـەڵاواتنامەی خانـای قوبادی نموونەیەکی شیعری لە مەدحی پێغەمبەر محەمەد و ئیمـامی عـەلی، ئـەو نوسـخە دەسـخەتە کـە دەسـتم کەوتووە ساڵی (١٣١٠ – ١٨٩٢) نووسراوە، (٢٩) بەیتی تێدایە کە پڕە لە ئیستلاحاتی وا کـە زۆر کـەم لەگـەڵ کەرەستەی شێوەکە ڕێك دەکەوێ، وا دەست پێ دەکا".

لێرەدا نەمەوێ ئەوە بڵێم: خۆزگە کاك "ناجی عەباس" تەواوی سەڵاواتنامەکەی بڵاودەکردەوە و لە فەوتان ڕزگـاری دەکرد، ئەو کاتیش دەبووە کەرەستەیەکی باش بۆ ئەم دیوانە، هەروەها لە کەشکۆڵی شاکەلیشدا ئەم چـەند دێـرەی ئێرە هەیە، دوای بەراوردکردن بۆم دەرکەوت هەمان دەقە و ئەویش لـە بابەتەکـەی کـاك ناجییـەوە وەری گرتـووە، هیوادارم لەمەولا هەر شتێکی لەو شێوەیە کە لای نووسەران سەرهەڵدەدەن، بڵاوی بکەنەوە و لـە فـەوتان ڕزگـاری بکەن و چیدی بەرهەمی شاعیران و ئەدیبانی کۆنمان لەناو نەچن، هەر چەندە ئەم چەند دێرە شیعرە لە ڕووی برگـە و واژەییەوە ناتەواوە، لە شیعری خاناش ناچێت، ئەگەر شیعری خاناش بێت، وا دەزانم نووسەر بە هەڵە هێناویەتییـە سەر ڕێنووسی نوێ و شێوەزارەکەی دەسـتکاری کراوە.

## سەیید سالار*

سـەیید سـالار، سـەیید سـالار!
یـا رەسـوولەڵڵا، سـەیید سـالار!

---

* ئەم شیعرەم لە کەشکۆڵەکەی عەبدولموئمین وەرگرتووە کە کاک ئـەنوەر سـوڵتانی هێناویەتییە سـەر ڕێنووسـی نوێی کوردیی و بنکەی ژین چاپی دووەمی کردووە. هەروەها لە کەشکۆڵی کەلەپووری ئـەدەبی کـوردی، مامۆسـتا محەمەد عەلی قەرەداغی، بەرگی دووەدا بڵاوکراوەتەوە، هەندێك کەم و کورتی و جیاوازی لە نێوان هەردوو دەقەکـەدا هەبوو، لەبەر ڕۆشنایی هەردوو چاپەکە چاکم کردوون.
هەروەها دەبێ ئەوەش بڵێم لە کتێبی زیندووکردنەوەی عەبدالّ داوده و بەرهەمەکانی هـەردەوێڵ کاکـەیی و سـالّح هەلاجدا، شیعرێك بە ناوی موناجات لە دەرگەی محەمەد پێغەمبەر (د. خ.)، لە لاپەڕە (٦٧)دا بڵاوکراوەتـەوە. ئـەم شیعرە سەرەتاکەی وەکو ئەم پارچە شیعرەی خانای قوبادییە و دواتر جیاوازییەکە دەست پێ دەکات، وەکو ئاشکرایە عەبدالّ سەردەمەکەی زۆر کۆن نییە، بەڵام ئەم شیعرەی وەکو تێکهەڵکێش یان ئیلهامی شیعرەکەی وەرگرتووە و لە سەر هەمان ڕێچکە و ڕێباز شیعرەکەی نووسیوە، ئەمەش سەرەتای شیعرەکەی عەبدالّە:

| | |
|---|---|
| سـەیید سالار، سـەیید سالار | یـا ڕەسولـەڵڵا سەیید سـالار |
| پەنای عاسیان بەندەی شەرمـەزار | موختار بێـعەیب، پادشـای غەففار |
| شیفاخوای ئومەت سەردار مەحشەر | بوزرگ جەلای حەق ئەڵڵاهو ئەکبـەر |

ئەمەش کۆتایی پارچە شیعرەکەی عەبدالّە:

| | |
|---|---|
| وە نەجات پاك تاك تـەنیای تاك | قەبووڵ کەر تـەدبیر ئی بەندەی نـاپاك |
| عـەبدالّ وەپـای تـەدبیر ویش بۆ | سەرفراز جە غەم جـەمع ئەندێش بۆ |

هەروەها لە "کەشکۆڵی کەلەپووری ئەدەبی کوردی" (ب ٥، لا ٥٠) لەسەر ئەم کێش و ئاواز و مۆسیقایە شیعرێك هەیە، شیعرەکە بە ناوی "حەسەن"ەوە بڵاوکراوەتەوە:

سەیید سەروەر، سەیید سەروەر
سالار موختار، سەیید سەروەر

کۆتاییەکەشی بەم شێوەیە:

ئەر سەد بار حەسـەن عیسیان بێ شۆن
ئومێدش بـە لوتف شەفاخواهیی تۆن

سـپەهدار تیـپ ڕۆی (یـوم القـرار)[١]
پـەنای عاسـییان، بەنـدەی شەرمەسـار
پاسـەبان[٢] جـێش پەیغەمبـەران گـشت
بـاعیس ئیجـاد کولـل زیبـا[٣] و زشـت!
حـەیی بێهـەمتا، تـۆ کـەرد جـە خاسـی
شـفاخوای هـەفتاد دوو گـرۆی عاسـی![٤]
جـە ئـەو ڕۆ سـانیع دێبـای کـۆن بافتـەن
مـەتایێ چـون تـۆ هـیچ کـەس نەبافتـەن
(لم یـزلْ) بـە سـونع وێـش فـەخر ئـاوردەن
موختـاری و چـون تـۆش (منخلـق) کـەردەن
پـەی تەسـهیل ئـەمر تـۆ شـای بێـسیفات
(سَـیَجعْل الله بَعْـد عُـسر)ش وات[٥]
پایـەی میعراجـت عـاری جـە مەرئـە
(سـبحانَ الـذي أسـری بِعبِـده)[٦]

[١] یوم القرار: ئەو ڕۆژەیە لە ساحەی مەحشەردا، کە خودای گەورە لە سەر کردەوەکانی مرۆڤ بڕیار دەدات.
[٢] لە پارچە شیعرەکەی لای (مع)دا نییە.
[٣] دیسان لە پارچە شیعرەکەی لای (مع)دا نییە.
[٤] ئەم خشتەش لای (مع) نییە.
[٥] بەشێکە لە ئایەتی (٧)ی سوورەتی (الطلاق) لە قورئانی پیرۆزدا.
[٦] سەرەتای ئایەتی (١)ە لە سوورەتی (الإسری).

شـــــەرح داوەريـــــت، نـــــە عالّـــــەم ڕەوان
مـــــەزموون ئايـــــەى (شَـــدِيدُ القـــوى)ن[٧]
(وحـــي منيـــفْ)ت بـــــەحر فتووحـــــەن
شـــــــەرح (أوحينـــــا إليـــــكَ روح)ەن[٨]
ئـــــەنبيا و ئـــــادەم، گـــــشت خـــــاك پاتـــــەن
(ومـــــن دونِـــــهِ)،[٩] تـــــەحت لواتـــــــەن
بەقيـــــەى عەســـــكەرت (ربـــاط الخيـــل)ەن[١٠]
(أمَّـــــنْ قانـــــتٌ آنـــــاءَ اليّـــــل)ەن[١١]
تـــــووڕەى نـــــەوازش تـــــۆ كـــــە ئەشـــــهەرەن
(فَأمـــــا اليتـــــيم، فَـــــلا تَقهَـــــر)ەن[١٢]
(كُنـــتُ نبيـــاً) هـــــەرجا كـــــە واتـــــەن[١٣]
(سَـــنُقرِئُكَ، فَـــــلا تَنـــــسى)تـــــەن[١٤]

---

[٧] ئاماژەيە بۆ ئايەتى (٥) لە سوورەتى (النجم).
[٨] بەشێكە لە ئايەتى (٥٢)ى سوورەتى (الشورى).
[٩] بەشێكە لە ئايەتى (٦٢)ى سوورەتى (الرحمن).
[١٠] بەشێكە لە ئايەتى (٦٠)ى سوورەتى (الانفال).
[١١] بەشێكە لە ئايەتى (٩)ى سوورەتى (الزمـر)، بـەلاّم (خانـا) (هـو)ى لـە بـەر كێـشى شـيعرەكە لابـردووە و ئايەتەكەيش بەم شێوەيەيە: (أمن هو قانت ءاناء اليل ساجد و...).
[١٢] ئايەتى (٩)يە لە سوورەتى (الضحى).
[١٣] ئاماژەيە بۆ ئەم فەرموودەيەى پێغەمبەرى خودا كە دەفەرمووێ: (كُنتَ نبياً وَآدَمَ بَينَ الطين وَالماء).
[١٤] ئايەتى (٦)ە لە سوورەتى (الاعلى).

پایـــــەیی (فاصـــــبِر، صَـــبراً جمــــیلاً)[١٥]
ئایـــــەی (قُـــم اللَیـــــلَ إلا قَلــــیلاً)[١٦]
تەوســـیف نوتقـــت عـــاری جـــە ئـــەغوان
(وَمـــا یَنطِـــقُ) هـــەم (عَـــن الهَـــوی)ن[١٧]
بەنـــدەی ئاســـتانەت گـــەردوون سروشـــتەن
(والـــــسابقونَ الأولـــــونْ)[١٨] گـــــشتەن
شـــەمع مـــونیرە (لـــي مَـــعَ الله)نـــی[١٩]
شـــای (قـــابَ قَوسَیـــن أو أدْنـــی)نـــی[٢٠]
(ألَم نَـــشرحْ)[٢١] شـــەرح، ســـینەی ســـافتەن
(واللیـــلْ)[٢٢] وەســـف زولـــف ســـیابافتەن
ســـیراج کەونـــەین، شـــەمع مـــونیری
هـــەم (نَـــذیرُ الخلـــقْ)[٢٣]، هـــەم موبەشـــشیری[٢٤]

[١٥] ئایەتی (٥)ی سوورەتی (المعارج)ە.
[١٦] ئایەتی (٢)ە لە سوورەتی (المزمل).
[١٧] ئایەتی (٣)ی سوورەتی (النجم)ە، خانا ئایەتەکەی کردووەتە دوو بەشەوە و وشەی "هەم"ی بۆ زیاد کردووە.
[١٨] ئایەتی (١٠٠)ە لە سوورەتی (التوبە).
[١٩] ئاماژەیە بۆ فەرموودەیەك لە فەرموودەکانی محەمەدی پێغەمبەر (د.خ.)، بەڵام فەرموودەکە لاوازە.
[٢٠] ئایەتی (٩)ە لە سوورەتی (النجم)، بەڵام خانا (فکان)ی لێ لابردووە.
[٢١] بە شێکە لە ئایەتی (١)، لە سوورەتی (الشرح).
[٢٢] ئایەتی (٢)ە لە سوورەتی (الضحی).
[٢٣] ئاماژەیە بۆ ئەم دوو ئایەتە (یأیُهَا النَبِیُ إنآ أرسَلنكَ شـهِداَ وَمُبَـشِراَ وَنَـذِیراَ) ئایـەتی (٤٥) لـە سـوورەتی (الاحزاب) و (إنآ أرسَلناكَ شهِداَ وَمُبشِراَ وَنذِیرا)، ئایەتی (٨) لە سوورەتی (الفتح).

نییـــــەن وێنـــــەی تـــــۆ ســـــەیید (لــــولاكْ)[٢٥]
شـــای (لَعَمــرُكَ)تـــەخت[٢٦] (ومـــا أرســـلناكْ)[٢٧]
زەڕڕەی فـــەیز لوتـــف تـــۆ پەنـــەش یـــاوان[٢٨]
عاســـــای موســـــەویی دەریـــــا شـــــکاوان
یـــاوان بـــە خـــەلیل سەرگەشـــتەی مـــەحزوون
جـــە فـــەیزت ســـەدای (قُـلْ یـا نـارُ كُـونْ)[٢٩]
جـــە لوتـــف تـــۆ بـــی ســـەیید خاتـــەم!
بـــە ســـاحێب ئیعجـــاز، عیـــسای بـــن مەریـــەم
غـــەرەز شـــیس و نـــوح، شـــوعەیب و ئیـــدریس
ئیـــسحاق و ئـــەییووب، یـــەعقووب و جـــەرجیس[٣٠]

---

[٢٤] ئاماژەیە بۆ ئەم ئایەتانە: (البقرە- ٢١٣)، (النساء- ١٦٥)، (الأنعام- ٤٨)، (الإسراء- ١٠٥)، (الكهف- ٥٦)، (الفرقان- ٥٦)، (الروم- ٤٦)، (الأحزاب- ٤٥)، (الفتح- ٨)، (الصف- ٦).

[٢٥] ئاماژەیە بۆ پێغەمبەر (د.خ.)، ئەو فەرموودەیەی پێشتر باس کراوە و بە ناوی خوداوە هاتووە، دوورە لە ڕاستییەوە.

[٢٦] ئایەتی (٧٢)ە لە سوورەتی (الحجر).

[٢٧] ئاماژەیە بەم ئایەتانە (الإسراء- ٥٤ و ١٠٥)، (الأنبياء- ١٠٧)، (الفرقان- ٥٦)، (السباء- ٢٨).

[٢٨] لای مامۆستا محەمەد عەلی قەرەداغی ئەم بەشە داخوراوە و ناخوێنرێتەوە.

[٢٩] ئایەتی (٦٩)ە لە سوورەتی (الانبیاء)، خانا ئایەتەکەی گۆڕیوە و لە بنەڕەتدا بەم شێوەیەیە: (قلنا یا نار کونی).

[٣٠] ئەم دێڕە لای مامۆستا محەمەد عەلی قەرەداغی بەم شێوەیە هاتووە:

......... نوح و شعیب و ادریس

..... .... .... أیوب و جرجیس

گـــشت فـــایز بـــە فـــەیز لاتەناهیتـــەن
غوبـــار پـــای تـــەخت پادشـــاهیتەن[٣١]
نییـــەن وێنـــەی[٣٢] تـــۆ، ســـەیید پاکـــدین
تـــۆی شـــەفاعەتخوای زومـــرەی مـــوزنیبین
تـــۆ بـــەوێت واتـــەن شـــای عـــالی مـــەقام!
(بُعِثـــــــتُ الی کافـــــــة الأنـــــام)
نـــەدارۆ خانـــا ئومێـــدێ بـــە کـــەس
خـــەتاش (لایحـــصی)، بـــە فریـــادش ڕەس!
عـــەتای عامـــت کـــەر، شـــامیل بـــە حـــاڵش
جـــە ســـەیل عیـــسیان وێرانـــەن مـــاڵش!

[٣١] ئەم دێرەیش لای مامۆستا قەرەداغی داخوراوە.
[٣٢] لە کەشکۆڵە شیعری گۆرانی شێخ عەبدولموئمینی مەردۆخیدا ئەم دێرە ناتەواوە.

## دڵ جه غه‌م خه‌سته‌م*

دڵ جـه غـه‌م خه‌سـته‌م، دڵ جـه غـه‌م خه‌سـته‌م
یـا ڕه‌سـووڵه‌ڵڵا! دڵ جـه غـه‌م خه‌سـته‌م
پـشت وه بـار[1] ده‌رد، عیـسیان شكـسته‌م
مه‌علوومـه‌ن جـه لات، عیـسیانه‌ن جه‌سـته‌م
پایـه‌ی عیـسیانم جـه حـه‌د ویـه‌رده‌ن
غـه‌یر جـه بـه‌دكاری كـارێم نه‌كـه‌رده‌ن
بـه‌و شـا كـه قـه‌بیووم قـایم زاتـه‌ن
میـزان جـه كۆگـای گونـای مـن ماتـه‌ن

* ئه‌م هۆنراوه له به‌رگی چواری كتێبی كه‌شكۆڵه شیعری كه‌له‌پووری ئه‌ده‌بی كوردی مامۆستا قه‌ره‌داغی، له لاپه‌ڕه (١٥)دا هاتووه، مامۆستا ده‌ڵێت: سه‌ره‌تای ئه‌م كه‌شكۆڵه‌ی (عبدولڕه‌حمان) مه‌ولوودنامه‌كه‌ی شێخ حه‌سه‌نی قازییه، كۆتاییه‌كه‌یشی، كه خۆی له خۆیدا ناته‌واوه، به‌م پارچه شیعره دێت:

یا ڕه‌سووڵه‌ڵڵا دڵ جـه غـه‌م خه‌سته‌م
مه‌علوول به عیلله‌ت، عیسیانه‌ن جه‌سته‌م

مامۆستا قه‌ره‌داغی (٢١) تاكی لێ بڵاوكردۆته‌وه و له‌گه‌ڵ ئه‌م ده‌قه جیاوازی هه‌یه، هه‌روه‌ها نازانێ ئه‌م شیعره هی كێیه و ئاماژه‌ی پێ نه‌كردووه... ده‌بێ ئه‌وه‌ش بڵێم مامۆستا قه‌ره‌داغی پێشتر و له به‌رگی دووه‌می هه‌مان سه‌رچاوه‌دا به ناوی خانای قوبادی و له به‌شی شیعره‌كانی خانادا تۆماری كردووه، ئه‌م شیعره كه لێره‌دا به‌راورد كراوه، له سه‌ر به‌رگی دووی سه‌رچاوه‌ی ناوبراو به‌راورد كراوه كه مامۆستا قه‌ره‌داغی له لاپه‌ڕه (٩٦)دا بڵاوی كردۆته‌وه و په‌راوێزی بۆ نووسیوه، هه‌روه‌ها له حه‌دیقه‌ی سوڵتانی به‌رگی یه‌كدا هاتووه و جیاوازیشی هه‌یه، پارچه شیعره‌كه‌ی حه‌دیقه‌ی سوڵتانی (٢٦) تاكه دێره شیعره.

[1] له (گوڵ)دا نووسراوه (باد).

دۆزەخ[٢] جــە تــاوم، شــین و زاریــشەن
جــە خــەوف خــەتام، بێقەراریــشەن
وەیــل وا وەیلــشەن، مــەدۆ[٣] وە ســەردا
نــەوەك ئــەو شــوومە بــەیۆ جــە وەردا
ســاعیقەی[٤] ســەعید لــە نالــەش کەفتــەن
لــەو ســاوە ســەدای گونــام شــنەفتەن
بەو تــەور لــوول بەســتەن، ئەسـرم[٥] چـون سـێلاو
پیێــوار مەکــەرۆ هــەفت دۆزەخ جــە تــاو[٦]
ئــەر کەســێ چــون مــن هــەر گونــا پــێش بــۆ
مــەبۆ جــە مەحــشەر جــوابش چــێش بــۆ؟!
مەرهــەم لوتــف تــۆ، ســەیید موختــار!
پــەنای عاســیان چــون مــن شەرمەســار

[٢] لە (گوڵ)دا نووسراوە "دۆزەخ" و لە (مع)دا بە "جەهەننەم" هاتووە، ئێمە ئەوەی (گوڵ)مان بە دروستتر زانی.
[٣] لای (مع) نووسراوە "مدۆ" و لە (گوڵ) نووسراوە "مەدۆ"، "مەدۆ"م بە ڕاستتر زانی.
[٤] لە لای (مع) نووسراوە "سایەقەی" و بە هەڵەی دەزانێ، دەڵێت"ساعەقەی" ڕاستترە، بەڵام لە (گوڵ) نووسراوە "ساعەقەی"، ئێمە "ساعیقەی"مان بە دروستتر زانی.
[٥] (مع) پێی وایە دەبێ "ئەسرم" بێت، پێم وایە "خانا" فرمێسکی چواندووە بە عەتر، خانا وای دانـاوە کـە فرمێسکی وەکو عەتر بۆنداره و وەك سێلاو لـوول وەستاوە، عـەتریش لەناو شووشـەدا کـۆ دەکرێتەوە، دەبـێ "ئەسرم"یش ڕاست بێ.
[٦] لە (گوڵ)دا ئەم خشتەیە نییە.

بــبـــۆ وه[٧] ســــرپۆش خانـــا پـــەی خەتـــەر
وه تـــۆ مەبەخـــشان[٨] خـــەلق ڕۆی[٩] مەحـــشەر
وەرنـــــــە ڕووگـــــــەردان ڕۆی قیامـــــــەتم
شـــــەرمەندەی تـــــەریق ڕای نەدامـــــەتم[١٠]

[٧] لای (مع) نووسراوه "بۆ وه"، له (گوڵ)دا نووسراوه "بووه"، "بووه"م به ڕاستتر زانی.

[٨] له لای (مع) به "مبەخشان" هاتووه و به هەڵەم زانی، دەبێ "مەبەخشان" بێت، هەروەك له (گوڵ)دا به "مەبەخشان" هاتووه.

[٩] له (گوڵ)دا به "ڕووی" هاتووه، بەڵام هەڵەیه و "ڕۆی"یەکەی لای (مع) ڕاستتره.

[١٠] له (گوڵ)دا کۆتاییی هەردوو نیوه خشتەکه به "قیامەتم" کۆتایی هاتووه، بەڵام له لای (مع) کۆتاییی نیوەخشتەی دووەم به "قیامتم" کۆتاییی هاتووه، "قیامەتم"م به ڕاستتر زانی و چاکم کرد.

کەیقوباد[١٤] بەو تیپ بەزم و ڕەزمەوە
قەهرەمان[١٥] بەو قین قەست و جەزمەوە
زووحاك[١٦] بەو غەزەب جەفاو جەورەوە
کەیکاوس[١٧] بەو عەیش تەرز و تەورەوە
هۆشەنگ[١٨] بەو شاهیی ڕووی جیهانەوە
تەهمتەن[١٩] بەو گورز، بەو کەمانەوە
چەند شاهان جە تەخت ئاوەردش بە وار؟
چەند پەهلەوانان کەردش نگوونسار؟

[١٤] کەیقوباد: سەرزنجیرەی پاشایانی کەیانی بووە. یەکێکیش بووە لە خانەوادەی فەریدوون و لە کێوی ئەلبورزدا ژیاوە. لە سەرەمەرگدا کەیکاوسی کردە جێنشینی خۆی.

[١٥] یەکێکە لە پاڵەوانەکان و داستانی شیعری بە ناوییەوە هاتووە، لە ئەدەبی کوردی و فارسیدا بە شێوەی "قارەمان و قەیتەران"یش ناوی هاتووە.

[١٦] زووحاك: کوڕی مەرداسە و لە نەتەوەی عەرەبە. پیاوێکی زۆر شەڕانی و زاڵم بووە، بە دەستی کاوەی ئاسنگەر خوێنی ڕژاوە.

[١٧] کەیکاوس یان کاوس، کوڕی کەیقوبادە، دووەمین پادشای کەیانییەکانە، باوکی لە کاتی سەرەمەرگدا کەیکاوسی لە جێگەی خۆیدا دانا. کوڕەکەی ناوی سیاوەشە.

[١٨] هۆشەنگ یەکێکە لە پاشاکانی پێشدادی و لە دوای کەیوومەرس هاتە سەر تەختی پادشایەتی.

[١٩] تەهمتەن: نازناوی ڕۆستەمی کوڕی زاڵی کوڕی سامی کوڕی نەریمانە، ڕۆستەمی زاڵ بەفیلەتەن و تەهمتەن ناسراوە.

دەقیانووس[٢٠] بەو گەنج خاک نیهادەوە
بەو زەوق مەجلیس نۆشای بادەوە
کوا سەدای تەپڵ کووس کەیانان کەی؟
کوانێ بەیداخان شەنەوای دەشت ڕەی؟
چەرخ دنیای دوون دەوەندەی دەوران
کوشندەی شێران سەرکەندی بەوران
یەکایەک بادەی جام تۆ نۆشان
بەردی وە ماوای شار خامۆشان

* * *

حاتەم[٢١] بەو سەخای کەرەم کەردەوە
لوقمان[٢٢] بەو شیفای دەوای دەردەوە

---

[٢٠] پاشایەکی ڕۆمانی بووە لە سەردەمی ئەسحابولکەهفدا، ئەم پاشایە بانگەوازی خودایەتیی دەکرد، حاکمی ئەو دەمە بووە و ئەشکەنجەی مەسیحییەکانی دەدا، ئەردەنی ئێستا بەشێك بووە لە ناوچەکانی ژێر دەستەڵاتی و ئەشکەوتەکەش هەر لەوێیە و ئێستاش گۆڕی ئەو کەسانەی نێو ئەشکەوتەکە ماون. لە قورئاندا باسی ئەسحابولکەهف هاتووە، بەڵام باسی ناوی دەقیانووس نەهاتووە. ئەوانەی لە ترسی ئەو هەڵهاتن ئەوانە بوون کە لەنێو ئەشکەوتەکەدا نووستن و دوای چەند سەد ساڵێك بە خەبەر هاتنەوە. کورد پەندێکی هەیە دەڵێت: عومری دەقیانووسێکی هەیە، واتە ئەوەندە کۆنە، هەرچەندە سەردەمەکەی زۆر کۆنە، بەڵام دەکرێ دەقیانووسیش خۆی تەمەنێکی زۆری کردبێت.

[٢١] مەبەست لە حاتەمی کوڕی عەبدوڵڵای تائییە، پیاوێکی نوداری عەرەب بووە، بەخشندە و سەخی بووە، لە کۆتاییی ساڵەکانی پێش ئیسلامدا ژیاوە کە بە حاتەمی تەیی ناوبانگی دەرکردووە.

[٢٢] لوقمان: مەبەست لوقمانی حەکیمە کە بە حەکیمی و دانایی ناوبانگی هەبووە و یەکێکە لە پیاوچاکان. لە قورئانی پیرۆزدا سورەتێك بە ناوی ئەم پیاو چاکەوە هاتووە و جگە لەوەش دووجار ناوی لە سوورەتەکەدا هاتووە.

هۆشەنگ شا[٢٣] بەو پەڕ باز و بەندەوە
سیاوەش[٢٤] بەو هوون دەعوامەندەوە
گوشتاسپ[٢٥] بەو بەزم دەنگ دڵێرەوە
ئەردەشیر[٢٦] بەو چنگ پەنجەی شێرەوە
سوهراب[٢٧] بەو بەزم بێسوود کەردەوە
ئەویچ بەو دەعوای ڕۆی نەبەردەوە
**یەکایەك بادەی جام تۆ نۆشان**
**بەردت وە ماوای شار خامۆشان**

* * *

بەهمەن[٢٨] بەو بازووی زۆر و زاتەوە
دارا[٢٩] بەو دارای حوکوماتەوە

---

[٢٣] هۆشەنگ یەکێکە لە پاشاکانی پێشدادی، لە دوای کەیومەرس هاتۆتە سەر تەختی پادشایەتی.

[٢٤] سیاوەش: کوڕی کەیکاوسە، ئەفراسیاو بە دەستی خۆی سەری بڕی.

[٢٥] گوشتاسپ: کوڕی لوهراسپە، دەکاتە باوکی ئەسفەندیار. گوشتاسپ براکەی ناوی زەریرە، یەکێکە لە پاشاکانی کەیانی.

[٢٦] مەبەست لە ئەردەشێری دامەزرێنەری دەوڵەتی ساسانییە.

[٢٧] سوهراب: یان زۆراب: کۆڕی ڕۆستەمی کوڕی زاڵە، لە باوکی دابڕا و دواتر بێ ئەوەی یەکتر بناسن، لەگەڵ باوکی کەوتە جەنگەوە و بە دەستی باوکی کوژرا، باوکی بەو نیشانەیەی بۆی دانابوو پاش کوشتنەکەی دۆزییەوە.

[٢٨] بەهمەن: کوڕی ئەسفەندیارە، دوای مردنی باوکی (گوشتاسب) بوو بە پادشا.

[٢٩] مەبەست لە داریووشی دوا پاشای بنەماڵەی هەخامەنشییە لە ئێران، ئەم دارویشە خاوەن دارایی و سەروەتێکی زۆر بووە، بۆیە بە دارا ناوی دەرکردووە.

ئەسفەندیار[٣٠] بەو دەعوای شۆڕ و شەڕەوە
فەیلەقووس[٣١] بەو گەنج بەیزەی زەڕڕەوە
ئەسکەندەر[٣٢] بەو فەتح جیهان کەردەوە
بەو سەدد بەستەی نامئاوەردەوە
بەهرام[٣٣] بەو شەوکەت ئارای ڕەزمەوە
بەو ئینشای مەشهوور نەسر و نەزمەوە
نەوشیروان[٣٤] بەو عەدل کەسنەدارەوە
خوسرەو[٣٥] بەو تەلای دەست ئەفشارەوە
شاپوور[٣٦] بەو شاهی نامئاوەرەوە
بەو مووتیعی دین پێغەمبەرەوە

---

[٣٠] ئەسفەندیار، کوڕی گوشتاسبە و پادشای کەیانیی بووە.

[٣١] فەیلەقووس: چەند کەسێك لە پاشاکانی یۆنان بەم ناوەوە ناویان هاتووە، بەڵام دووەمیان باپیرەی ئەسکەندەری مەکەدۆنییە. لێرەدا بە دوای ئەو دێرەوە کە ناوی ئەسکەندەری مەکەدۆنی هاتووە، گومان دەکەم مەبەستی لە باپیرەی ئەسکەندەر بێت.

[٣٢] مەبەست لە ئەسکەندەری مەکەدۆنییە، پیاوێکی خاوەن دەسەڵات بووە، لای هەولێری ئێستا لەشکری داریووشی دوا پاشای بنەماڵەی هەخامەنشیی شکاندووە و ئێرانی داگیر کردووە.

[٣٣] بەهرام: یان بارام مەبەست لە بەهرامی گورە، کوڕی یەزدگردە.

[٣٤] نەوشیروان یەکێکە لە پاشاکانی بنەماڵەی ساسانی لە ئێران، ئەم پاشایە زۆر بەناوبانگ بووە، زۆر دادپەروەر بووە و دز و جەردەی وڵاتەکەی لەناو بردووە.

[٣٥] مەبەست لە خوسرەو پەروێزە کە دۆستی شیرین بووە و یەکێك بووە لە پاشا بەناوبانگەکانی ساسانی.

[٣٦] یەکێکە لە پاشا بەناوبانگەکانی ئێران، خانا مەبەستی شاپوور شایە.

ئەردەشـــیر[٣٧] بـــەو هەیبـــەت ســـوپا و ســـانەوە
بـــــەو ئیقلیمگیریــــــی ڕووی ئەبیامــــــەوە!
ســــام نـــــەریمان،[٣٨] بـــــەو ســـــپەرەوە
زاڵ[٣٩] زنجیربـــــــەر، بـــــــەو هونـــــــەرەوە
جـــەنگیزخان[٤٠] بـــەو چـــنگ غەزەببەنـــدەوە
ئـــەو شـــاهی جـــە دەســـت شـــاهان ســـەندەوە
زەوارە[٤١] بـــــەو زۆر کـــــەتف مـــــشتەوە
چـــەند پەهڵـــەوانان بـــە زۆر کوشـــتەوە
فلامـــــەرز[٤٢] یـــــەڵ بـــــەو ســـــپەرەوە
جـــەهان بـــەخش[٤٣] بـــەو هەیبـــەت خیرەســـەرەوە

[٣٧] مەبەست لە ئەردەشێری بابەکانە و یەکێکە لە پادشایانی بنەماڵەی ساسانی.

[٣٨] سام: کوڕی نەریمانە، یەکێکە لە پاڵەوانەکان و پیاوە گەورە و بەجەرگەکانی ئێران.

[٣٩] مەبەست لە زاڵی باوکی ڕۆستەمە، یەکێکە لە پاڵەوانەکانی شاهنامە و جێگای پرس و جۆی شاهانی کەیانی بووە.

[٤٠] جەنگیزخان: سەرکردەی سوپای مەغۆل بوو، کە دەستی بەسەر زۆربەی خاکی ئاسیادا گرت.

[٤١] زەوارە: کوڕی زاڵ و برای ڕۆستەم بووە و یەکێکی ترە لە پاڵەوانەکانی شاهنامە، زەوارە لەگەڵ چەندین پاڵەوانی دیدا لەگەڵ ڕۆستەمی زاڵدا بەشداریی شەڕەکانی ئێران و تورانیان کردووە.

[٤٢] فلامەرز: کوڕی ڕۆستەمی کوڕی زاڵە.

[٤٣] جەهانبەخش: کوڕی فەرامەرزی کوڕی ڕۆستەمی کوڕی زاڵە، یەکێکە لەو پاڵەوانانەکان.

تەیموور[٤٤] بەو کەمان، بەو تیر و سوپەر
دوشمن جە دەستش نەشی وە بەر
جیهانگیر[٤٥] یەڵ، مەرد دلاوەر
جە مەعرەکە و جەنگ، بە وێنەی ئەژدەر
**یەکایەك خەرقەی ڕای نیهان پۆشان**
**بەردت وە ماوای شار خامۆشان**

* * *

داستان سانی، پێغەمبەران گشت
نەبی و مورسەلان، جوملەی دای بە کوشت
ئەوەڵ کە ئادەم (صفي الله) بی
شیس چەنی ئیدریس،[٤٦] نووح[٤٧] دەریا بی

---

[٤٤] تەیموور: هەروا لەپێشدا وتمان کوڕی برزۆیە و بە تەیمووری شۆخ کەمان بە ناوبانگە ،لێرەشدا دەڵێت تەیمووری کەماندار.

[٤٥] جیهانگیر: کوڕی فەرامەرز کوڕی ڕۆستەمی کوڕی زاڵە.

[٤٦] ئیدریس: یەکێکی دییە لە پێغەمبەرەکانی خودا. لە (حديث الشفاعة)دا هاتووە کە فەرموویەتی: بێگومان نووح یەکەم پێغەمبەرە کە بۆ خەڵکی سەرزەوی نێردراوە. هەندێك لە زانایانیش لە کاتی لێکدانەوەی فەرموودەکەدا پەیامی "ئادەم" بە یەکەم پەیام و هی "ئیدریس"یش بە دووەم و پاشان "نووح" بە سێیەم پێغەمبەر دادەنێن. لە دوو ئایەتدا ناوی هاتووە و یەکەم کەسە کە لەلایەن خوداوە جوبرەئیل بە وەحی (٣٠)سی سەحیفەی بۆ هێناوە:{وَاذْكُرْ فِي الْكِتَابِ إِدْرِيسَ إِنَّهُ كَانَ صِدِّيقاً نَّبِيّاً}مريم-٥٦.{وَإِسْمَاعِيلَ وَإِدْرِيسَ وَذَا الْكِفْلِ كُلٌّ مِّنَ الصَّابِرِينَ}(الأنبياء- ٨٥).

[٤٧] نووح: پێغەمبەری خودایە. لە تەمەنی (٥٠)ساڵی لە دوای ئیدریس کرا بە پەیامبەر. نووح (س.) ٩٥٠ ساڵ لە ناو قەومەکەیدا بانگەوازی خوداییی ڕادەگەیاند.

هـــەم ســـالّح،[٤٨] هـــەم هـــوود،[٤٩] ئیـــبراهیم خـــەلیل
ڕازی بـــــی وە زیــــبح قــــۆچ ئیـــــسماعیل[٥٠]
ئیـــسحاق[٥١]و یـــەعقووب،[٥٢]عیـــسا، هـــەم ئەســـبات[٥٣]
یووســـف و شـــوعەیب، ســـیرِ غـــەیب جـــە لات

[٤٨] سالّح: پێغەمبەرە، لە تایەفەی قەومی سەموودە و لە ئەولادی سامی کوڕی پێغەمبەری نووحە (س.)، خودای گەورە سالّحی کرد بە پێغەمبەر و ناردی بۆ سەر قەومی سەموود، لە قورئاندا باسیان لێوە کراوە. قەومی سەموود دەکەوێتە نێوان شاری مەدینە و شام، تاکو ئێستاش شوێنەواری خانووەکانیان ماوە.

[٤٩] هوود: کرا بە پێغەمبەر و نێردرا بۆ سەر قەومی عاد، بە حەوت پشت دەچێتەوە سەر سامی کوڕی پێغەمبەر نووح، قەومی عاد لە نێوان عومان و حەزرەمووتدا نیشتەجێ بوون، بەلاّم ئێستا هیچ شوێنەوارێکیان لێ بەجێ نەماوە.

[٥٠] ئیسماعیل: کوڕی ئیبراهیمە، دایکی ناوی هاجەرەیە، یەکێکە لە پێغەمبەران و لە قورئاندا چیرۆکێکی دوور و درێژی لە سەر باس کراوە، لە ژیانی ڕۆژانەیدا گوێڕایەڵیی ئیبراهیمی باوکی دەکرد. قۆچی قوربانی لە جەژنی قوربان دا لە سەر گوێڕایەڵیی ئەو دانرا و کرا بە سوننەتێك، موسوڵمانان لە جەژنی قورباندا پەیڕەویی دەکەن و دەیکەن بە خۆشی و ئەو گۆشتە بە ماڵاتدا دەبەخشنەوە.

[٥١] ئیسحاق کوڕی ئیبراهیم (خلیل الله)یە، یەکێکی دییە لە پێغەمبەرەکانی خودا.

[٥٢] یەعقووب: یەکێکی دییە لە پێغەمبەران و کوڕی ئیسحاقی کوڕی ئیبراهیم (خلیل الله)یە.

[٥٣] ئەسبات (اسباط): یەکێکی دییە لە پێغەمبەران، خودای گەورە لە قورئاندا لەم چەند شوێنە ناوی هێناوە لەگەڵ پێغەمبەرانی تردا، (البقرة- ١٣٦ و ١٤٠)، (آل عمران- ٨٤)، (النساء- ١٦٣)، (الأعراف- ١٦٠). هەروەها مەلای گەورە لە تەفسیری کوردی لە کەلامی خوداوەندیدا، بەرگی یەکەم، لاپەڕە (١٥٧)دا تەفسیری ئایەتی (١٣٦)ی سوورەتی (البقرة) بەم شێوەیە باسی دەکات: اسباط لە بنی اسرائیلی، یان بنی اسحاقی، وەکو قبائلە لە بنی اسماعیلی. (سبط)یش بە دارێك ئەڵێن، کە کەلی زۆر بێ، ئەو شعبانە (کانە) وەکو کەل و لقی دارێکی کە لە یەك اصل بێ. کەوابێ غترض لە اسباط اولادی یعقوب نییە، زێرا، غەیری یووسف، ئەوانی تر علی التحیق، نەبوونە (نبي) فضل لە رسول... بەلاّم مامۆستا مەلا عەبدولکەریم لە بەرگی یەکەمی تەفسیری نامی، لاپەڕە (٥٨)دا ڕای جیاوازی لە سەر ئەم ئایەتە هەیە.

## گوســـــتاخیی مووســـــا ، ڕەشـــــیدیی هـــــاروون[٥٤]
## یووشـــەع[٥٥] چــەنی نـــوون،[٥٦] ئـــەییووب[٥٧] و شـــەمعوون[٥٨]
## هـــــوود و دانیـــــال،[٥٩] ئـــــەرمیا[٦٠] و حیزقیـــــل[٦١]

[٥٤] لێرەدا بە هاتنی ناوی ڕەشید ، دوو مەبەست دەدات بە دەستەوە: یەکەمیان: هاروونە ڕەشید. دووەمیشیان: بە هاتنی ناوی مووسا ، مەبەستیش لە هاروونی برای مووسا بە دەستەوە دەدات، نازانم مەبەستی لە کامیانە.

[٥٥] یووشەع: کوڕی نوونە ، یووشەع لە دوای وەفاتی پێغەمبەر مووسا بوو بە جێنشینی و جوولەکاکەنی بردە فەڵەستین، دیسان یەکێکی دییە لە پێغەمبەرەکان.

[٥٦] (نوون) کورتکراوەی (ذوالنـون)ە یان مەبەست لە باوکی "یووشەع"ە کە ناوی نوونە ، بۆ پێغەمبەر یوونسیش دەگونجێت. یوونس پێغەمبەر بە (ذوالنون) ناوبراوە، بە مانای (ذوالحوت) یان (ذوالسمكة)، واتای نەهەنگ دەگەیەنێت، یان "نـوون" باوکی "یووشەع"ە، لە ئایەتی (٨٧)ی سوورەتی (الأنبیاء)دا مامۆستا مەلا عەبدولکەریم بە پێغەمبەر یوونس ناوی بردووە.

[٥٧] ئەییووب: کوڕی عەیسی کوڕی ئیسحاقی کوڕی ئیبراهیمی (خلیل الله)یە، بە پێغەمبەرێکی زۆر خۆڕاگر لەسەر بەڵاو تەنگ و چەڵەمەکانی ژیان ناسراوە. لە چوار شوێنی قورئاندا ناوی هاتووە.

[٥٨] شەمعوون: دەڵێن: پیاوێکی زۆر بەهێز بووە، بە پیلانی خێزانەکەی بەستراوەتەوە دووجار، جاری یەکەم بەگوریس لە خەودا و جاری دووەم بە زنجیر. هەردوو جارەکە بە هێزدانەبەر خۆی گوریس و زنجیرەکەی بڕیوە، بە خێزانەکەی گوتووە بۆ ئەم کارەت ئەنجام داوە؟ لە وەڵامدا گوتوویەتی: مەبەستم ئەوە بووە هێزت تاقی بکەمەوە، شەمعوونیش پێی گوتووە: هیچ شتێك کارم تێ ناکات، تەنها قژەکەی خۆم نەبێت. شەوی سێیەم خێزانەکەی (٨) تاڵ لە قژی شەمعوونی بڕیووە، بە چوار تاڵ پێیەکانی بەستووە و بە چوارەکەی دییان دەستی بەستووە، دواتر بانگی دوژمنەکانی کردووە، پاشان شەمعوون داوای لە خودای گەورە کردووە کە یارمەتیی بدات. خودای گەورە فریشتەی ناردووە تا خانووەکە بەسەر خێزان و دوژمنەکەی دا برووخێنێت، بەم شێوەیە ڕزگاری بووە. ئەم چیرۆکە ئەفسانەییە.

[٥٩] دانیال: دەڵێن یەکێکی ترە لە پێغەمبەران، هیچ بەڵگەیەکی باوەڕ پێکراومان بە دەستەوە نییە، ئاشکرایە لە قورئاندا ناوی هەندێك لە پێغەمبەران هاتووە و ناوی هەندێك کی تریان نەهاتووە.

[٦٠] ئەرمیا: دەڵێن یەکێکی ترە لە پەیامبەران و ناوی لە قورئاندا نەهاتووە.

[٦١] حیزقیل کوڕ و جێنشینی ئاحاز، یەکێکە لە پادشاکانی یەهوودی لە ساڵەکانی (٧٢٦-٦٩٨) پێش میلاد دەسەڵاتی بە دەستەوە بووە، بە دەستی سەناخریب پادشای ئاشووری تێك شکاوە.

ئیلیـــــــاس[٦٢] چـــــــەنی خـــــــزر[٦٣] و (ذالکفـــــل)[٦٤]
یـــــــوونس[٦٥] و داود،[٦٦] حـــــــوکم ســـــــولەیمان
ڕام کــــــەرد ئیـــــنس و جـــــن بـــــسەندش دێـــــوان

[٦٢] ئیلیاس: یەکێکی ترە لە پێغەمبەران، خودای گەورە لە ئایەتی (١٢٣)ی سوورەتی (الصافات)دا بـەم شـێوەیە باسـی دەکات: (وان إلیاس لمن المرسلین)، ئـەم پێغەمبـەرە لـە ئـەولادی هـاروونی پێغەمبـەرە و بـرای پێغەمبـەر ئیبراهیمی (خلیل الله)یە. خودای گەورە ناردی بۆ خەڵکی شاری بەعلەبەك.

[٦٣] هەندێك لە زانایان دەڵێن یەکێکی ترە لە پێغەمبەران و لە قورئاندا ناوی هاتووە، هەندێك کی تریـان دەڵـێن پیاوچاکێك بووە و لە سوورەتی (الکهف)دا ناوی براوە.

[٦٤] ذوالکفل: لە سوورەتی (الأنبیـاء) ئایەتی (٨٥) لە قورئـانی پـیرۆزدا نـاوی لەگـەڵ پێغەمبــەر (ئیـسماعیل و ئیدریس)دا هاتووە و بە ئارامگر باسی کراوە، بەڵام باسی ژیانی نـەکراوە و بـە (ذوالکفـل) نووسـراوە، لـە کتـێبی "لەگەڵ پێغەمبەران لە قورئانی پیرۆزدا"، لە لاپەڕە (٣٠٢)دا بەم شێوەیە بـاس لـە (ذوالکفـل) دەکـات: "(ابـن کثیر)- خودا لێی خۆشبێت- دەڵێت: لەو ئایەتانەدا وا دەردەکەوێت کـە (ذوالکفـل) پێغەمبــەر بووبێـت، ئـەویش بەپێی ئەو ناوهێنان و جۆرە ستایشکردنەی کە قورئان لەگەڵ ئەو پێغەمبەرانەی تردا ناوی هێناوە، تاکـە بەڵگـەی بەناوبانگیش لەم ڕووەوە هەر ئەوەیە... شارەزایانی مێژووش وای دادەنێن کە ئەم پیـاوە کـوڕی "ئـەیوب" بووبێـت- سڵاوی خودای لێ بێت- و ناویشی لە بنەڕەتدا "بیشر" بووبێت و خودا دوای "ئەیوب" کردبێتی بـە پێغەمبــەر و ناوی (ذوالکفل)ی لێ نابێت، چونکە مەرجی هەندێك عیبـادەت و فـەرمانی لـە ئەسـتۆ گرتـووە و مەرجـەکانی بردۆتە سەر".

[٦٥] یوونس: کوڕی مەتایە، ناوی لە شەش جێگەی قورئاندا هاتووە، جگە لەوەیش سوورەتێکیش بە ناوییەوە هاتووە. چیرۆکێکی گەورەی هەیە، ئەم چـیرۆکە کاتێـك ڕووی داوە شـاری موسـڵی ئێـستا لـە عێـراق پایتـەخی دەوڵـەتی ئاشوورییەکان بووە.

[٦٦] داود: پێغەمبەرێکە لە پێغەمبەرانی بەنی ئیـسرائیل، خـودا لـە یـەك کاتـدا پەیامبـەریی و پاشـایەتی پـێ بەخشیوە، خاوەنی کتێبی ئاسمانی زەبوورە، لە سوپای تاڵووتدا سەربازێك بووە، لەو زەمانەدا بەرەنگاریی سەرکردەی دوژمنانی (جالووت) بووەتەوە.

جــــەرجیس و شــــەمعوون، عــــوزەیر[٦٧] ئــــەعزەم
یــــەحیا[٦٨]و زەکــــەریا،[٦٩] عیــــسا بــــن مەریــــەم
تــــا هیجــــر خاتــــەم، خــــەتم پێغەمــــەر
یــــەعنی موحەمــــەد شــــافیع مەحــــشەر
یەکایــــەك بــــادەی جــــام تــــۆ نۆشــــان
بــــەردت وە مــــاوای شــــار خامۆشــــان

※ ※ ※

[٦٧] عوزەیر: بەپێی سەرچاوەکانی بەردەستم، ئەم عوزەیرە ناوی ڕاستی (لاوزیـربس)ە، یۆنانییـەکان دەڵـێن: کـوڕی خودایە، لە ئایەتی (٣٠)ی سوورەتی تەوبەدا ناوی عوزەیر بەم شـێوەیە هـاتووە ،{وَقَالَتِ الْيَهُودُ عُزَيْرٌ ابْنُ اللَّهِ وَقَالَتْ النَّصَارَى الْمَسِيحُ ابْنُ اللَّهِ ذَلِكَ قَوْلُهُم بِأَفْوَاهِهِمْ يُضَاهِؤُونَ قَوْلَ الَّذِينَ كَفَرُواْ مِن قَبْلُ قَاتَلَهُمُ اللَّهُ أَنَّى يُؤْفَكُونَ}.لە شیکردنەوەی ئەم ئایەتەدا مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس لە تەفسیری نـامی، (ب- ١)، لا (٥٣٧)دا دەڵێت: "جوولەکەکان وتیان عوزەیر کوڕی خودایە، گاورەکانیش وتیان عیسای مەسیح کوڕی خودایـە، قسـەیێکە بەدەم ئەیکەن و مەعناکەی تێناگەن و نازانن خودا مەحاڵە کوڕی ببێ و لە کەس بـووبێ، ئـەم قسـەیان وەك قسەی کافرەکانی لەمەوپێشە کە ئەیانوت مەلائیکەکان کچی خودان، خودا لە سـەر ئەم بوختانە درۆیـە بـچێ بەگژیاندا و لەناویان بەرێت، ئەمانە چۆن لە حەق و ڕاستی هەڵئەگەڕێنەوە و پەیڕەوی ڕێگـای ناڕاسـت ئەکـەن؟". لە بەرگی (٤)، لا (٥٠)ی تەفسیری مەلای گەورەدا بەم شێوەیە هاتووە:"عزرا ابن سرایا، ابن عزریا، ابـن حلقیـا، ابن شلوم، ابن صادوق، ابن اخبطوت، ابن عزریا، ابن مرایـۆت، ابن زرحیا، ابن عزا، ابـن بظـا، ابـن ابیـشوع، ابـن فیـنحارس، ابن العاذار (ابن هارون) لە طرف شاهنشاهی فارس (آرتحششتا) فەرمانی درابووێ بـە نـصبی قـضاة و دادوەران، کە حکم بکەن بە حکمی خوای ئاسمان. یعنی فـەرمانی شاهنـشاهی بـۆ (عـزرا) دەرچـوو بـە عنـوانی (کاهن) و کاتبی کاملی شریعتی ئاسمانی!! لە بابی حەفتەم لە کتابی (عـزرا) ئەمـە نوسـرایە ئـەوها! احتمـالی هەیە لەو ڕووەوە، جوو پێـیان گوتبێ (ابن الله)!. ناقلانی ئێمە بعـضە حکایەتی خرافی ئەکەن، من دڵم نایێنێ بیـان نوسم! (عزیر) عەرەبیە؟ عەجەمیە؟ مصغرە؟ مکبرە؟ بارجعی مەلایانی عەرەبی بێ؟ پەکمان لە سەر ئـەم قیـل و قال نەکوتووە".

[٦٨] یەحیا: کوڕی پێغەمـبەر زەکەریایە، بڕوای بە دینی پێغەمبەر عیسا هێناوە و بووە بە پێغەمبەر.

[٦٩] زەکەریا: پێغەمبەرێکە لە پێغەمبەرەکانی خودا، کوڕی پێغەمبەر سولەیمانی کوڕی پێغەمبەر دوادە.

کوا خان و سوڵتان، میر و بەگلەران؟
کوانێ غوڵامان، کوا خدمەتکاران؟
کوا چابوك سواران، جە عەرسەی مەیدان؟
هەی مەی کەرد وە ئەسپ بەحری نەژادان
کوا فەرهاد چین کەندەی بێستوون؟
جە عیشق شیرین وێش کەردەن زەبوون
کوانێ زلێخا گەردن شووشەی زەڕ؟
جەمین قورس خۆر، باڵا چون عەرعەر
کوا جوانی شیرین، شۆخ ئەرمەنی؟
کوانێ خەرامان[٧٠] نازدار چینی؟
کوانێ هومەیلا،[٧١] لەیلای عامری؟[٧٢]
ئەبرۆ چون کەمان، زولفان عەمبەری
یەکایەك دنیا بادەی تۆ نۆشان
بەردی وە ماوای شار خامۆشان

* * *

[٧٠] خەرامان: ژنێکی زۆر جوان و شۆخ و شەنگ بووە، خەڵکی وڵاتی چین و دڵدارەکەی خورشیدی خاوەرە.

[٧١] هومەیلا (هومای): ناوی دڵدارەکەی هەمایۆنە، داستانێك بە زمانی فارسی بە ناویانەوە هەیە و لە چاپیش دراوە.

[٧٢] لەیلای عامری: کچی مەهدیی عامرییە و عەرەب بووە، خۆشەویستی قەیسی عامری بووە، ناسراوە بە مەجنوون، باوکی ویستوویەتی بیدا بە یەکێکی تر بە ناوی ئیبنی سەلام، لەیلا شووی پێ نەکردووە و لە داخی مەجنوونی ئەوینداری مردووە، لە پاش ئەو مەجنوونیش کۆچی دوایی کردووە.

ئەرێ هەی دنیا! دەنیی بێ حەیا!
چەنی هیچ کامیان نەکەردی وەفا
هەمیشە خەریک ئەفسوونبازی بی
پەی فەوت یاران دایم ڕازی بی
کوانێ تیجاران، ساحێبقەتاران
دایم نە گەردش پەی بەهای شاران؟
کوا بازرگانان ساحێب مەتای چین؟
کوا دوکانداران پەڕ ئەشیای ڕەنگین؟
کوا عاقڵمەندان پەڕ عەقڵ و تەدبیر؟
کوا میرشکاران دەوەندەی نەخچیر؟
کوا نەوجەوانان سەرمەست و مەدهۆش؟
جە عیشق وێشان دایم دڵ وە جۆش
کوانێ میعماران نادیرەی دەوران؟
مەکەردن تەمام قەسر و ئەیوانان
کوا نەجاڕباشی سەرباشقەی نەجاڕ؟
مەکەردش تەمام ئەیوان و تەلار
وەدایم خەریک دنیابازی بین
کەس وە موڵک وێش ڕازی نمەبین
پەی ماڵ دنیا تەلاش مەکەردەن
تا سەر وە سەرای ئەڵحەد سپەردەن

کەس دڵشاد نەبۆ وەی دنیای فانی
دۆست کەس نییە ئەو جە نەهانی
خانا جە داخی دنیای پەڕئەفسوون
دایم غەمبارەن ڕەنگزەرد و زەبوون
یەقین ئەی دنیایچ وە باد سەڕسەڕ
مەشۆ وە فەنا ئەمپەڕ تا ئەوپەڕ
گشت مەبۆ وە گەرد مەشۆ وە سەما
بە ئەمر مەعبوود حەیی بێهەمتا
باقی وەسەلام ئەمجار کۆتا بی
سەلات و سەلام بەر موستەفا بی[۷۲]

---

[۷۲] ئەم شیعرەش لە گۆڤاری بەیان، ژمارە (۱۰۹) وەرگیراوە. لە دەستنووسەکانی مام ڕەشیدی هەمەوەندییشدا بە ناوی خاناوە هاتووە. وەکو مامۆستا قەرەداغی خۆی دەڵێت: یەکەم جار ئەم پارچە شیعرەم لە "گۆڤاری کۆڕی زانیاریی کوردستان"دا بڵاوکردۆتەوە. مامۆستا قەرەداغی لە بەرگی پێنجەمی "بووژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد لە ڕێگەی..."، بە ناوی دووەم "حاجی" لە لا(۱۳۵)دا بە هۆنراوەی ژمارە (٤) بڵاوی دەکاتەوە. جارێکی تر لە بەرگی پێنجەم لا(۱٤٤) و لە بەرگی شەشی لا (٤٤)ی کەشکۆڵی کەلەپووری...، بە ناوی "حاجی"یەوە هێناویەتی. دواتر لە کەشکۆڵەکەی مامۆستا ئیسماعیل کەریمدا هەمان دەق هەبوو، هەر لە کاتی سەرگەرمیمدا بە ڕێکخستنی ئەو کەشکۆڵەوە لە کەشکۆڵی "گوڵزار و بەهار"یشدا هەمان دەقم بینی- وەك لێرەدا دەیبینی- کاتێك لە تەك دوو دەقەکەی دیدا بەراوردم کرد، بینیم ئەمیش دەقێکی ڕەوانە و گەلێك جیاوازیی لەتەك ئەواندا هەیە، گەلێك جار جیاوازییەکان ئەوەندە زۆرن وەك دوو دەق دێنە پێش چاو. ئەم نوسخانە هەموویان جیاوازن و گۆڕانکاریی زۆریان تێدایە. لە کۆڕی زانیاریدا (۵۷) بەیتە و لە هەندێك کی تریشدا (۸۹) بەیت و (۳۷) بەیتە، لە کەشکۆڵی مام ئیسماعیلدا (۸۹) بەیتە. تێکڕا ئەو شیعرەی کە بە ناوی "حاجی"یەوە بڵاوکراوەتەوە (۷۹) بەیتە، شیعرەکەی تری کە بە ناوی "خانا"وەیە (۸۳) بەیتە. لە نوسخەی تریشدا (۳۵) بەیتە و پچڕان و لێ

کەوتنی هەیە. مامۆستا قەرەداغی دەڵێت (٣٥) بەیتە، دوای ئەوەی ئەژمارم کرد، هەموو داستانەکە لەم بەرگەدا (٣٧) بەیت بوو. مامۆستا خۆی ئاماژەی بەم سەرچاوانە داوە کە پچڕان و لێ کەوتن لە لاپەڕەکاندا هەیە، بەڵام ئەم هەموو سەرچاوەیە تاکو ئێستا دەقێکی پاك و بێگەری لێ پەیدا نەبووە کە جێگەی دڵخۆشی بێت بۆ ئەدەبدۆستان و بزانرێ ئەم داستانە یان ئەم تەرجیع بەندە هی چ شاعیرێکە و ساغ ببێتەوە یا ساغی بکاتەوە. جگە لەوەی کە بڕوام بەوە هەیە هۆنراوەکە هی خانای قوبادییە، ئەم دەقەیش دەقێکی خراپ نییە. ڕاستە جیاوازی لە نێوان دەقەکاندا هەیە و بەدی دەکرێت. بەڵام دەقەکەی ئێرە دەقێکی باوەڕ پێکراوە. ئەم پارچە شیعرانە بە هەڵە دراونەتە پاڵ حاجیی شاعیر، لە کاتێکیشدا نازانین ئەو "حاجی"یە، چ حاجییەکی شاعیرە، لە سێ سەرچاوەدا کە ناوی هاتووە، ناوی تەواوی ئەو حاجییە ڕوون نەکراودتەوە. دەکرێت ئەو حاجییانە هاتبن داستانەکانیان نووسیوەتەوە و دەست ڕەنگینیی خۆیانیان تێدا نیشان دابێت، وەکو لە بەرگی پێنجەمی کەشکۆڵی عەبدولفەتاحدا دەبینین کە ناوی هەندێك کەڵەپیاوی لابردووە و ناوی تری لە جێگەیاندا داناوە. نابێ ئەوەش لەیاد بکەین کە ئەحمەد بەگی کۆماسی لەژێر کاریگەریی شیعری "گومڕای سەرنگوون و دنیا مەککارە"ی خانادا ئەم هۆنراوەیەی نووسیوە، لێرەدا بە باشی دەزانم بەشێك لە هۆنراوەکە بخەمە ڕوو:

چەرخ پەڕ خەتەر، چەرخ پەڕ خەتەر
میزام داد جە دەست، چەرخ پەڕ خەتەر
هەر ڕۆ مەنمانۆ، بەد جە بەد بەتەر
نمازۆ بەرشۆ دایەرولبەشەر
کۆن ئادەم و نووح، ئیبراهیم خەلیل
یووسف و یەعقووب، چەنی ئیسماعیل
کۆشی ئەساسەی موڵك سولەیمان
حوکمش ڕەوا بی نە دەور جیهان

ئەمەش کۆتاییی پارچە هۆنراوەکە:

نە تۆ مەمانی، نە بەندەی کەمتەر
کەس بەرنمەشۆ دایەرولبەشەر
حەسرەت مەردەن، سەرت سەلامەت
هەنی بکێشە ئاهی نەدامەت
ئەحمەد کە شەوان هەر نەزارییەن
پەی دەرد موشکڵ بێقەرارییەن

## هەی یاران نیان*

هــــەی یـــــاران نیــــان، هــــەی یـــــاران نیـــــان
نەفـــــەس[1] شـــــووم، ســــەد داغ وە جـــــەرگم نیـــــان
نـــــەهگاری دڵـــــم لـــــێم بییـــــەن عیـــــسیان
ڕایـــــەخم وە مـــــەرد، تـــــۆ نەکـــــشای وە ژیـــــان[2]

* ئەم پارچە شیعرەم لە کەشکۆڵی (عەزیز و سەوزە ئەحمەد) وەرگرتووە. ئەم شیعرەیش یەکێکە لە شیعرە بڵاونەکراوەکانی خانای قوبادی، ئەم پارچە شیعرە بە ناوی "هەفت بەندی خانا"وە لەگەڵ حەوت بەندی "قەدیم موتڵەق"دا بە یەك پارچە دانراوە، دوای لێك

دانەوە و بەراوردکردن و پێداچوونەوە، بۆم دەرکەوت ئەم شیعرە بە هەڵە بە بەندی یەکەمی شیعری حەوت بەندی قەدیم موتڵەق دانراوە، مامۆستا ئەنوەریش درکی بەو هەڵەیە کردووە، بەڵام زۆر ڕوونی نەکردۆتەوە و لە سەر باسەکە نەچووە. لە بارەی ئەم کەشکۆڵەوە مامۆستا ئەنوەر سوڵتانی لە گۆڤاری ژین، ژمارە (١)ی پووشپەڕی ساڵی (٢٠٠٩)ی بنکەی ژیندا بە وردی لەسەری نووسیوە. خەتی ئەم کەشکۆڵە زۆر جوان نەنووسراوە، خۆشبەختی لەوەدایە توانرا زوو بهێنرێتە سەر ڕێنووس و تەنها لە یەك-دوو جێگەدا وشەیەکم بە گومانەوە بۆ خوێنراوەیەوە. لە سەرەتای شیعرەکە نووسراوە: (هفت بند خانەی قبادی) و نووسینەکە بە خەتی سپی و چوارچێوەکەی بە ڕەش دەورە دراوە. ئەم پارچەیەش بێگومانمان دەکات لەوەی خانە و خانا هەر یەك کەسن. وەکو لە جێگەی تردا پەنجەی گومانی لە سەر بووە.

مامۆستا قەرەداغیش لە بەرگی حەوتەمی کەشکۆڵی کەلەپووری ئەدەبی کوردییدا، ئەم هۆنراوەیە و هۆنراوەی "هەر هەی بڵند ماڵ"ی بڵاو کردەوە. لەبەر ئەوەی لە نێوانیاندا جیاوازیی زۆر هەبوو، بە باشم زانی بەراوردیان بکەم.

[1] لای (م) "نەفس" نووسراوە.

[2] ئەم بەیتە لای (مع) بەم شێوەیە هاتووە:

گوناهکاریی وێم، لێم بیەن عەیان
بێزارم جە زەوق، جە شادی و ژیان

**مەر نەبیوڵڵا عەزیم ئەنبیان[٣]**
**بوازۆ شیفام، وەرنە ڕووم سیان**

****

ساقی نەفەس[٤] شووم، سەرشارم کەردەن
جەوساوە باڵ عیسیانم وەردەن[٥]
خودا و پێغەمبەر جە یادم[٦] بەردەن
جەو سەبەب تەبعم، جە تاعەت سەردەن
**مەر زات ئەو کەس قودرەی ئەتقیان[٧]**
**بوازۆ شیفام، وەرنە ڕووم سیان**

****

چون بێشعوور و شێت بێچارەم
هەم سایەی مەریخ، زوحەل ستارەم[٨]
بازم وەردەی دەست نەفس ئەمارەم
جە سوورەت موسحەف چون دێو ئاوارەم[٩]

---

[٣] ئەم تاکە لای (م) بەم شێوەیە هاتووە: "مەر ڕەسوولوڵڵا (ختم الانبیان)".

[٤] ئەم وشەیە لای (مع) نووسراوە (نەفس) و دروستترە، ئێمەش ئەوەی لای (مع)مان دانایەوە.

[٥] ئەم تاکە لای (مع) بەم شێوەیە هاتووە: "جە صوب کە بادەی عیصیان پێم وەردەن".

[٦] لای (م) نووسراوە "جە مەر سەرم". ئەوەی (مع) ڕاستتر بوو، هەر ئەوەمان دانایەوە.

[٧] ئەم تاکە لای (م) بەم شێوەیە هاتووە: "مەر زات ئەو کەس تەڵەب (الانبیان)". ئەوەی (مع) ڕاسترە و دامانناوە.

[٨] ئەم تاکە لای (مع) بەم شێوەیە هاتووە: "هام خانەی مەڕیخ سیا ستارەم".

[٩] ئەم بەیتە لای (مع) بەم شێوەیە هاتووە:

**مەر (خاتم الرُسْل، أملح الادیان)[١٠]**
**بوازۆ شیفام، وەرنە ڕووم سیان**

❊ ❊ ❊ ❊

**ئاخ وەی من پەی وێم فرە دلگیرم[١١]**
**شەریك شەیتان، شووم شەریرم**
**جە ژەنگ عیسیان، تارەن[١٢] زەمیرم**
**تەوحید و تاعەت، شییەن جە ویرم[١٣]**
**مەر شەفاعەتخوای زومرەی عاسییان[١٤]**
**بوازۆ شیفام، وەرنە ڕووم سیان**

❊ ❊ ❊ ❊

**خانە! موقیڕم[١٥] من بە گونای وێم**
**هەوای نەفس شووم، ئینە کەردەن پێم[١٦]**

---

بازنەی وەردەی نەفس شووم ئەمارەم
جە سەواد عەرش عەزیم ئاوارەم

[١٠] ئەم تاکە لای (م) بەم شێوەیە هاتووە: "مەر (رسول الله)، بالّم لە (الادیان)". ئەوەی لای (مع) دروستترە.

[١١] ئەم تاکە لای (م) بەم شێوەیە هاتووە: "وەی من پەرێ وێم، فرە دووی کەسەریم". ئەوەی لای (مع) دروستترە.

[١٢] ئەم وشەیە لای (مع) نووسراوە "تیەن".

[١٣] ئەم وشەیە لای (مع) نووسراوە "نە ویرم".

[١٤] ئەم تاکە لای (م) بەم شێوەیە هاتووە: "مەر (نبی الله عظیم الانبیان)". ئەوەی لای (مع) دروستترە.

[١٥] ئەم وشەیە لە دەستنووسەکەدا نووسراوە "مقڕم".

بــــه وێــــم مــــــەزانان، خەرابـــــەن خـــــەدێم
هەرچـــه وێـــم کـــالاَن، گـــشت مـــەیۆ نـــەرێم[١٧]
مەگـــەر کـــه شـــافیع، زومـــرەی عاســـیان[١٨]
بـــــوازۆ شـــــیفام، وەرنــــــه ڕووم ســــیان[١٩]

❊❊❊❊

عەجــەب چــون شــەیتان بــه وێــم مــەغروورم
تۆشـــــــەی[٢٠] قیامـــــــەت نییـــــــەن زەروورم
فـــره نافـــــەرمان جـــــه ڕای حـــــەق دوورم
چـــمان جـــه یـــــاران وه پـــــای ســـــەبوورم[٢١]
مـــــەر هـــــەم (محمـــد خـــیر الانبیـــا)ن[٢٢]
بـــــوازۆ شـــــیفام، وەرنــــــه ڕووم ســــیان

---

[١٦] ئەم تاکە لای (مع) بەم شێوەیە هاتووە: "پەی چی هەوای نەفس عەجەب کەردەن".
[١٧] ئەم بەیتە لای (مع) نییە.
[١٨] ئەم تاکە لای (مع) بەم شێوەیە هاتووە: "مەر زات ئەو کەس (صافی الاصفیان)".
[١٩] ئەم بەندە و بەیتێکیشی لای (مع) نییە، کەوتۆتە بەندی کۆتایی و پێش و پاش کەوتوون.
[٢٠] ئەم وشەیە لای (مع) نووسراوە "هیچ پەی".
[٢١] ئەم بەیتە لای (مع) بەم شێوەیە هاتووە:
چون بیٚ دەوڵەتان لە تاعەت دوورم
چمان جە یـــــاران (زیل پیبورم!)
[٢٢] ئەم تاکە لە لای (م) بەم شێوەیە هاتووە: "مەگەر موحەممەد حەبیب یەکستان". ئەوەی لای (مع) ڕاستترە.

## دڵ بییەن سەرشار*

دڵ بییەن سەرشار، دڵ بییەن سەرشار
دڵ بییەن جە جام مەعسییەت سەرشار
کەس نییەن چون من عاسیی خەتابار
عیبرەت لێم گرتەن تائیفەی کوففار
(یا دائم الفضل!) ڕەحمەت بێشومار
(إحفظني بالفضل، من عذاب النار!)

❊❊❊❊

من بەندەی موزنیب ساحێب تەقسیرم
بەردەن هەوا و نەفس نامت جە ویرم
هەر چەند شایستەی حەبس تەعزیرم
بافت سزای سەخت نار سەعیرم
(یا عظیم العفو!) تەوبە و ئیستیغفار
(احفظني بالفضل من عذاب النار!)

❊❊❊❊

---

* ئەم شیعرە جگە لەوەی لە "کەشکۆڵە شیعرێکی کوردی گۆرانی"، شێخ عەبدولموئمینی مەردۆخیدا بڵاوکراوەتەوە، دیسان لە "کەشکۆڵی کەلەپووری ئەدەبی کوردی"ی مامۆستا موحەممەد عەلی قەرەداغی، لە بەرگی دووەمدا بڵاوکراوەتەوە، زیاتر سوودم لە کەشکۆڵە شیعرێکی گۆرانی وەرگرت و یەکێك لە نیوەبەیتەکانیش تەواو نەبوو، ئەو نیوەبەیتەم لەسەر پارچە شیعرەکەی لای مامۆستا محەمەد عەلی قەرەداغی ساغ کردەوە، چەند بەیتێکی ئەم هۆنراوەیە لە کۆتاییی داستانی یووسف و زولەیخاشدا هاتووە. دیسان چەند جیاوازییەك لە نێوان دوو چاپەکەدا هەبوو، ئەوانەش لێرەدا دەخەمە ڕوو.

مەئیوسـم کـەردەن هـەوای نـەفس شـووم
غـەیر جـە زات حـەق کـەس نییـەن ئـەرجووم
فـریێ ڕووزەردم جـە فیعـل مـەزمووم
نـەدارۆن تاقـەت نـائیرەی زەقـووم
(یـا کـثیر اللطـف!، قـدیم الاخبـار
أحفظـني بالفـضل مـن عـذاب النـار)

❊❊❊❊

مەلـەرزۆن جـە خـەوف چـون شـاخ عەرعـەر
جـە هـەیهات هـەیهات سـەخت پڕخەتـەر
جـە تـەنافبازیی سـیرات[1] مەحـشەر
جـە نرکـەی نـیران[2] نـائیرەی سـەقەر
(یـا غـافر الـذنب،[3] ذا الجـود، جبّـار!
احفظـني بالفـضل مـن عـذاب النّـار!)

❊❊❊❊

سـەفابەخش بـەزم سـۆفیان سـاف
نیگارنـدەی[4] چـەتر بـەرز بێتـەناف[5]

---

[1] لای (مع) نووسراوە "ڕۆی دەشت".
[2] لای (شع) نووسراوە "جە نرکەی نیران".
[3] سەرەتای بەشی ئایەتی (٣)ی سوورەتی (غافر)ە.
[4] لای (شع) نووسراوە "نیگادارندەی"، ئێمە ئەوەی (مع)مان بە دروستتر زانی. هەروەها لە نوسخەی تریشدا هەر وەکو (مع) هاتووە.
[5] لای (مع) نووسراوە "نۆ".

(عمـــــيم الاحـــــسان، خفـــــي الالطــــاف
ســاتر العيــوب جــه قــاف تــا بــه قــاف)[٦]
باجـــەتی ڕەســــوول ســـەيید موختـــار
(احفظــني بالفــضل مــن عــذاب النــار)!

****

خانــا هــا جــه خــەوف زەمزەمــەی حیــساب
جــه شــەکوەی دیــوان[٧] (شَــدید العِقــاب)
چــون مــەل نــه ئــایر جەرگــشەن کــەباب
هــەردەم مەواچــۆ بــێ پــەردە و حیجــاب
(یــا جُــل الإحــسان)، ســرپۆش ســەتتار!
(احفظــني بالفــضل مــن عــذاب النــار!)[٨]

---

[٦] ئەم خشتەیە لای (مع) نییە و داخوراوە.

[٧] لای (مع) ئەم سێ وشەیە داخوراوە.

[٨] دیسان لای (مع) نییە و داخوراوە. مامۆستا محەمەد ڕەشیدی ئەمینی دەستنووسێکی تری بۆ ناردم، دوای بەراوردکردن و پێداچوونەوەی هەر دوو دەقەکە، هەندێك جیاوازی لە نێوان دوو دەقەکەدا هەبوو، هەرچەندە پارچە شیعرەکەی لای مامۆستا محەمەد ڕەشید هەندێك کەموکورتیی تێدا بوو، بەڵام جێگەی دڵخۆشی و شانازییە و سوپاسی ئەو ماندووبوونەی دەکەم کە لە پێناوی خانای قوبادیدا داویەتی. وشەی یەکەم بۆ دەقی یەکەم لای (مع) و وشەی دووەم بۆ دەقی دووەم لای (مپ): خاتی = خەتای. خەتابار= خەتاکار. هەوا و نەفس= هەوای نەفس. جەویرم= جەویرم. تەعزیرم= تەقدیرم. بافت= باب. سەخت پڕخەتەر= سەخت رۆی مەحشەر. غەیر زات حەق= بغەیر جە زاتت. فرێ= فرە. نائیرەی زەقووم= نایەرەی سەمووم. نائیرەی= نایەرەی. عمیم= کپیر. باجەتی ڕەسوول

# حەوت تەرجیع بەند*

## بەندی یەکەم

قـــــەدیم موتلّـــــەق، قـــــەدیم موتلّـــــەق!
یـــــا قـــــایم بـــــە زات، قـــــەدیم موتلّـــــەق!
حـــــەیی بێـــــزەواڵ، قـــــەییووم[1] بەرحـــــەق!
نیگارنـــــدەی نـــــەقش نـــــۆ تـــــاق ئـــــەزرەق!
لاهـــــوت،[2] بێـــــشەریك، بینـــــای بێمانەنـــــد!
یـــــەکتای بێنـــــەزیر، بێمیـــــسل و پەیوەنـــــد![3]

---

سەیـد... لای (مپ) لە کۆتاییی شیعرەکەدا نووسراوە. ها= هەم. خەوف= خۆم. نەئایر جەرگشەن= بە ئایر چەرگمەن. مەواچۆ= مەواچۆن. یا جل و الاحسان... لای (مپ) نییە.

* ئەم تەرجیع بەندە لەبەر ڕۆشنایی سێ چاپدا بەراوردم کردووە، هەموو جیاوازییەکانم دەستنیشان کردووە. ئەوەی جێی ئاماژەیە، بەندی یەکەم و دووەم بە ناوی میرزا شەفیعی پاوەییەوە لـە سـەرەتای "شـیرین و فـەرهاد"دکەیـدا بڵاوکراوەتەوە، هەر چەندە ئەم شیرین و فەرهادە هی میرزا شەفیعی پاوەییش نییە، بەڵام بە ناوی ئەوەوە چاپ کـراوە و لە ڕاستیدا هی "میرزا شەفیعی کولیایی"یە. بە یارمەتیی خودا لـە دیـوانی مـیرزا شـەفیعی کولیاییـدا ئـەو بەڵگانەی لەو بارەیەوە هەیە دەیان خەمەڕوو. دەبێ ئەوەیش بڵێم کـە ئـەو بەندەکـەی تـری شـیعرەکە لـە کتـێبی "تاریخی مەشاهیری کورد"ی بابا مەردۆخەوە وەرگیراوە. هەروەها لە گوڵزاری کوردستاندا تەنها بەندی پێنجـەم بـە ناوی خاناوە بڵاوکراوەتەوە. لەم دواییانەدا زۆر نوسخەی تری ئـەم شـیعرە کەوتنـە بەردەسـتمان، لەبـەر ئـەوەی زۆر تێکەڵ و ئاڵۆز دەبوون، بە باشمان زانی کە تەنها شیعرەکان پێداچوونەوەیەکی تری بۆ بکەین و وردتر لە شـیعرەکان بڕوانینەوە.

[1] لای (مع) نووسراوە "قەدیم".

[2] لای (مع) (لاهوت) نییە.

[3] لای (مع) نووسراوە "پێوەند".

(واجب الوجود لا احصی ثنا)
مونەززەه جە عەیب، عاریی جە مەنا!
مونشی ڕەقەمسەنج، ئینشای شادی و زەوق
بێپەروا جە تەعن، ئەشیای تەحت و فەوق!
بەخشندەی بزورگ، بێباك جە تانە
نازکێش زومرەی خوێش و بێگانە!
بۆ بەشق ئەو شا،[4] بێحەد سیفاتەن
باعیس ئیجاد گشت مەخلوقاتەن[5]
باجەتی سەیید (ختم المرسلین
شای (قاب قوسین،[6] رب العالمین!)
بە حەقق ئەرباب شەوزیندەداران[7]
بە ئیخلاس پاك تاعەتگوزاران
**خانای قوبادی** مەعسییەت بارەن
فریفتەی شەیتان شووم بەدکارەن[8]

[4] لای (مع) نووسراوە "زاتت".
[5] لای (مع) نووسراوە "مەوجوودات".
[6] بەشێکە لە ئایەتی (٩)ی سوورەتی (النجم).
[7] لای (مع) نووسراوە "شەب".
[8] لای (مع) نووسراوە "بەدچارەن".

جــه فيتنـــــەى شـــەيتان شـــەيتەنەت پيـــشە
جــه شــوومى، ئــەى نــەفس، دوور جــه ئەنديــشە
تــــا (يـــوم الممـــات) نيگاهـــداريش[٩] كـــەر!
عـــــيلاج دەردان شەرمەســـــاريش كـــــەر!
پـــەى چـــێش؟ نافـــەرمان شـــێت[١٠] و مـــەغروورەن
چـــــون بێدەوڵـــــەتان جەتاعـــــەت دوورەن
مەگـــەر هـــەم[١١] بـــه ڕەحـــم[١٢] چـــون تـــۆ ڕەحيمـــێ
(عمـــيم الاحـــسان)، عـــه تـــا عـــەزيمێ
ببـــۆ بـــــه ئـــيخلاس گوناكـــاريى ئـــەو
ئـــەى كـــەم خدمـــەتى و شەرمەســـاريى ئـــەو[١٣]
وەرنـــــه بـــــه زاتـــــت جـــــه لاى زات تـــــۆ
مەكـــەرۆن ڕۆى حەشـــر، مـــن شـــكات تـــۆ!

---

[٩] لاى (مع) نووسراوه "نيگەهدارش".
[١٠] لاى (مع) نووسراوه "پەى چى نافەرمان شووم".
[١١] ئەم دوو وشه لاى (مع) نييه.
[١٢] لاى (مع) نووسراوه "عەفوو".
[١٣] ئەم خشتەيه لاى (مع) بەم شێوەيه نووسراوه:

بەيۆ بـه ئيصلاح گونەهكاريى من
ئەى كەم خدمەتى شەرمەسارى من

## بەندی دووەم

یـا حـەی![١٤] کـەس چـون تـۆ، پـەریٚ کـەس[١٥] نییـەن
کـەس چـون تـۆ، بـە داد مـوئمین ڕەس نییـەن
کـەس چـون تـۆ کـەریم کەرەمـدار نییـەن
کـەس چـون تـۆ غـەفوور هـەم غـەففار نییـەن[١٦]
لوتفـت بیٚـشومار، عـەفووت عەزیـمـەن
ڕەحمـت بیٚپایـان عـەتات عەمیمـەن
جـە قـاف تـا بـە قـاف، مـەعنی شـکاوان
کـەس عـەقلّش[١٧] بـە کونیـەی زاتـت نـەیاوان
بیٚـشوبهە و شـەریك، تـاك تـەنیانی
نەقـشبەند وەزع دەور دنیـانی
بزورگـی و بەخـشش خەتمـەن بـە نامـت
سەرسـامەن شـاهان، جیهـان جـە[١٨] سـامت

[١٤] لای (مع) نووسراوە "حەق".
[١٥] لای (مع) نووسراوە "پەریٚو کەس".
[١٦] لای (مع) ئەم خشتەیە بەم شیٚوەیە نووسراوە:

چون تۆ کەس غەفوور هەم غەفار نییەن
چون تۆ کەس کەریم کـەرەمدار نییەن

[١٧] لای (مع) ئەم وشەیە بەم شیٚوەیە نووسراوە (عقیق!).
[١٨] لای (مع) نووسراوە "نە".

قاهیران دەور، جە قەهرت ماتەن
وەسف[19] عەزیمت بێحەد سیفاتەن
عەفووت جای ئومێد بێگانە و خوێشەن
لوتفت دڵنەواز گەدا و دەروێشەن
ئومێدم ئێدەن: لاشەریك! بێباك![20]
بەشق شای ئەوڕەنگ (وَمـا أرسَلناك)
جە عەرسەی مەحشەر مەکەر تەریقم
بە جەزبەی تەوفیق بدەر[21] تەوفیقم
سەوگەند بە زاتت، یەکتای یەگانە!
نییەن جە عەرسەی دەور زەمانە[22]
هەر تا کە زندەم مەوجوود موتڵەق![23]
قەییووم قایم، قەدیم بەرحەق!
زوانم[24] جە زیکر وێت مەکەر خاموش
نامت با جەلام نەبۆ فەراموش

---

[19] لای (مع) نووسراوە "زات".
[20] لای (مع) نووسراوە "پاك".
[21] لای (مع) نووسراوە "فەزڵت بدەی"، لە دەستنووسەکەی لای (مپ)، "لوتفت" نووسراوە.
[22] لای (مونا) ئەم خشتەیە نییە.
[23] ئەم تاکە لای (مع) بەم شێوەیە نووسراوە: "هەر تا زیندەنان وجوود موتڵەق".
[24] لای (مع) نووسراوە "زوبانم".

جیهانئافــــــەرین، بەخـــــشندەی ئەکبـــــەر!

خانـــــا بێـــچارەن[٢٥] فریادڕەســـــیش کـــــەر!

وەرنـــــە بـــــە زاتـــــت جـــــە لای زات تـــــۆ

مەکـــەرۆن ڕۆی حەشـــر، مـــــن شـــکات تـــــۆ

## بەندی سێیەم

یـــــا ڕەب مـــــن بەنـــدەی نافـــەرمان تـــۆم!

بێپـــــەروا جـــــە فیعـــــل عیـــــسیان بێـــــشۆم

حـــــەبیبی[٢٦] لاشـــــەریك، فـــــەرد فـــــەریادڕەس!

کـــــەریم کارســـــاز، پـــــەی بێکەســـــان کـــــەس!

چـــون مـــن گونابـــار[٢٧] مەینـــەت بـــە کـــۆیی

چـــون تـــۆ بەخـــشندەی کـــەرەم بێـــشۆیی

چـــون مـــن شەرمەســـار شـــووم بـــەدکاری

چـــون تـــۆ کەرەمـــدار نیکـــۆکرداری[٢٨]

---

[٢٥] لای (مع) نووسراوە "بیَ چارە".

[٢٦] لای (مع) نووسراوە "پەی چێش".

[٢٧] لای (مع) نووسراوە "گوناکار".

[٢٨] لای (مع) ئەم خشتەیە بەم شێوەیە نووسراوە و پاش و پێش لە خشتەکانی پێش خۆیدا هەیە:

چون من نافەرمان جە تاعەت دووریَ

چون تۆ خەتابەخش فەرد غـــەفووریَ

چون من نافەرمان[29]، خەتا عەزیمی
چون تۆ ساحێب ڕەحم فەرد ڕەحیمی
چون من ڕووسیای جە تاعەت دووری
چون تۆ پادشای فەرد غەفووری[30]
سەوگەند بە زاتت، یەکتای یەگانە!
نییەن نە عەرسەی دەور زەمانە
مەعلوومەن جەلات حەییی تەوانا!
قەییووم قائیم،[31] قەدیم دانا!
جەو پەی[32] جە عیسیان دلێریم کەردەن
تەقسیرم جە حەد حیساب وییەردەن
ئەر ئەی فیدات[33] بام! نامت غەففارەن!
بەخشندەگی و عەفوو تۆ بێشومارەن
(یا عظیم العفو، لا أحصی ثنا)
ئەر تۆ بە تاعەت ببەخشی گونا
ئەمرت موتاعەن حوکم هەر حوکم تۆن
بەڵێ فیدات بام سا عەتای تۆ کۆن؟

---

[29] لای (مع) نووسراوە "خەتابار".
[30] لای (مع) ئەم خشتەیە نییە.
[31] لای (مع) نووسراوە "قایم". لە دەستنووسەکەی (مپ) نووسراوە "لاقەید".
[32] لای (مع) نووسراوە "پێ".
[33] لای (مع) نووسراوە "فیدای نامت".

مــن ئومێــدم هــەن جــە تاعــەی[٣٤] کــوبرا
بــە ئــەڵتاف وێــت بــێ بــەیع و شــەرا[٣٥]
خانــای خــەم خــەیاڵ خاترشــاد کــەری
جــە عەرســەی مەحــشەر ســەر[٣٦] ئــازاد کــەری
وەرنــە بــە زاتــت جــە لای زات تــۆ
مەکــەرۆن ڕۆی حەشــر، مــن شــکات تــۆ

## بەندی چوارەم[٣٧]

یــا حــەی! ئــەر بــەدخووم، ئــەر پــاکیزەخووم
گونــای مــن چێــشەن؟ ئافەریــدەی تــووم
شــەڵڵا ڕۆی ئــەزەل نــەربیا وە جــەور
نەکێــشای تەســویر هەســتیی مــن وەی تــەور[٣٨]

---

[٣٤] لای (مــع) نووســراوە (تانــەی!) ، دیــارە مامۆســتا بــاش بــۆی نەخوێنراوەتــەوە لــە دەســتخەتەکەدا، لــە دەســتنووســەکەی (مپ) نووسراوە "تامە".

[٣٥] لای (مع) نووسراوە "شیرا".

[٣٦] لای (مع) نووسراوە "جە عەرصەی حەشرش سەر".

[٣٧] لە کۆواری دەنگی گێتیی تازە، خولی یەکەم، بەرگی سێیەم، ژمارە (١ – ٦)، تشرینی یەکەمی (١٩٤٤-مارتی ١٩٤٥) تەنها بەندی چوارەمی ئەم تەرجیع بەندە بڵاوکراوەتەوە.

[٣٨] لای (مع) ئەم خشتەیە بەم شێوەیە نووسراوە:

مەبیــــا ڕۆی ئەزەل ئەر نەبیا جەور
نەگێشای تەصویر هەستی من بەی تەور

سـا کـه کێـشانت[39] بینـای باڵادەسـت!
مـن هـەر سونع تـۆم، ئـەر خاسـم،[40] ئـەر گەسـت
حـاکمی تـۆ، هـەم وێـت کـەر بـە قـازی[41]
کـەس بـە سـونع وێـش چـون نییـەن ڕازی؟
سـونع تـۆ بـە دەسـت وێـت ئافەریـدەن
ئـەر نـەبۆت پەسـەند کـێ پەسـەندیدەن
بـەڵێ هـەی عـەلیم ئاگـای سـیڕڕ غـەیب!
موبـەڕڕا جـە شـیرك، عـاری جـە هـەر عـەیب!
ئـەوڕۆ کـە هەسـتیی منـت[42] کـەرد ڕەقـەم
(والله وبـالله)، بـە زاتـت قەسـەم!
ئـەر مـەبی بـە دەسـت مـن ئیختیـارێ
جـەو دەمـدا دەرلاد مەکـەردم[43] کـارێ
دونیـای بێوەفـای تـۆ نـەدیام بـە چـەم
نەکـەوتام بـەی تـەور،[44] نـە گێجـاو خـەم

---

[39] لای (مع) نووسراوە "ساچون کێشانت".
[40] لای (مع) نووسراوە "پاکم".
[41] لای (مع) ئەم تاکە بەم شێوەیە نووسراوە "تۆ حاکمی وێت هەم کەر بە قازی".
[42] لای (مع) نووسراوە "هەیئەت".
[43] لای (مع) نووسراوە "مەکەرووم".
[44] لای (مع) نووسراوە "نەکەفتا بەی تەور".

ئێستە چونکە تۆ عەلیم دانا!
بێ تەعلیم عیلم، دانا و تەوانا![45]
نارەزایەتی ئەجزای تەرکیبم
ئازاب[46] دنیات کەرد وە نەسیبم
بۆ[47] بەشق پاکی پیری تەریقەت
بە ڕوکن[48] ئەحکام کوللی شەریعەت
بە قەییوومیی وێت، یا قایم بە زات!
خانا جە دیوان عەرسەی عەرەسات
نەکەری[49] جە فەیز فەزڵ وێت مەحرووم!
نەنویسیش جە ئەهل مەخزوولان شووم!
وەرنە بە زاتت جە لای زات تۆ
مەکەرۆن ڕۆی حەشر، مەن شکات تۆ!

---

[45] لای (مع) ئەم خشتەیە بەم شێوەیە نووسراوە:

ئیسە کە چون تۆ عەلیم دانا
بێ تەعلیم عیلم داناى تەوانا

[46] لای (مع) نووسراوە "ئاداب".

[47] لای (مع) نووسراوە "بۆ".

[48] لای (مع) نووسراوە "مالش".

[49] لای (مع) نووسراوە "نەکەرش".

## بەندی پێنجەم

پادشـــــای شـــــاهان، ئیقلـــــیم هەســـــتی!
نـــــەققاش تەســـــویر بڵنـــــدی و پەســـــتی!
میعمـــــار تـــــەرکیب[٥٠] دەوران دڵکـــــەش!
دەفتـــەر بەنـــد نـــەوع هـــەفت و چـــار و شـــەش![٥١]
بـــۆ[٥٢] بەشـــق قـــودرەت لاتـــەناهیی[٥٣] وێـــت
بـــە شـــکۆی عـــەزیم پادشـــاهیی[٥٤] وێـــت
جـــەی بەنـــدەی عـــاجز، شـــێت دێوانـــە
نـــە هـــیچ بابـــەتێ مـــەگیر بەهانـــە[٥٥]
پـــەی چـــێش لایـــەزال، بـــێ شـــوبهە و مانەنـــد!
مونـــەززەھ جـــە قەیـــد چـــون و چـــرا و چـــەند[٥٦]
غـــەیر جـــە زات تـــۆ نـــەدارۆن[٥٧] ئەنـــدێش
هـــیچ ئـــەمرێ نییـــەن کـــەس بـــە دەســـت وێـــش

---

[٥٠] لای (مع) نووسراوە "میعمار (ترسیس)".

[٥١] لای (مع) نووسراوە "دەفتەربەند نەوع هەشت و چار و شەش".

[٥٢] لای (مع) نووسراوە "بۆ".

[٥٣] لای (مع) نووسراوە "پهنایی".

[٥٤] لای (مع) نووسراوە "پادشایی".

[٥٥] ئەم تاکە لای (مع) بەم شێوەیە نووسراوە: "جە هیچ بابەتێ نەگیرۆ بانە".

[٥٦] لای (مع) ئەم خشتەیە بەم شێوەیە نووسراوە:

پەی چێش لاشەریك بێ میسل و مامەند
موزەھ جە قەید چۆن و چێش و چەند

[٥٧] لای (مع) نووسراوە "نەدارۆ".

مەرکێن ئیختیار وە دەست وێشەن؟
سا خوردەگیری و بەهانە چێشەن؟
ئەر شێخ کوبرا، ئەر سۆفی سافەن
ئەر دانا و نادان، ئەر مووشکافەن
بێ جەزبەی تەوفیق چون تۆ فریادڕەس
هیچ کەس[٥٨] نەبەردەن پەی مەقسەد کەس
کەسێ جە ئیبلیس ساعیتەر نەبی
چون جەزبەی تەوفیق تۆ[٥٩] یاوەر نەبی
بە عەبەس بەرشەی جەفا بەردەنش
تەوقێ جە لەعنەت شی[٦٠] نە گەردەنش
بە سەعی و کۆشش ئەر[٦١] نمەبی شووم
بەرسیسای عابید کەی مەبی مەحرووم؟
خانای خاترتەنگ جە عەرسەی مەحشەر
ئەگەر نەبەخشیش[٦٢] دەهەندەی داوەر!

---

[٥٨] لای (مع) نووسراوە "هەرگیز".
[٥٩] لای (مع) نووسراوە "تۆش".
[٦٠] لای (مع) نووسراوە "شیی" و ئەم وشەیەیان ڕاستە.
[٦١] لای (مع) نووسراوە "بە کۆشش کۆشش نەو".
[٦٢] لای (مع) نووسراوە "ئەر تۆ ببەخشی".

وەرنە[٦٣] بە زاتت جە لای زات تۆ
مەکەرۆن ڕۆی حەشر، مەن شکات تۆ!

## بەندی شەشەم

کەریم کارساز، بەخشندەی داوەر!
ڕەونەقبەخش سەتح ڕەواق شەش دەر!
تۆ ئەو قادری بە دەست قودەرت
بێ ئیمداد غەیب بێ تەرز و سوورەت[٦٤]
بێ گونیاو و خەت، بێ شەبەکە و سیم
بێ خشت و ستوون، ئوستاد و تەعلیم[٦٥]
بێ فیعلە و بێ ڕەنگ، بێ خامە و شەنگەرف
بە مەحز ئیزهار، ئیشارەی دوو حەرف[٦٦]
سیمابگۆن سەقف نە سوپەهر بەرز
سەتح سەرزەمین، بێ تەرکیب و تەرز

---

[٦٣] لای (مع) نووسراوە "سەوگەند".

[٦٤] لای (مع) ئەم خشتەیە بەم شێوەیە نووسراوە:

تەوانا و قادر بە دەست قودرەت
بێ ئیمداد غەیر بێ تەرز و صورەت

[٦٥] لای (مع) نووسراوە "بێ ئوستاد و تەعلیم".

[٦٦] لای (مع) ئەم خشتەیە بەم شێوەیە نووسراوە:

بێ فەعلە و ڕەنگ، بێ خامە و شەگرەف
بە مەحز ئیزهار شایبەی دوو حەرف

جیهانئافەرین، جیهاندار فەرد
نە عەرز شەش ڕۆ ئافریدەت کەرد
بنازوون پەی سونع، بەی جیهانسازیت
بەی بەخشندەگی و چیهرەپەردازیت[٦٧]
تەعالا نییەن کەس بە سیفاتت
عارییەن جە عەیب بوزورگیی زاتت
بەڵێ هەی عەلیم ئاگای سیڕڕ غەیب!
گۆیای کەلیمەی[٦٨] بورهان لاڕەیب
خانا جە دەرگای[٦٩] زات بێزەواڵ
جە ڕووی گوستاخی مەپەرسۆ هەواڵ[٧٠]
سا جە بەندەگان کێ تەقسیرشەن
کێ ساحێب قەزا، کێ تەقدیرشەن؟[٧١]
گا شەیتان، گا نەفس شووم شەڕانگێز
مەکەری پێشان تۆ بە دەستئاوێز

[٦٧] لای (مع) ئەم تاکە بەم شێوەیە نووسراوە: "بەی گشت بەخشندەی چیهرە پەردازیت".
[٦٨] لای (مع) نووسراوە "کەلیم".
[٦٩] لای (مع) نووسراوە (ترباس) ، دیارە مامۆستا باش بۆی نەخوێنراوەتەوە، بۆیە لەنێو کەوانەی داناوە.
[٧٠] لای (مع) نووسراوە "ئەحواڵ".
[٧١] لای (مع) نووسراوە "تەدبیرشەن".

مەنیەی نەگەردن چەندین گۆناشان
بە ئاهر[٧٢] دۆزەخ مەدی سزاشان
هەر چی ڕەزاتەن مەکەری تەقدیر
گشت کەردەی وێتەن کێن ساحێب تەقسیر؟
چونکە بەی تەورەن، ئومێدم هەن پێت
ببەخشیم وە عیشق بێپەروایی وێت
وەرنە بە زاتت جە لای زات تۆ
مەکەرۆن ڕۆی حەشر، من شکات تۆ!

## بەندی حەوتەم

یا قایم بەزات، قەدیم قەییووم!
هەر چەند کەچڕەفتار، هەم بێ ئابڕووم!
قەسەم بە زاتت، یاگەی ئومێدەن
ئەر مەکەیم وە سەنگ ڕاستش هەر ئێدەن:
نە زەڕڕەێو[٧٣] گۆنای نەفس ئەمارەن
نە فیتنەی شەیتان شووم بەدکارەن،[٧٤]

[٧٢] لای (مع) نووسراوە "بە ئایرەی".
[٧٣] لە نوسخەیەکی تردا نووسراوە "زەڕڕەیێ"، بەڵام ئەوەی لای (مع) دروستتر بوو.
[٧٤] لای (مع) نووسراوە "بەدچارەن".

هەرچی مەکریۆ[٧٥] بە ئیرادەی تۆن
کەسێ چکارەن؟[٧٦] ساحێب وجوود کۆن؟
حاکمی و حوکم بێحەد ڕەواتەن
مەکریۆ و مەشۆ هەر چە ڕەزاتەن
ئەمرت موتاعەن مەشۆ وە ڕاوە
نییەنی وە تەنگ شاه و گەداوە[٧٧]
هەر چەند ئەی حەرفە جە ئەدەب دوورەن،
خاریج ڕای شەرع ئەهل شعوورەن
قەسەم وە[٧٨]زاتت گشت کەردەی وێتەن!
گۆنای کەس نییەن بنیادەم شێتەن
چونکە تۆ بەی تەور ساحێب هیممەتی[٧٩]
(شدید العقاب) والاّ شەوکەتی
بە عیشق ڕەسوول سەیید سەروەر
جە زەلزەلەی سەخت هایڵەی مەحشەر

---

[٧٥] لای (مع) نووسراوە "هەرچێو مەکەری".
[٧٦] لای (مع) نووسراوە "کەسێو چ کارەن".
[٧٧] لای (مع) ئەم خشتەیە نەنووسراوە.
[٧٨] لای (مع) نووسراوە "سەوگەند بە".
[٧٩] لای (مع) ئەم تاکە بەم شێوەیە نووسراوە: "چونکە بەی تەورە صاحێب قودەرەتی".

ڕەببـــــا! بێـــــشەریك فریادڕەســــیم کـــــەر!
یـــــا ڕەحـــیم ڕەحمـــــێ وە بێکەســــیم کـــــەر![80]
وەرنـــــە بـــــە زاتـــــت جـــــە لای زات تـــــۆ
مەکـــــەرۆن ڕۆی حەشـــــر، مـــــن شـــکات تـــــۆ

---

[80] لای (مع) ئەم خشتەیە وا نووسراوە:

ڕەئووف بێ شەریك فەریاد ڕەسیش کەر
ڕەحمێ- یا ڕەحمان- وە بێکەسیش کەر

# هۆنراوە هەمەچەشنەکان

## بای شەماڵ ڕێشەن*

بـــای شـــەماڵ ڕێـــشەن، بـــای شـــەماڵ ڕێـــشەن
ســـــوفتەی دڵ بـــــە داغ، مەینـــــەتان ڕێـــــشەن[1]

---

* ئەم پارچە شیعرە لەبەر ڕۆشنایی حەوت نوسخە کاری لەسەر کراوە، مامۆستا موحەممەد عەلی قەرەداغی لە ڕۆژنامەی هاوکاری بە ناوی دیلێتیی خانای قوبادی بڵاوی کردۆتەوە. لە کەشکۆڵی (مینای شکستە)ی نەجمەدین مەلا، بەرگی یەکەم لە لاپەڕە (٦٨-٧٠) هاتووە و لە کەشکۆڵی "نووسراوی پەرێشان" کە بە مینای شکستەش ناسراوە، لە لاپەڕە ٢٥٩-٢٦١دا ئەم هۆنراوەیە هاتووە، ئەوەی مامۆستا قەرەداغی و ئەوەی کەشکۆڵەکەی نەجمەدین مەلا، جیاوازیی کەمیان هەیە و یەکێکن، لە ڕۆژنامەی (ژین)ی ژمارە (١٣١٥)ی (٤/١٠/١٩٥٦) لا(٦)دا، (١٠) خشتی لێ بڵاو کراوەتەوە. لە کتێبی "هەڵبژاردەیەك لە هۆنراوەی فۆلکلۆری کوردیی ناوچەی گەرمیان"ی مامۆستا ئیبراهیم باجەلان و هەردەوێڵ کاکەیی، لە لا (١١١)دا ئەم شیعرە هاتووە و (٢٢) بەیتە، لە کەشکۆڵی "حاجی میرزا موحەممەدی سەقەتی"دا کە نوسخەیەکی لای مامۆستا ئەنوەر سوڵتانییە. ئەوەی جێی مەبەست و داخە لە کۆی چوار نوسخەی دەستنووس، هیچکام لەو نوسخانە پارچەکەمان بۆ تەواو ناکات بێ هەڵە و کەم و کورتی. لە ڕۆژنامەی ژیندا (١٠) بەیتی لێ بڵاو کراوەتەوە، لە کەشکۆڵی سەقەتیدا (٢١) بەیتی لێ نووسیوە و لە کۆتاییدا نووسیویەتی "وەلسەلام". ئەم نوسخەیەش لە هەندێك جێگەدا جیاوازیی هەیە و پێویستە بخرێتە ڕوو، ئەوەی پێویستە باسی لێوە بکرێت لە پارچە شیعرەکەی لای مامۆستا (هـر و بـر)دا، لە شیعرەکەدا باسی خانەقین دەکات و تاکو دێتە دێڕی "دیل و بێ تاوان کۆنە ساڵانم... خەریك پابەند باجەلانانم". جگە لە جیاوازیی دەقەکە هیچ کێشەیەك ڕوو نادات، بەڵام لە دوای ئەم دێڕەوە جیاوازییەکی زۆر ڕوون دەردەکەوێت و وا لە شیعرەکە دەکات کە باس لە دڵداری بکات و یارەکەی بەجێی هێشتبێت و داوای لێ دەکات بە هێواشی بڕوات. لەم دواییانەشدا مامۆستا قەرەداغی لە بەرگی حەوتەمی کەشکۆڵی کەلەپووری ئەدەبی کوردییەکەیدا، لە کەشکۆڵەکانی مام ڕەشیدی هەمەوەندییەوە، دیسانەوە هەندێکی بە جیاوازیی زۆرەوە بڵاوکردۆتەوە و ئاماژەی پێ نەکردووە کە شیعری کێیە.

[1] ئەم دێڕە لای (بر و هر) بەم شێوەیە نووسراوە:

نە یار، نە یاوەر، نە قەوم، نە خوێشەن[٢]
کەس نمەزانان حاڵ من چێشەن[٣]
لە عاجز عاجز، جە پیران پیر بیم
سەر لە کۆتەڵان، پا لە زنجیر بیم[٤]
قوباد و قۆچاغ، قەدیمساڵان بیم
بابۆی بەگزادان کەمەرلاڵان بیم[٥]
میرزای خاتوونان، شۆخ شیرین بیم
کاکەی کناچان، زوڵف عەنبەرین بیم[٦]

---

وای شەماڵ ڕێشەن، وای شەماڵ ڕێشەن سفتەی داخ نە دڵ، مەینەتان ڕێشەن
لای (ژی): بای شەماڵ ڕێشەن، بای شەماڵ ڕێشەن سوفتەی دڵ وە داخ، مەینەتان ڕێشەن
لای (مح): بای شەماڵ ڕێشەن، بای شەماڵ ڕێشەن سفتەم دڵ بە داغ، مەینەتان ڕێشەن

[٢] لای (بر و هر): "خێشەن".

[٣] لای (بر و هر): "کەس نمەزانۆ دەردەکەم چێشەن".
لای (ژی): "کەس نەمەزانۆ حاڵی من چێشەن".
لای (مح): "کەس نمەزانۆ حاڵ و جەستەی من چێشەن".

[٤] لای (بر و هر): لە حاجی حاجی، لە پیران پیرم گەردەن گیر ڕەوق، پا چە زنجیرم.

[٥] لای (بر و هر): قوبا و قۆچاغ، قەدیم ساڵان بیم بابۆی بەگزادەی کەمەر لاڵان بیم
لای (ژی): قوباد قۆچاخ، قەدیم ساڵانم بابۆی بەگزادان، کەمەر لاڵانم
لای (مح): من قوباد قۆچاغ، قەدیم ساڵانم بابۆی بەگزادان، کەمەر لاڵانم

[٦] لای (بر و هر): وەکو نوسخەکەی بەردەستمانە.
لای (ژی): میرزای خاتوونان شۆخی شیرینم کاکەی کەناچان زوڵف عەنبەرینم
لای (مح): میرزای خاتوونان، شۆخ و شیرینم کاکە کناچان، زوڵف عەنبەرینم

سـاحێب ئۆتـاق، ئـەقرەبا و پـشتم
دەسـتگیر دەسـتدار، بەگلـەران گـشتم[٧]
عێـل بـەگی و ڕەشـید، مـیر جافـانم
پـەروەردەی سـای چـین، زولّـف کلاّفـانم[٨]
بـەور بـالاّدەس، بـان شـێرانم
نامیـدەی ولاّت ڕۆم و ئێـرانم[٩]
قـۆچ سـەر نـە پـێچ، وایـەی هـەیهاتم
شـێر سەفـشکێن، کـۆی زۆر و زاتم[١٠]

---

[٧] لای (بر و هر): ساحێب ئەوتـاق، ئەقرەوا پشت بیم ساحێب دام دەسگای بەگلەران گشت بیم
ئەم دێرە لێرەدا پاش و پێش کەوتووە.
لای (ژی): سـاحێب ئـۆتاخ و ئـەقرەبـا و پشتم دەستداری دەستگـیر بەگلـەران گشتم
لای (مح): سـاحێب ئۆتـاق، ئەقرەبـا و پشتم زەڕدار زەڕگـیر، بەگلـەران گشتم
[٨] لای (بر و هر) ئەم دێرە نییە.
لای (ژی): ئێل بـەگی ڕەشید میری جـافانم پـەرگـەندەی سای چین زولّف کەلاّفانم
لای (مح): عێل بەگی ڕەشید، میر جـافـانم پەروەردەی سای چین، زولّف کلاّفـانم
[٩] لای (بر و هر): ئەم دێرە نییە.
لای (ژی): بـەوری بـالاّ دەست بـان شـێرانم نـامـداری ولاّت ڕۆم و ئێرانم
لای (مح): بـەبر بـالاّ دەست، بـان شێرانم نـامییـەن ولاّت، ڕۆم و ئێرانم
[١٠] لای (بر و هر): قۆچ سەر نەپێلّ، ڕۆژ هەیهات بیم شێر سەف شکێن، کۆی زۆر و زات بیم
لای (ژی): قـۆچ سـەر نـەپێچ ڕۆژی هایهاتم شێری سـەف شکەن کۆی زۆر و زاتم
ئەم دێرە لێرەدا دواکەوتووە.
لای (مح): کـۆچ سـەر نە پێچ، وات هـەیهاتم شێر سەر شکێن، کـۆی زۆر و زاتم

دارای دەمـــــاغ بــــەرز کـــــەرەم کـــــوڵاوم
ئوســـــتادان جـــــە تـــــەرح، جـــــۆی ســـــێلاتاوم[11]
تەکیـــــەی ڕاهـــــداران، شـــــای ســـــەماواتم
دەفتـــــەردار موڵـــــك ســـــەرجۆی کـــــاواتم[12]
بـــــاش بـــــالادەس پەهلـــــەوانانم
قـــــەڵغان لای شـــــان نەوجـــــەوانانم[13]
تـــــورك تیرئەنـــــداز، شـــــیرین ســـــوارم
تـــــەورزین بـــــە دۆش ڕووی نۆهـــــەوارم[14]
بـــــەهار پـــــای ئـــــێلاخ جـــــە کوردەمـــــاڵ بـــــیم
جـــــە پـــــای ســـــەراوان چـــــەشمەی زوڵاڵ بـــــیم[15]

---

[11] لای (بر و هر): ئەم دێرە نییە.
لای (ژی): دارای دەمـــاخ بـــەرز، کـــەرەم کـــوڵاوم          چون حـــاتـــەمی تـــەی، هیمەت سێڵاوم
لای (مح): دارای دەماغ بەرز، کورم و کـــــوڵاوم          ئێستاهان چە تەرح، جۆی سێڵە تـــاوم
[12] لای (بر و هر): ئەم دێرە نییە.
لای (ژی): ئەم دێرە نییە.
لای (مح): تەکییە ڕابیان، ڕەشای سەمـــــاواتم          دەفتەردار بەدەست، سیڕجۆی کابـــــاتم
[13] لای (بر و هر): ئەم دێرە نییە.
لای (ژی): بـــاش بـــالادەست پـــــەهلەوانانم          قـــــەڵخانی لای شان نـــەوجـــەوانانم
لێرە بەدواوە لە پارچەکەی ڕۆژنامەی ژین تەواو دەبێت.
لای (مح): بان بالادست، من پـــاڵەوانـــــانم          قەڵغـان لای شـــــان نەوجوانـــانم
[14] لای (مح): جـــەمیدان چـــایك، شیرین سـوارم          تـــــەبر زین، بـــەدەست، ڕۆین هەوارم
لای (مع) بە "تورك" نووسراوە، مامۆستا زەحمەتکێش دەڵێت: "تەرك" دروستە، دەبێ هەر تورك بێت، چونکە تیرئەنداز لەگەڵ توركدا دەگونجێت نەك لەگەڵ تەركدا.
[15] لای (مح): هاوین جە لەیلاغ، جەو کەرد دەماڵم          جە پای گـــــوڵاوان، چـەشمەی زوڵاڵم

قوباد قۆچاغ[١٦] کۆی نەوسوارم
تەرح جەبڵەکێش باغچە و حەسارم[١٧]
سوڵتان هاروون، میر سەریاسم[١٨]
ساحێب ناواك، تیغ ئەڵماسم[١٩]
میر سەرحەدگیر لای خان ئاشوورم[٢٠]
لە تەعنەی بەدان یانە خاپوورم[٢١]
ئیستا من دەستاخ کۆتەڵ پاونانم[٢٢]
بێ جەد خاین باجەلآنانم[٢٣]

---

بەڵام لای (مع) نووسراوە: "لەیلاخ"، دەبێ "ئێلاخ" بێت.

[١٦] لێرەدا دوو مانای هەیە: یەکەمیان: ناوی باوکی خانای قوبادییە، دووەمیان: ناوی کەسێکی قوبادیی دلێرە، مەبەست لە خانای قوبادی خۆیەتی، واتە: خانای قوبادی کەسێکە لە تیرەی قوبادیی جافی جوانرۆ و چالاك و دلێرە.

[١٧] ئەم دێرە لای (مح) نییە.

[١٨] سەریاس: سەرکێو، گوندێکە لای هەورامان.

[١٩] لای (مح): سوڵتان هاروون، میر سەریاسم ساحێب (نەبات!) و تیغ و ئەڵماسم

[٢٠] خان ئاشوور: ناوچەیەکە لە لای سەریاس و باوەجانییەکان و ئێستا ناوی خانە شوورە، دەکرێ ئەم ناوچەیە لەو دەمەدا یان کۆنتر خانێکی هەبووبێ بە ناوی خان ئاشوور.

[٢١] لای (مح): میر سەرحەدگیر، لای خان ئاشوورم بەیاتی بەیان، یانە خاپوورم

[٢٢] پاوەنانم:، ئەم وشەیە لە مەتنەکەدا "پاوەنانانم" بوو، وەزنی شیعرەکەی تێك دابوو، من کردم بە "پاونانم"، دەکرێ "باوەجان"میش بێت، وەکو ئاشکرایە تیرەی باوەجانی تیرەیەکە لە هۆزی جافی جوانرۆ، "پاوەنان" واتای زنجیری "دەست و پێ"یش دەگرێتەوە، وەکو ئەوەی کە خانا لای باجەلآنەکان بەند کراوە و زنجیر کراوەتە دەست و پێی.

[٢٣] لای (مح): جە تاغ پاوەند، کۆتەلآتانم بێ جییەت و خاین باجەلآنانم

بـــه ڕۆژ بێخـــورد و بـــه شـــەو بێخـــاوم
دیـــل بێتـــاوان، پاشـــای زەهـــاوم[٢٤]
ئوفتـــادە و زەبـــوون، خاترپەشـــێوم
تەشـــنە و زوبـــان لاڵ، شـــەو بـــار بـــە لێـــوم[٢٥]
نـــەوەی ئـــەمیرخان،[٢٦] بەچـــەی بێبـــاکم
بـــێ فـــەرش، بـــێ بـــاڵین، ئوفتـــادەی خـــاکم[٢٧]
ئیـــستا ڕووگـــەردان قـــاپیی مـــورادم[٢٨]
ئەبلـــەی مایـــەپوچ خزمـــەت وە بـــادم[٢٩]
ئـــەی بـــادی شـــەماڵ یـــە جەســـتە و حاڵـــە
یـــە گۆنـــای پەڕگـــەرد، زەردی جەماڵـــە

[٢٤] لای (مح): بـــە ڕۆژ بێ خوێش و بێ خـەواوم دیل دەست بـــەستراو، پادشـــای زەهاوم
لە دوای ئەم دێرەوە، ئەم دێرە هەیە و لە هیچ سەرچاوەیەکی پێشووتردا نییە:
کەلای گۆڕ غەریب، بەرزە بالاّم مەردە بێ یاسین، دیدەن یارانم
لای (بر و هر): دیل و بێ تاوان، کۆنە سالاّم خەریك پابەند، باجەلاّتانم
[٢٥] لای (مح): تۆلای خوێشـــان، ئـــاوارەی تۆنم ئەوەڵ خاتر شـــاد، ئـــاخر زەبوونم
[٢٦] ئەمیر خان: بەپێی ئەم دەقە شیعرییە باپیرەی خانای قوبادییە.
[٢٧] ئەم دێرە لای (مح) نییە.
[٢٨] مامۆستا (مع) دەڵێت: ڕەنگە "ئێستا" زیاد بێ، بەلاّم وەك خۆی نووسیم، وشەی "ئێستا" دەگەڕێتەوە بـۆ ئـەو کاتەی خانا لە بەندیخانەدا هۆنراوەکـەی نووسـیوە، ئەگەرچـی برگـە شـیعرییەکە لێـرەدا زۆر زیـادە، مـن وشـەی "قەسر"م لابرد و کێش و برگەکە بەم شێوەیە ڕێك دەبێتەوە.
[٢٩] لای (مح): ئەبلـــەی مایـە پووچ، خدمەت وە بادم ڕووگەردان چەو، قەسر قـاپی مورادم
لێرە بەدواوە هۆنراوەکەی کەشکۆڵی حاجی میرزا موحەممەدی سەقەتییش تەواو دەبێت، ئەگەرچی لـەم کەشـکۆڵەی (مح)دا هەندێك لە دێرەکان بەر و دوایان پێ کراوە و جیاوازیی وشەیش بـەدی دەکرێـت، بـەلاّم جێگـای بایـەخ و تاوڕلێدانەوەیە.

یە لاشەی زەبوون بێنازکەفتەی من
جە نالە کۆسار شەو نەسرەفتەی من
یە جامەی جیاز دوڕ نەو کافوورە[30]
یە گلکۆی مەزار گەدا دەسوورە
یە کەلوەلای[31] زام، زولم سالانە
یە عەیش و واوەیلای میرە مالانە؟
نە شەرم، نە سیرەت، نە زولف، نە خالە
یە پەردەی ڕەنگین، تەختەی ڕەشمالە
یە کار گەردوون بینای کارانە
بەگزادان سەرکز، سای تالارانە
ئەی بادی شەمال فرە زەلیلم!
وێنەی عارەبان، بە تۆ دەخیلم

---

[30] ئەم تاکە لەنگە.

[31] کەلوەلا: کەربەلا، یەکێکە لە پارێزگاکانی عێراق، ڕەنگە مەبەستی "کەلوەلا"ی، کەوتەکار بێت یان ماندووبوون، شەکەتبوون، لەتلەتبوونی جەستە و ڕۆح، ئەم دێرە دوو مەبەست دەدات بە دەستەوە:

یەکەمیان: خانا خۆی چواندووە بە ئیمامی حوسێن کە لە دەشتی کەربەلادا تووشی ئەو ئاژاوە گێرییە بووە و شەهید بووە.

دووەمیان: مەبەستی لە خۆیەتی کە جەستەی زامدار بووە بە هۆی ئەشکەنجەدانەوە، وەکو خۆی دەڵێت: ئەمە زامێکی کۆنە و ئێستا سەری هەڵداوەتەوە، قینەکەی بە من دەڕێژن، ئەمەش هۆکارەکەی دەگەڕێتەوە بۆماڵی میرەکان.

عــــەرزەی جەســــتە و حــــاڵ ئێمـــــە و ئەســــیران
بـــــەرە پــــەی ئۆتــــــاق، بـــــەگزادەی مـــــیران
گلـــــــەیی و شــــــکات، فـــــــرە و ناپیــــــاو[٣٢]
شــــەرع مــــــن و تــــــۆ، مەقـــــسوودی زەهـــــاو
ماجــــــــەرای پیریـــــــم، ســـــــکەی ســــــپیدیم
مــــــەعلووم بــــــی جـــــەلای خانــــەی ڕەشــــیدیم
باچــــە نــــەو تــــووڵ نــــەمامان، نــــاوەران زامـــــان[٣٣]
بەوانــــــدەی گریـــــان، تــــــەڕ بکـــــەن دامــــــان
نــــە چـــــنان بـــــە شــــاد، نەنیـــــشن بێغـــــەم
نــــەمالآن ســــــورمەی ســـــێوەنگی لـــــە چـــــەم
پـــــــەلاس قــــــەتران بـــــــشان وە گــــــەردەن
بـــــەو شــــــەرت بواچــــان: کاکــــــەش نەمــــــەردەن
باچــــە بـــــەو جـــــاهیلان قــــەوم و قارداشـــــم[٣٤]
ئــــەو چاپوکــــــسوار، لــــــە مەیـــــدان باشــــم
ئەمانـــــــەت فــــــەرز بــــــۆ، فەســـــڵ بــــــەهاران
ئــــەر مەچـــــن بــــە ســـــەیر قــــەدیم هــــەواران
هــــەر لــــە گەرمەســــێر، تــــا بــــان لـــــەیلاخ بــــێ
هــــەر لــــە ڕووی کۆهـــــسار، هــــەرتا بۆبـــــاغ بــــێ

[٣٢] ئەم تاکە لەنگە.
[٣٣] ئەم نیـو خشتەیەش هەر لەنگە و بە ناچاری وەك خۆی هێشتمەوە.
[٣٤] ئەم نیوەبەیتە لەنگە.

هەر جە ڕووی خاکەن، هەر جە تۆی غارە
فراوان بەکار، دەسگام دیارە
چەندێ دەستکەرد من، مەندەن لە جێدا
یاران با بەیان، بگرەوان پێدا
چەندێ کەرامات عەجایب کەردەم
یاران سەڵامەت، ئەوا من مەردەم

## عەبدوڵڵا تەرزەن*

عەبدوڵڵا تەرزەن، عەبدوڵڵا تەرزەن
ڕاستەن خان بەور کەیانی تەرزەن
خاستەر جە ئەولاد گیو و گوودەرزەن
سەد پایە پایەش، جە خانان بەرزەن
نوتفەی سەفی خان کەیخوسرەو وێنە
ساحێب ئەسباب و گەنج و خەزێنە
سەد گەدای چون من، موفلیس بێبەش
کەردەن بە ساحێب بەفتان و مەفرەش
بەڵێ، هەی سەڕاف، ساحێب خەزێنە!
دانای دوڕشکاف، نیزامی وێنە
کەسێ چێش کەرۆ، من شوومستارەم
من نەحس بەدبەخت، میحنەتی چارەم

---

* ئەم هۆنراوەیەم لە کاك غەفار ئیبراهیمی سارۆ وەرگرتووە، ئەویش لە مامۆستا مەلا محێدینی ساڵحیی وەرگرتووە. هۆنراوەکە لە سەرەتاوە لێی نووسراوە "خانا"، بەڵام لە کۆتاییەوە ناوی خانا نەهاتووە. ئەگەر وەها بێت، ئەم هۆنراوەیە یەکێکی ترە لەو هۆنراوە دەگمەنانەی کە پاڵپشتیی هەندێك لە قسەکانی ئامادەکار دەکات. بەڵام سەرسووڕمان لەوەدایە کە خانا لەم هۆنراوەیەدا زۆر تەنازول دەکات و داوای یارمەتی دەکات، پێچەوانەی هۆنراوەی "بای شەماڵ ڕێشەن"ە، چونکە لەو هۆنراوەیەدا خانا زۆر باسی موڵك و سامان و نەتەوە و پشتی دەکات، هۆنراوەکەش بێ لایەنگری، زۆر لە هۆنراوەی خانا دەچێت.

ئەم عەبدوڵڵا ناوەش دەڵێن: عەبدوڵڵای کوڕی سەفی خانی جوانڕۆیە، ناوچەیەکی بچووکی لە ژێر دەسەڵاتدا بووە، وەکو لە هۆنراوەکەشدا هاتووە ناوی عەبدوڵڵا و ناوی باوکیشی دەهێنێت، جگە لەوەش باسی دەستەڵات و موڵك و ماڵی عەبدوڵڵا خان دەکات کە پیاوێکی دەوڵەمەند بووە و خانا عەقڵ و هۆشی کار و کاسبیی نەبووە.

عــــەقڵ مەعیــــشەت خــــودا نــــەدا پـــێم
وێــم نائومێــد کــەرد ، مــن بــە دەســت وێــم
وەرنـــــە خــــان بــــەور ، حاتـــــەم دەســـــتوورەن
خزمـــــەت ســــاڵان، جـــــە لاش مــــەنزوورەن
هــــەرگیز نمـــازۆ چـــون مــــن غـــولامێ
خاقـــانی نــــەزمێ، نیزامــــی فــــامێ
جــە ئاســـتانەی* عـــالیش، ڕەنجـــم بێبــەر بــۆ
بــە جەســـتەی مـــەجنوون تـــوونم نــەوەر بــۆ

* لێرەدا دەبێ بە "جە ستانە، یان جا ستانە" بخوێنرێتەوە.

## دەلیل داخی من*

دەلیل داخی مـــــن، دەلیل داخی مـــــن
بزانـــــە بـــــە حـال دەرد و داخی من
دلگـــــیری سزای بـــــەیداخی من
بشۆ وە پـــاتەخت، قیبلەی یـاخی من
.........![1] شابـــــال شـــازادەی پەریی
وەسەن وەس! تـــاکەی ئی یاخی گەریی؟
ئەر مەکـــەری سولح جـە ڕای دۆستداری
جەی یـــاخیگەری، دەست هۆر مەداری
.....................م![2] بـــــەژن و بـــالات
........![3] شەرەنگ خـــــالان ئـــالات

* ئەم هۆنراوەیەم لە کتێبی "بووژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد لە ڕێگەی دەستخەکانیانەوە"، محەمەد عەلی قەرەداغی، بەرگی چوارەم، چاپی یەکەم، (٢٠٠٢)، لاپەڕە (٣٢٢-٣٢٥)) وەرگرتووە، لە سەر ئەم هۆنراوەیە نووسراوە (من کلام محمد خان قبادی).

[1] ئەم وشەیە بۆ مامۆستا نەخوێنراوەتەوە.

[2] ئەم جێگایەشی بۆ نەخوێنراوەتەوە.

[3] هەروەها ئەم شوێنەیشی بۆ نەخوێنراوەتەوە.

## شەویۚ وەخت ڕۆ*

شـــــــەویۚ وەخت ڕۆ، شـــــــەویۚ وەخت ڕۆ
شەویۚ پـــــەی تــــــەقدیر وادەی وەخت ڕۆ
جـــــە گوڵ بـــــــاخچەی ئاڵای عەنبەربۆ
بین بـــــــە دووچارم، دوو شەخس شــــەڕجۆ
هــەر چێکە من دین لـــــەب بە قین گەستەن
پـــــەی کوشتەم دەرلاد هەردوو بەین بەستەن
جـــــــە هیچ کامشان ڕای ئـــامان نەدیم
بـــــــاوەکوشتەشـــــان چمان هەر من بیم
هورێزا بـــــە خەشم دەست بــــــە نەیەوە
ئەو دەست بـــــە قەبزەی قەوس وەیـــــەوە
زانـــــــام خەرابـــــــەن چــەنیم قەستشان
ئـامـــــام بوگرێزۆن من جـــــــە دەستشان
نــــــــەی بـــــە دەست قایم گیرم دا بە نەی
تاکە قەوس بە مشت نە قەوس پەڕ پـــــەی
تەییار کەرد خەدەنگ من ناڵام جە تـــــەرس
واتم: هەی سەرمەست هیچ هەواڵ نـــــەپەرس!

* هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (٣٢٢-٣٢٥). لە سەر ئەم هۆنراوەیەش نووسراوە "قازی خانا".

مەر یـــــە وەس نییەن عـارەب تـــــەی[1]
ڕەفیقت گرتەن بەی تـــــەور من بـــــە نەی
فیدای بـــــالآت بـــــام، سەوزەی کەماندار
هیچ زەروور نییـــــەن بکێشی ئـــــازار
من نێچیر موفت ئـــــــــەی دیدە مەستم
من کوشتەی سینان ئەی نەی بـــــە دەستم
تاکە ئێد شنەفت ئـــــــەو کلاف موشکین
خرابتەر چە خەشم شی نـــــــە جـامەی قین
نەخشی پڕ موشکین ڕەها کەرد جـــە شەست
مەودای خەدەنگش ڕیشەی جـــەرگم گەست
سست بیم دەر ساعەت جـــە سەر شی هۆشم
ئاما بـــــە تـــاجیل قـــــایم گرت گۆشم
کێشا وات: نــــــە نـە، قوڕمساخ **خانای**
من جـــە نـــەی بە دەست، بەڵ کەمتەر زانای
سا بـــــا بـــــەی تەورە شووم هەرزە گۆ
.................![2] تیرەوە لقــە فرێت بـــــۆ!

---

[1] ئەم نیوەبەیتە لەنگە.

[2] ئەم جێگایە بۆ مامۆستا قەرەداغی نەخوێنراوەتەوە.

## نەوسوەیل دەستوور*

نـــەوسوەیل دەستوور، نـــەوسوەیل دەستوور
خێزا ژە چەمـــــەن، شاهـــــان دەستوور
خاستەر ژە[1] خێمەی خاقـــــان و فەغفوور
ئـــاوەرد ژە چەمـــەن، توورەی زەرد و سوور
............................![2] ئالآی زەمـــەق ئارا
.................................![3] داران بـــە دارا
.....................................................
.....................................................[4]
درەختـــــان ژە دوور نـــمـانـــــــا وە زەوق
چەمەن کیم خای گوڵ، خارای زەرتەبەق[5]

* ئەم شیعرەم لەو دەستنووسەدا وەرگرتووە کە لەسەر شیعرەکەی خانا نووسراوە: "موحەممەد خان قوبادی". لە جێگەیەکدا لەسەری نووسراوە: "شێخ موحەممەدی کوڕی شێخ مەحموود". یەکێکە لە دەستخەتەکانی کتێبخانەی بەرلین. بەداخەوە لەبەر ئەوەی ئەم دەستنووسە تەڕ بووە، بەشێك لە بەیتەکان ڕەش بوونەتەوە و بە باشی ناخوێنرێنەوە.

[1] ئەم هۆنراوەیە کە بۆ یەکەمین جارە بڵاو دەبێتەوە و لەناو تەواوی شیعرەکانی خانای قوبادییشدا وشەی "ژە" نابینرێت. خانا زیاتر "جە، بە، نە"ی بەکار بردووە. دیارە کە دەستکاریی شیعرەکە کراوە.

[2] لە دەستنووسەکەدا ڕەش بۆتەوە و ناخوێنرێتەوە.

[3] ئەم جێگایەش ڕەش بۆتەوە و ناخوێنرێتەوە.

[4] ئەم بەیتە لە دەستنووسەکەدا ڕەش بۆتەوە و ناخوێنرێتەوە.

قـــەترەی قرمزی بـــــە پەنجە سێوەنگ
سەند نـــە ڕووی خەزان عـــەزیز .........![6]
........![7] چون شاپوور ئوستاد تـــەڕدەست
..........![8] خەزان نـــەخش خوونی بەست
دەست بـــە ڕەنگ ئاڵ ئاڵای عەجەب بەرد
ئــــــەفشانی دیبای وەڵگ مێوان کەرد
کێشا نـــــــە ڕووی فەرق نەمامان تەڕ
فەڕ بـــافی تـــافتەی توکمەی تەرز زەڕ
بـــــە کاڵای پـــەڕ نەخش نارنجی خەزان
چون نۆ عەرووسان ڕەنگین کـــەرد ڕەزان
چەند تۆپ پارچەی ئـــاڵای مەخمەڵ تەرز
بڕیی بـــــە بـــاڵای درەختان بـــەرز
فەڕڕووست نە چەمەن خواجەی یەمەن شار
چـــەنی ڕەنگ سوور قرمزی گوڵنـــــار

---

[5] ئەم بەیتە لە ڕووی قافییەوە ناتەواوە.
[6] ئەم وشەیەیش لە دەستنووسەکەدا ناخوێنرێتەوە.
[7] ئەم وشەیەیش ڕەش بووەتەوە و ناخوێنرێتەوە.
[8] ئەم وشەیەیش ڕەش بووەتەوە و ناخوێنرێتەوە.

.................................ی! لــەیل بۆ[٩]

..... ڕای .......................! سوەیل بۆ[١٠]

ببۆ بـــــە دڵواز، سەرگـــــەرد ڕازان

بپکیۆ وە ســـــەر مەخمەڵی خـــــەزان

.........................![١١] من سیاپۆش خـــەم

.................................................![١٢]

بێزار جـــــە خــــەزان، نـارنجی بەڕ بۆ

دامان بـــــە ئەسرین هوون دڵتـــــەڕ بۆ

---

[٩] ئەم نیوەبەیتە هەر ئەوەندەی دەخوێنرێتەوە.

[١٠] ئەم نیوەبەیتەیش هەر ئەوەندەی دەخوێنرێتەوە.

[١١] ئەم چەند وشەیەش لێرەدا ناخوێنرێتەوە.

[١٢] ئەم نیوەبەیتەیش لێرەدا ناخوێنرێتەوە.

## هەر من خەمبارم*

هەر من خەمبـــارم، هەر من خەمبـــارم
هەر من! بـــەخت شووم، خەمبـارم[١]
هەر من خـــەم سوزان دڵ بێقـــەرارم
هەر مـــن پێکایی ڕەند قـــەتـــارم
هەر مـــن شووم تـالع، زوحێڵ ستارەم
هەر من هیجرانبـــار جـــە زێد ئاوارەم
هەر من سیابـــەرگ قـەڵاخی پۆشام
هەر من جـــە ئـــەزەل زوخاوان نۆشام
هەر من دووی سیام، جـــە دڵ مەخێزۆ
هەر من ڕوخســارم خـــەزان مەبێزۆ
هەر من دەربەدەر، هیجران بـــارەنـــان
هەر من زەدەی زام نـــادیـــارەنـــان

---

* ئەم شیعرەم لە دەستنووسی شێخ موحەممەدی کوڕی شێخ مەحموود وەرگرتووە، یەکێکە لە دەستخەتەکانی کتێبخانەی بەرلین. ئەم هۆنراوەیە ناوی کەسی لەسەر نەنووسراوە، بەڵام لە کۆتاییەوە ناوی "خانا" هاتووە. لەبەر ئەوەی لە دوو لاپەڕەدا نووسراوە و دوو بەیتی کۆتایی لە لاپەڕەی دووەمدا هاتووە و ناوی خانای تێدایە، بە گومانەوە بە شیعری خانامان زانی. تا دەرکەوتنی نوسخەی تر و زانیاریی تر لەبارەی ئەم هۆنراوەیەوە، بە ناوی خانای قوبادییەوە بڵاوی دەکەینەوە. لە دیوانی خاڵۆی کۆماسی لاپەڕە (٢٦٣)ی حەکیم مەلا ساڵحدا، هۆنراوەیەك هەیە نزیکە لەم هۆنراوەیە و مامۆستایش گومانی لەو شیعرە هەیە کە هی ئەحمەد بەگی کۆماسی بێت. ئەم هۆنراوەیە و ئەوەی خاڵۆی کۆماسییش جیاوازییان تێدایە و لەسەر هەمان ئاواز و مۆسیقای شیعرین.

[١] ئەم نیوەبەیتە لەنگە.

هەر من داخ نـــــە دڵ، وێنەی مەجنوونم
هەر من پەی لـــەیلێ، ئـــــاوارەی توونم
هەر من خـــەم خـــەڵات، خەم بەراتمەن
هەر من کاراتـــەی ڕای نـــــــەهاتمەن
هەر من وێنەی شێخ، ســـەنعان دەستوورم
هەر من زوننار پێچ، جـە مـەزهەب دوورم
هەر من دڵ بـــــە تێغ هیجران پـــارە بیم
هەر من ســـــەرەشووم سیاچـــــــارە بیم
وەرنە یا مەردم، بە جـەستەی فـــــەرهاد
قیبلەم سەلامەت، عومرم شی وە بـــــاد
یە **خانا** واتـــەن، خـــاتر نــــاشادەن
نـــائومێد جـــــە دین، دیدەی بەگزادەن

## خانا و مەحرووومی

**خانا:**

خەنـدەگ غـەمزەی وەنەوشـەخاڵان
حەربـەی نـیم نیگـای نـازك نـەوهاڵان
ئـەر بگنـۆ وە سـەنگ کـۆی سـەخت خـارا
مەکـەرۆش وە گـەرد بـەبێ مـودارا

**مەحرووم:**

مـەخموری دیـدەی قـەترانی خـاڵان
نـیم نیگـای مـوژەی گـەردن غـەزاڵان
ئـەر بگنـۆ وە هـەرد قوڵلـەی کـۆی پـەڕاو
وەزات موتڵـەق مەکـەرۆش بـە ئـاو

※ ※ ※ ※

زڕەی زریـزەی یـاز و خرخـاڵان[1]
پەشـێوی شـێوەی پەشـێو دەسمـاڵان
ئـەر بگنـۆ وە نەجـد قوڵلـەی پەڕخەتـەر
مەکـەرۆش وە تـۆز، بـاد بـەردەی سـەحەر

[1] لە دەستنووسێك کە لای مامۆستا موحەممەد عەلی قەرەداغی بوو، ئەم هۆنراوانە هاتوون. لەسەر هۆنراوەی یەکەم نووسراوە "خاناى قوبادى"، لەسەر وەڵامەکەیشی نووسراوە (محروم در). دواتر ئەم دوو بەیتەش لە دوایەوە هاتووە و لەسەری نووسراوە (ولە). دوابەدوای ئەمەش دوو بەیتی تری خانا هاتووە کە بە "بەرق سەیف" دەست پێ دەکات و لەسەری نووسراوە (ولە در). دوای ئەمەش دوو بەیتی تری هاتووە و بەم شێوەیە دەست پێ دەکات: "زەڕەیێ جە زوخاو" لە سەر ئەمەش نووسراوە (ولە در).

## خانای قوبادی و مەحروومی و هەڵسەنگاندنی مەولەوی

**خانا:**

بــــەرق ســــەیف نـــاز ئـــەبرۆ خـــەمینان
عـــەكس مـــاوی خـــاڵ خورشـــید جـــەمینان
ئـــەر بگنـــۆ وە كـــۆی قوللـــەی قەزاڵـــە
مەكـــەرۆش وە بـــووڵ ســـفتەی ســـەد ساڵە

**مەحرووم:**

بـــەرق، بەرقـــەی نـــاز عیـــشوە فرۆشـــان
چـــەخماخەی لەنجـــەی تـــەلا نەگۆشـــان
بزیـــسكەی نیگـــای دیـــدە شـــابازان
بریقـــەی غـــەمزەی شـــەكەرین ڕازان
ئـەر بگنـۆ وە ســەنگ جـای تەجـەللای نـوور
مەكـەرۆش وە گـەرد چـون سـورمەی كـۆی تـوور
مەعـدووم ڕاس خانــا ســۆزان عەشــق بــی
كەی وێنەی مەحرووم هەر عەشـقش مەشـق بـی؟[1]

---

[1] ئەم نیوەبەیتە لەنگە.

**هەڵسەنگاندنی مەولەوی:**

نــــــەوباوەی خــــــەیاڵ مــــــەحرووم دانــــــا
ڕەدیـــــــف لـــــــەتیف زەریـــــــف **خانــــــا**
یــــــاوا، وە دیــــــدەی کــــــەمبینام ســــــاوا
جــــە نــــەو بینــــایی پــــەی دیــــدەم یــــاوا
پــــەیڕەوی **خانــــات** یــــاد ئــــاوەردە بــــێ
ئــەو ئەســڵ و وێــت فــەرع حەســاو کــەردە بــێ
لاکـــــین زادەی تـــــەبع بـــــۆ عەنبـــــەرینت
دەسڕێـــــسەکەی فیکـــــر بیکـــــر شـــــیرینت
پەســـــەندیدەی فـــــام عـــــەقڵ دانـــــا بـــــی
خاســـتەر جـــە خـــەیاڵ خاســـەی **خانـــا** بـــی
زیـــــادە پـــــەی فـــــەرع وە ســـــەر ئەســـــڵەدا
خاســـەی واتـــەی تـــۆن جـــەی سەرفەســـڵەدا

# بەشی عەرەبی

## عزیز الغفار*

عَزيــــــزُ الغَفّـــــار، عَزيــــــزُ الغَفّـــــار![1]
يـــــا عَظـــــيم العَفـــــو عَزيــــــزُ الغَفّـــــار!
(ســـاحێب نـــــەفخ ســـوور)، في يَـــوم القَـــرار[2]
واحُــــــــشرني مَـــــعَ النَبــــــيّ المُختـــــــار
في يَــــــومٍ كالمُهْـــــــل، طَعـــــامٌ أثـــــيمْ
يُلقــــــي في البطـــــون، كَغَلــــي الحَمـــــيم[3]
(شـــادم جـــــە واتـــــەی بینـــــای بێنــــەزیــــر)
بِمَغفِـــــــــرةِ وأجُـــــــــرٍ كَـــــــــبير[4]

---

* ئەم شیعرەم لە کتێبی "کەشکۆڵی کەلەپووری ئەدەبی کوردی"ی موحەممەد عەلی قەرەداغی، بەرگی چوارەم، لا (۳۹) وەرگرتووە. هەروەها چەند دەستنووس و چاپکراوی تریش لە بەردەستماندا بوون، سوودمان لە چەند سەرچاوەیەکیان وەرگرتووە و ئەو هۆنراوەیەی سەرەوەمان لێ پێك هێناوە.

[1] ئاماژەیە بۆ ئەم ئایەتانە، (الزمر-٥ و ٦٦)، (الغافر- ٤٢)، بەشی دووەمیش، دوو نـاون لـە ناوەکـانی خـودای گەورە.

[2] ئاماژەیە بۆ ئایەتی (۲۰) لە سوورەتی (ق)، لەم چەند سوورەتانەشدا هـاتووە، (النبـاء- ۱۸)، (الحاقـة- ۱۳)، بەڵام زیاتر بۆ ئایەتی (۲۰) لە سـوورەتی (ق) دەگونجێت.

[3] دەکرێ ئەم دێرە ئایەت بێت و تێك درابێت، ئەم دوو ئایەتـە لـە سـوورەتی (الـدخان)دا بـەم شـێوەیە هـاتوون: ﴿کالمهل یغلي في البطون(٤٥) کغلي الحمیم(٤٦)﴾.

[4] بەشێکە لە کۆتاییی ئایەتی (۱۱)ی سوورەتی (یس).

(مـــاوەرەم نـــە سـلك زومــرەی) مُـشرِكون[٥]
ضَــلّ عَــنهُم مــا كــانوا يَــدّعون[٦]
ولا تَكتُـــبني كَمَـــن، يـــا رَحـــيم!
يَحـــلّ عَليـــهِ عَــذابٌ عَظـــيم
(عـەفووم كـەر بـە لوتـف جـە كـەردەی گونـاه)
يَـــومَ لا مَـــرَدّ لَـــهُ مِـــنَ الله[٧]
يـــا عَمـــيم اللطُـــف، كَـــثير الاحـــسان!
اعـــوذُ بِـــكَ مِـــنَ شَـــرّ شـــيطان
(بـــە ويفـــق بورهـــان، ســـەعادەت عـــەميم)
وَيـــلٌ لِكُـــلِ أفّـــاكُ أثـــيم[٨]
(وە نـــائيرەی وەيـــل بـــدەريم نـــەجات)
اُرزُقـــني بالفَـــضلِ مِـــنَ الطّيبـــات
وَلا تَأسَـــــني أنـــــتَ يـــا غَفّـــار
في الحَـــشرِ "كَمـــا يَيـــئسُ الكُفّـــار"[٩]

---

[٥] ئاماژەیە بۆ ئەم ئایەتانە، (الأنعام-١٢١)، (التوبة-٢٨ و ٣٣)، (یوسف-١٠٦)، النحل-١٠٠)، (الصف-٩).

[٦] سەرەتای ئایەتی (٤٨)ی سوورەتی (فصلت)ە.

[٧] ئەم تاکە لەم دوو ئایەتەدا هاتووە: (الروم- ٤٣) و (الشوری- ٤٧).

[٨] ئایەتی (٧)ە لە سوورەتی (الجاثیة).

[٩] بەشێکە لە ئایەتی قورئان و خانا لە لایەنەکانی جوانکاری (تێهەڵکێش)دا بەکاری هێناوە.

(ئـــەورۆ نـــە جەننـــەت، زومـــرەی مـــوئمینین)
يَتَـــــــسألون عَـــــــنِ المُجـــــــرمين[١٠]
قـــالُوا لَـــم نَـــكُ مِـــنَ المُـــصَلّين[١١]
كُنـــا نَخوضـــوا مَـــعَ الخائِـــضين[١٢]
إدْفَـــعْ، يـــا رَحـــيم! كُـــلّ بَلائـــي
واغفِرْنـــي بـــالعَفو، كُـــلّ خَطـــائي
(جـــەو دەمـــدا)، ظـــنّ انَـــهُ الفِـــرَاق[١٣]
والتَفَـتِ الـساقْ، (جـه هەيبـەت) بالـساق[١٤]
(بـــه كـــەرەمیی وێـــت، كیبریـــای ئەقـــدەس!
مـــن كـــە فـــەقیرم، بـــەفریادم ڕەس
جـــە ڕای مەحەببـــەت، دڵنـــەوازیم كـــەر)
مَاسَـــلَكَكُم (ماچـــان): في الـــسّقَرَ[١٥]
يـــا كـــثير اللطـــف، شـــديد العقـــاب!
(جـــەو ڕۆ كـــە بـــە حـــوكم) بـــلا ارتيـــاب،

---

[١٠] ئایەتی (٤٠ و ٤١)ە لە سوورەتی (المدثر).

[١١] ئایەتی (٤٣)ە لە سوورەتی (المدثر).

[١٢] ئایەتی (٤٥)ە لە سوورەتی (المدثر) و خانا (و)ەكەی سەرەتایی لابردووە.

[١٣] ئایەتی (٢٨)ە لە سوورەتی (القيامة).

[١٤] هەردوو بەشەكە بریتییە لە ئایەتی (٢٩)ی سوورەتی (القيامة).

[١٥] ئایەتی (٤٢)ە لە سوورەتی (المدثر)، ئایەتەكە بەم شێوەیەیە (ماسَلَكَكُم في السَقَر).

(ڕۆی) یـــا لَیـــتَنی کُنـــتُ تُرابـــاً[١٦]
لا یَملِکـــون مِنْـــهُ خِطابـــاً[١٧]
یـــا مالِـــك المُلْـــك، یَـــومَ التّنـــادي![١٨]
(ببەخـــشی تەقـــسیر "خانـــای قوبـــادی"
جـــەو پـــەی عەفووتـــەن، پـــەی عاســـی عـــەمیم)
إنَـــكَ أنـــتَ التَـــوّابُ الـــرَحیم[١٩]

[١٦] بەشێکە لە کۆتایی ئایەتی (٤٠) لە سوورەتی (النباء).
[١٧] بەشێکە لە ئایەتی (٣٧) لە سوورەتی (النباء).
[١٨] بەشێکە لە ئایەتی (٣٢)ی سوورەتی (غافر).
[١٩] کۆتاییی ئایەتی (١٢٨)ی سوورەتی (البقرة)یە.

## يا أولي الألباب

يـــا أولـــي الألبـــاب، يـــا أولـــي الألبـــاب![*]
نَقـــسَموا بِـــالله، يـــا أولـــي الألبـــاب!
مَـــن مِلّـــةَ الكـــذبْ، في يَـــوم الحـــسابْ؟
لا يُخَفّـــــفُ عَـــــنهُمُ العَـــــذابْ[1]
يـــا أيهـــا النـــاس نَحـــو المـــشركين
وَلا تَكـــــونَنَّ مِـــــن المُتَـــــرين[2]
فَاســـتَعِذ بِـــالله، سَـــميعٌ بَـــصير[3]
مِـــن عَـــذابِ النـــارْ، وَبِـــئس المَـــصير[4]
أيهـــا الإخـــوان! لِكـــون النَجـــاة
أقيمـــوا الـــصَلاة وآتـــوا الزَكـــاة[5]

---

[*] بەشێکە لە ئایەتی (١٩٧)ی سوورەتی (البقرة).

[1] ئاماژەیە بۆ ئەم ئایەتانە (البقرة- ٨٦ و ١٦٢)، (آل عمران- ٨٨).

[2] ئاماژەیە بۆ ئەم ئایەتانە: (البقرة- ١٤٧)، (الأنعام- ١١٤)، (یونس- ٩٤)، دەبێ ئەوەش بڵێم: خانا یان ئەوانەی شیعرەکەیان نووسیوەتەوە لە کەشکۆڵ و بەیازدا، لە بری (فلا)، (ولا)یان نووسیوە، ئیدی روون نییە خانا خۆی ئەو کارەی کردووە لەبەر کێش و وەزنی شیعرەکە، یان نووسەرانی کۆنمان ئەو هەڵەیەیان کردووە.

[3] بەشێکە لە ئایەتی (٥٦)ی سوورەتی (غافر)، خانا بەشێکی وەرگرتووە، لە نێوان وشەی (بالله و السمیع) دا، (إنه هو)ەی لابردووە.

[4] بەشێکە لە ئایەتی (١٢٦)ی سوورەتی (البقرة).

[5] ئاماژەیە بۆ ئەم ئایەتانە، (البقرة- ٤٣ و ٨٣ و ١١٠)، (النساء- ٧٧)، (الحج- ٧٨)، (النور- ٥٦)، (المجادلة- ١٣)، (المزمل- ٢٠).

وَاتَقَــــوا بَطــــشَ رَبَّ العــــالَمين[٦]
وانَ الله مَــــــــع المُــــــــتَقين
واتَقــــوا الله، يــــا أهــــل الإنــــسان!
لا تَتَبعــــوا خُطُــــوات الـــشَيطان[٧]
وَمَــــن يَتبِــــعُ خُطُــــوات الـــشَيطان[٨]
إنَمـــا هـــوَ مِـــن أهـــلِ الخِـــذلان
وَمَــــن يَحتَــــرِز مــــن الخَطايــــا!
أحــــسَنُ قَــــولاً وَفي الــــدَعايا[٩]
يؤتــــه الفِــــردَوسَ رَبِــــكَ الــــيَقين
وَكَــــذلك نُجــــزيَ المُحــــسنين[١٠]
لا تَخَــف خانــا مــن شَــرِّ الجَحــيم
وإن الله غَفــــــورٌ رَحــــــيم[١١]

[٦] ئاماژەیە بۆ ئایەتی (إن بطش رَبك لشديد)، سوورەتی (البروج) ئایەتی (١٢).

[٧] لەم چەند شوێنەی قورئاندا ئاماژە بەو تاکە کراوە: (البقرة- ١٦٨ و ٢٠٨)، (الأنعام- ١٤٢).

[٨] دیسان ئەم نیوە دێرە و نیوە دێری پێشەوە بەشێکن لە ئایەتی (٢١)ی سوورەتی (النور).

[٩] گومان دەکەم ئەم تاکە ئایەتی (٣٣) بێ لە سوورەتی (فصلت) کە بەم شێوەیەیە: (ومن أحسنُ قولا ممن دعآ إلى اللهِ وعمل صلحَاً...)، ڕەنگە بە هەڵە نووسرا بێت، یان شتێکی دیە و من تاکو ئێستا پێی نەگەیشتووم.

[١٠] ئاماژەیە بۆ ئەم ئایەتانە، (الأنعام- ٨٤)، (یوسف- ٢٢)، (القصص- ١٤).

[١١] لە قورئاندا خودای گەورە زۆر ئاماژەی بە غەفوور و ڕەحیمیی خۆی کردووە.

## بەشی فارسی

### خانا در جواب صائب[1]

آن خـــــوش نظـر بـــرآمـــــد، پـــر از خمـــار دیـــده
کاکـــل چـــو[2] افعـــی بـــر دوش، جــامی[3] ز مـــی کـــشیده
از تـــاب آتـــش مـــی، پرگـــل[4] شـــــده عـــرق ریـــز
بـــــرگ سمـــــن[5] ز اخگـــر[6] کاکـــل[7] چـــو[8] گـــل رســـیده[9]

---

[1] ئەم پارچە شیعرە فارسییە لەگەڵ فەردەکەدا، لە پارچە کاغەزێکی باریکی زەردهەڵگەڕاودا لای مامۆستا محەممەد عەلی قەرەداغیی خۆشەویست بە دەستم هێناوە، بەڵام هەندێك لەنگی لە پارچە شیعرەکەدا بەدی دەکرا، دوای ئەوەی خۆم بەو نیمچە خوێندەوارییەوە هێنامە سەر ڕێنووسی نوێ، دواتر لە لایەن مامۆستا موحەممەد ڕەشیدی ئەمینیی پاوەیی پێداچوونەوەی بۆ کرا. دوابەدوای ئەوە بە مامۆستا ئەنوەر سوڵتانیم ڕاگەیاند کە شتێکی وام بڵاو کردۆتەوە. بەڕێزیان لوتفیان کرد و پێداچوونەوەیەکی وردیان بە شیعرەکەدا کرد. بەم شێوەیە هەڵە و کەم و کورتییەکانی بۆ دەستنیشان کردم. جێگەی خۆیەتی لێرەدا سوپاسی بکەم. دەبێ ئەوەش بڵێم کە لە ئەدەبی کوردیدا تاکو ئێستا هیچ شاعیرێکمان نییە بە ناوی "سائیب" کە هاوتەمی خانای قوبادی بێت، بەڵام لە ئەدەبی فارسیدا شاعیرێك بە ناوی "سائیبی تەبریزی" هەیە، ئەو سائیبەش پێش خانای قوبادی ژیاوە. بەڵام وای بۆ دەچم کە خانا شیعری ئەم سائیبەی ئێرانی خوێندبێتەوە و بەم شێوەیە وەڵامی دابێتەوە. مامۆستا ئەنوەر سوڵتانییش چەند تێبینییەکی لە کۆتاییەوە بۆ نووسیوم و من لە کۆتایی ئەم پارچە شیعرەدا وەکو خۆی بڵاوی دەکەمەوە.

[2] در نسخه اصلی "چه" ثبت شده است که نباید باشد.

[3] در نسخه اصلی "جام" است.

[4] شاید پر به فتح (پ) باشد به معنی برگ گل. "پەر گوڵ" و "پەڕەی گوڵ" هردو مصطلحات زبان کردی هستند و به همان معنی می آیند.

[5] یاسمن.

[6] "اخگر"؟، "افسر"؟ ..... روشن نیست.

گـــل را ز رنـــگ ســـباك[10] ســـفیده ســـحر كـــــرده
چـــون پرتـــوی منـــور كـــز خـــاوری[11] دمیـــده
از گـــوشـــــەی دوچـــشمش خلقـــی فتـــاده سرمـــست
هـــرســـــو كـــنی تماشـــا، چــــــون میـــوه رسیـــده
هرجـــا كـــه رفـــت ســـروش،[12] زمـــین رشـــك ارم[13] كـــرد
از بـــس كـــــــه[14] خـــون سمـــن از دامـــنش چكـــیده
افتـــــاده شـــور و غلغـــل،[15] در صـــحن جـــان بلبـــل
خـــــار ســـتم غنـــچه را جیـــب[16] قبـــا دریـــده[17]

[7] هردو كاف، كاف عربی هستند. كاف دوم به چم خوانده میشود. كاكل به معنی موی سر كه بلند نگاه داشته شود.

[8] در نسخه خطی "چه" آمدة است كه غلط ست.

[9] تعبیر "رسیده" نمی تواند با معنی بقیه جمله تناسب داشته باشد. ولی اگر رسیده نباشد چیست؟

[10] لفظ عربی به معنی زرگر. معنی بیت این است: یار من مانند آفتابی كه از خاور بدمد در سپیده صبح گل را به رنگ طلائی درآورد.

[11] یك خاور.

[12] سرو او، قد بلند او.

[13] باغ بهشت "ارم ذات العماد".

[14] در نسخه به شیوه "از بسكه‌كه" آمده است كه غلط است.

[15] سر و صدا.

[16] جیب به سكون (ج) بمعنی جیب لباس و با فتح (ج) به معنی یقه پیراهن همچنین سینه و قلب، در اینجا به معنی اول آمدة است.

[17] در نسخه "دمیده" آمدة است كه گمانی در غلط بودن آن نیست.

آتـــش فتـــاده "خانـــــا"،[18] بـــر "صـــائبا" ز نظمـــت[19]
تـــا دیـــــد ایـــن غزلهـــا، هـــوش از بـــرش رمیــــده

****

**مخمس محمد خانا جوانروی***

ای که از هر چه بگویم لطف تو بــــالاترست
در شرافت چــون شریفی حسن رویت انورست
گر کسی پــاکیزه طبع نیك و روشن اخـترست
گر به تخت پادشاهی نـــاکسانش همسرست
می شمارندش به ناکس گر چـه او پیغمبرست

****

**فرد خانا**

نیـم یـــوسف، ولی دارم زلیخــــا
چه غم دارم که شد یارم "زلیخا"؟[1]

---

[18] آنچه بعد از آتش فتاده آمده بنظر "ها" میآید، در اصل ها نیست بلکه خط خوردگی ساده و اصلاح غلطی است که بر قلم نسخه نویس جاری شده است. نسخه بردار بعدا خواسته است آنرا حذف نماید.

[19] مصراع در کلیت خود نامفهوم است، باید اشتباهاتی در رونویسی آن رخ داده باشد.

* ئەم موخەمیسەش کە بە ناوی موحەممەد خانای جوانرۆییە، لێرەدا بە ناوی خانـای قوبادییـەوە تۆمـاری دەکـەم، تاکو زانیاریی وردتر و باوەڕپێکراوترم دەست دەکەوێت.

[1] وتەکانی مامۆستا ئەنوەر سوڵتانی لە بابەت وەڵامی خانا بۆ سائیب:

ئەمەش تێبینییەکانی مامۆستا ئەنوەر سـولتانیی خۆشەویـستە: نووسـەرەوەی نوسـخەکە خوێندەوارییـەکی تەواوی نەبووە و وا هەیە فەقێ یا کۆلکە مەلایەك بووبێت، هەر بۆیەش لە نووسـینەوەی شـیعرەکاندا هەڵەیـەکی زۆری کردووە. ئەگەر خوێنەر شارەزای باشی زمان و شیعری فارسی نەبێت و تەنیا پێ بنێتە جێ پێی ئـەو، تووشـی هەڵەیەکی زۆر دەبێت و شیعرەکەش لە گرێژنە دەچێت. بەشێك لە هەکان لێرەدا ساغ کراونەتەوە، بەڵام بەشـێکیان ماون. وا هەیە تاقە رێگە بۆ ساغکردنەوەی تەواوی شیعرەکە دەستکەوتنی نوسخەیەکی دیکەی بێـت لـە دوارۆژ و لە سـەرچاوەیەکی دیکەدا. دوایین دێری غەزەلەکە کێشەی زۆری تێدایە. ئاشکرایە ئەوەی وا بە "ها" خوێنراوەتـەوە وانییە. نوسخەنووس هەڵەی لـە نووسـینەکەیدا کـردووە و کووژاندوویەتییـەوە، جـا ئـەو کوژانەوەیـە وەك "هـا" دەنوێنێت دەنا "ها" نییە.

با بزانین پاشماوەکەی چۆنە؟ بە بۆچوونی من لە شـیعرەکەدا خانـا نـاوی خـۆی و سـائیبی پێکـەوە هێنـاوە و گوتوویەتیی: ئەی خانای قوبادی! بەهۆی شیعرەکانی تۆوە کە زۆر بەرزن، ئاگر کەوتۆتە گیانی سائیب، واتە: کـاتێ کە چاوی بە شـیعرەکانی تۆ کەوت هۆشی لەبەردا نەما و بێهۆش بوو. ئەوە سـەرجەمی شـیعرەکەیە، بـەڵام بـەهۆی هەندێك هەڵەی نوسخەنووسەوە چەمکەکە تا رادەیەك شاراوە بووە و ساغکردنەوەی هاسان نییـە، تەنانـەت نـاوی خاناش وا نەنووسراوە کە بخوێنرێتەوە. ئەوەش کە نووسراوە (هوش از دلش) هەر هەڵەیە و دەبێ (هوش از برش) یا (هوش از سرش) بێت.

سـەبارەت بە سائیب من هیچ گومانێکم نییە کە نازناوی (صائب) دەگەڕێتـەوە بـۆ شـاعیری ئێرانـی "مـیرزا محەمەد عـەلی کـوڕی مـیرزا عەبـدولڕەحیمی تـەبریزی (١٦٠٧- ١٦٧٥ ز.)، نـاوبراو لـە پێـشەوایانی شـێوازی "هیندی"یە لە شیعری فارسیدایە و دوو نازناوی هەبووە: "صـائب" و "صـائبا"، کـە لێـرەدا خانـا کـەڵکی لـە دووهەمیان وەرگرتووە. زۆرێك لە شاعیرانی کورد وەك بێسارانی و نالی و وەفایی و خانا لـە سـەر شـێوازی هینـدی شیعریان گوتووە و کارتێکردنی شاعیرانی شێوازی هیندی بە تایبەت "سـائیب"یان لەسەرە کە تایبەتمەندییـەکانی بریتین لە خەیاڵی قووڵ و زمانی ناسك و باریکبینی تەجرید و تەمسیل هێنانـەوە و دووربـوون لـە ژیـانی واقیـع. (ئەنوەر سـولتانی).

دوای خوێندنەوەی تێبینییەکانی مامۆستا سولتانی، منیش دەڵێم: خانا لـەو دەمـەدا کـە شـاعیرانی فـارس کاریگەرییان لەسەر شاعیرانی کورد دروست کردووە، خانـا بـۆ شـکاندنی رێـچکەکە، شـاعیرانی کـورد و فارسـی هۆشیار کردۆتەوە لە زیرەکی و بلیمەتیی شاعیرانی کورد و گوتوویەتی شاعیرانی کورد ئەگەر لە شـاعیرانی فـارس زیرەکتر و بەدەسـەڵاتتر نەبن، ئەوا کەمتر نین. هەر بۆیە دەڵێت: ئەی شاعیرانی فارس! ئەوا ئێمەی کوردیش ئـەو پلـە شـیعرییەمان لە شیعر و شاعیرانی ئێوە بەرز و بڵندترە کە ئێوە شانازیی پێوە دەکەن، ئێمە لە ئێـوە زیـاتر شـانازی بە شیعر و شاعیرانی خۆمانەوە دەکەین و پلەی شیعر و شاعیرێتیی ئێمەی کورد لە پلەی شاعیرانی فـارس زیـاتر و

بەرزترە. ئەمەش ئەوەم بە بیردا دێنێتەوە کە لە سەردەمی خانای قوبادیدا دەبینین زیاتر بایەخ بە وەرگێڕان و نووسینی داستانە شیعر بە شێوەزاری کوردیی گۆرانی زیاترە و بڵندترە، زۆر لە شاعیرانی کورد لەو دەمەدا بایەخیان بەو جۆرە کارە داوە. وەکو دەبینین خانا و میرزا شەفیعی کولیایی و ئەڵماس خانی کەندوڵەیی و مەلا وەڵەدخانی گۆرانی و... داستانە شیعریان بە شێوەزاری گۆرانی نووسیوەتەوە. خانا ڕێچکەکەی شکاندووە و شاعیرانی کوردی هۆشیار کردۆتەوە و پێیان دەڵێت:

ڕاستەن مەواچان فارسی شەککەرەن کوردی جە فارسی بەل شیرینتەرەن

واتە: بە کوردی بنووسن و بخوێننەوە، هەر چەندە کە فارسی شەککەرە، بەڵام کوردی لە فارسی شیرینترە، ئیدی خانا نەی گوتووە بە سۆرانی یان گۆرانی (ماچۆیی) بنووسن... تاد. (کاروان).

# فەرهەنگۆك

## پیتی ئـ

**ئابڕوو:** شەرەف، شەرم، نامووس، ئاوڕوو، ئاوی ڕوو، حورمەت، حەیا، ڕووسووری، شکۆداری.

**ئاتەش:** ئاگر، ئاور.

**ئاداب:** ع. ڕێوشوێن، دەستوور، داب و نەریت، داب و دەستوور.

**ئارا:** ف. ڕازێن، خەملێن، ڕازن، تەورزێن، ڕازێنەر، جێگا، وجوود، ڕازاندنەوە، ئارایش، پاشبەندە بۆ هەندێك وشەی وەك چەمەنئارا.

**ئازاب:** لە (عذاب)ی عەرەبییەوە وەرگیراوە، ڕەنج، شکەنجە، ئەشکەنجە، ئازار.

**ئاسا:** وەك، وەکو.

**ئاسار:** ع. نیشانە، شوێن دەست و پێ، پاشماوە، شوێنەوار.

**ئاستانە:** بەر دەرگا، بەر دەرگ، بەر ماڵ.

**ئافاق:** ع. کۆی (افق)ە، ئاسۆ، نشات، ئاوا، زێواری ئاسمان، بەرژەوەند، بەرەجەوەن.

**ئوفتادە:** ف. لە (افتادن)ی فارسییەوە وەرگیراوە. کەوتوو، لە پڕ ڕوودانی شتێك کەوتنە سەر ڕێگایەك، گرۆبوون بە کار یان ئاکارێك و بە دوویداچوون، خاکی، خاکەسار.

**ئافتاو:** هەتاو، خۆر، خۆرەتاو، تاو.

**ئالەم:** لە (عالم)ی عەرەبییەوە وەرگیراوە، دونیا.

**ئالوو:** ئالوودە، تووشبوو، تێوەگلاو، پێوەبوو.

**ئامان:** دەخیل، هاتووە، هاتن.

**ئایە:** لە (آیة)ی عەرەبی وەرگیراوە. ئایەتەکانی قورئان.

**ئایینە:** ئاوێنە.

**ئەبلە:** ع. دەبەنگ، گەوج، لاوژ، گێلۆکە، گێل، کەمهۆش و بێئاوەز.

**ئەجزا:** کۆی وشەی (جزء)ی عەرەبییە، پارچە، لەت.

**ئەختەر:** ف. ١. ستارە، ئەستێرە. ٢. هات، چارەنووس، بەخت، ناوچاو. ٣. لووشە گوڵ، گوڵە دروەش.

**ئەخزەر:** ع. سەوز، نەگەییوو، ناکام.

**ئەژدەر:** ئەژدیها، ماری زۆر گەورە، لە ئەفسانەی کۆندا هاتووە، گوایە جۆرە مارێکی زۆر گەورە بووە و ئاگر لە دەمی هاتووەتە دەرەوە.

**ئەژدیها:** ماری زۆر گەورە.

**ئەر:** کورتکراوەی ئەگەر.

**ئەرباب:** ع. ١. خاوەن، خێو، ئاغا. ٢. خودایان. ٣. خاوەنان. ٤. لەبەر دڵان، خاوەنکار، پڕگاڵ.

**ئەڕڕە:** مشار، هەڕە.

**ئەرجووم:** تکا، داواکاری.

**ئەرواح:** کۆی وشەی (روح)ی عەرەبییە، گیانەکان، گیان.

**ئەزەل:** ع. ئەوەڵ، سەرەتا، بنەڕەت.

**ئەزرەق:** ع. کەوە، شین.

**ئەسڵ:** ع. هەرخۆ، ڕەسەن، شتی باش و چاك، سەرچاوە، زاوە، بنە، ڕەگ، ڕیشە، بناخە، بنچینە، بنەڕەت، بنەماڵە، ڕەچەڵەك، هۆ.

**ئەسیر:** ع. دیل، گیراو، یەخسیر، بەند.

**ئەشیا:** شتومەك.

**ئەعزەل:** ع. بێچەك.

**ئەعزەم:** ع. زۆر مەزن، زۆر گەورە، گەورەتر، بەڕێزتر.

**ئەعلا علیین:** ع. جێگەیەکی زۆر بەرز و گەورەیە لە بەهەشتدا، خودای گەورە تایبەتی کردووە بەو کەسانەی بە ڕاستی خۆیان بۆ خودا بەخت کردووە، ئەعلاش بە واتای بەرزتر دێت، واتە بەرزترین جێگە لە بەهەشتدا بۆ موسوڵمانان کە خودا پێیان دەبەخشێت.

**ئەفزا:** ف. گەشێن، بووژێن، زیادکەرەوە.

**ئەفسوون:** جادوو، کارێك کە ئەفسوونکار بۆ هەڵخەڵەتاندنی کەسێك یان شتێك دەی کات.

**ئەفشار:** ١. خانۆکەی پێنجەمی تەختەی نەردێن. ٢. گوشراو، گوشاو، شوار، گوشیو، کوشراو، گوشێنراو، یار، یاریدەر، دەس، تاریکار. ٣. زۆرکردن، تەقەللاکردن.

**ئەفلاك:** ع. کۆی وشەی (فلك)ی عەرەبییە. ئاسمانەکان، گەردوونەکان.

**ئەقدەس:** ع. پاك، پیرۆز.

**ئەقسا:** ع. مزگەوتی ئەقسا لە قودس، موحەممەد پێغەمبەر (د.خ.) لە شەوی میعراج بە سواری بوراق ڕۆیشتووەتە ئەوێ و پێش نوێژیی بۆ گشت پێغەمبەران لەو مزگەوتەدا کردووە.

**ئەکبەر:** ع. گەورەتر، مەزنترین، ئاماژەیە بۆ خودا.

**ئەکلید:** لە (اکلیل)ی عەرەبییەوە وەرگیراوە. ١. تاجە گوڵینە، ٢. گەردێکی بریقەدارە وەك زێڕ و زیو دەنوێنێت و بۆ جوانکاری دەگونجێت، ٣. کەلوو، ناوی دوو ئەستێرەی ئاسمانە.

**ئەڵتاف:** ع. کۆی (لطف)، نەرم و نیانی، سۆز.

**ئەڵحەد:** ع. کێلی گۆڕ، گۆڕ، قەبر، ئەڵهەو.

**ئەلیەقین:** ع. ١. باوەڕپێکراو. ٢. دڵنیا بوون، دڵنیایی، بێگومانی، سەلماندن، باوەڕکردن. ٣. ڕاست، ڕەوان.

**ئەمر داوەر:** فەرمانی خودا.

**ئەملاك:** ع. کۆی (ملك)ی عەرەبییە، موڵك و ماڵ، سەروەت و سامان.

**ئەممار:** ع. ١. ئەنبار، جێگای زەخیرە، شوێن، جێگا. ٢. نیشانە، نیشان، ٣. گومڕابوو، گومڕاکەر کەسێك زۆر فەرمان بکات.

**ئەنار:** هەنار.

**ئەنبیا:** ع. کۆی (نبی) عەرەبییە، واتە پێغەمبەرەکان، پێغەمبەران.

**ئەنجووم:** ع. کۆی وشەی (نجم)ی عەرەبییە. ئەستێرەکان.

**ئەندۆ:** خەم، کەسەر.

**ئەنگوشت:** پەنجە.

**ئەهل:** ع. ١. خەڵك. ٢. خاوەن.

**ئەوج:** ع. لوتکە، پۆپە، ئەوپەڕی.

**ئەوزاع:** ع. کۆی (وضع)ی عەرەبییە، واتە حاڵ، ژیان، کۆی وشەی عەشیرە و هۆز.

**ئەویچ:** ئەویش.

**ئەیلات:** کۆی وشەی (ئیل)ە، ئێلات، ئێلەکان، خێڵەکان، تیرە، هۆز.

**ئەیوان:** هەیوان، بەرێوان.

**ئۆتاق:** ت. ژوور، هۆدە، وەتاخ.

**ئورس:** ئوورس ناوی درەختێکە زیاتر پێی دەگوترێ عەرعەر، توێژی سەرلێو لێو بەبار.

**ئونف:** ع. لووت کەپوو کەپ، دەماخ.

**ئیجاد:** ع. دروستکردن، دۆزینەوە، داهێنان.

**ئیحترام:** ع. ڕێزلێنان، ڕێز، ڕێزگرتن، ڕێزلێنان.

**ئیخلاس:** ع. دڵسۆزی، دڵ و دەروون پاکی، پەروەری، دڵپاکی، بێخەوشی.

**ئێد:** ئەمە، ئا ئەمە، ئەوەی نزیك.

**ئیستیدعام:** ع. داوا، داواکاریم هەیە.

**ئیستیقبال:** ع. پێشوازی، بەپیرەوەچوون، پێشبەری.

**ئیشقاق:** ڕووناکی، نوورانی.

**ئیقبال:** ع. ١. بەخت، نێوچاوان. ٢. پیشوازی، ڕووتێکەری.

**ئیمداد:** ع. یاریدان، یارمەتی، کۆمەك، کار و ڕەوتی فریاکەوتن.

**ئینە:** ئەمە.

**ئینتیزار:** ع. چاوەڕوانی، چەمەڕایی، چاوەنۆڕی.

**ئینشا:** ع. دارشتن، نامە نووسین.

## پیتی ب

**باتڵ:** ع. هەڵوەشاو، بێهوودە، پووچەڵ، قوپڵ، پڕوپووچ.

**باجەتی:** لەبری، لەباتی، بە حاجەت، بۆ خاتری.

**باجەلان:** هۆزێکی گەورەی کوردە، پێش چەند سەد ساڵێك میرنیشنێکیان لە سەرپێڵی زەهاودا هەبووە و ئێستەیش هەندێك لە پاشماوەی ئەو میرنشینە ماوە.

**بادە:** مەی، مەشرووب.

**بار:** سەبر، تەحەمول، بار و بنە.

**بازنە:** حەلقە، خەتێکی خولاوەی بەیەکگەیشتوو.

**باچە:** بڵێ، بێژە.

**باعیس:** ع. هاندەر، سەبەب، هۆ.

**باغی جینان:** ع. باخێکە لە بەهەشتدا.

**باف:** ف. ١. جووڵانەوە، بزووتن، بزووتن. ٢. ڕاچین، داچین، هۆندراو.

**بافت:** ف. ١. شایستە، ڕێس و چنین، تەنراو، هۆنە کەسم، پێکهات. ٢. ڕەگ، کار و ڕەوتی هۆندنەوە.

**بافتەن:** چنیت، هۆنین، هۆنینەوە، ڕاچاندن، هۆندنەوەی بەن.

**باڵین:** سەرین، پشتی، سەنگیا، سەنیا.

**باهوو:** شان و قۆڵ.

**باوەنان:** کۆی وشەی باوانە، کوڕی باوان.

**ببۆ:** ببێ.

**بەچ:** کورتکراوەی بەچەیە. بەچکە، بێچوو.

**بەچە:** بەچکە، منداڵ.

**بەدتەر:** بەدتر، خراپتر.

**بەدر:** ع. مانگی چواردە.

**بەدەخشان:** وڵاتێکە لە خوراسان و لە کۆندا لەعلی لێ بەرهەم هێنراوە.

**بەدرساف:** وەکو مانگی چواردەی تەواو و ساف و ڕووناک، مەبەست لە ڕووخساری پاك و بێگەردی یارە.

**بەدەن:** ع. لەش.

**بەدخوو:** ١. ترش و تاڵ، ناوچاو گرژ، ناوچاودێز، بەدخۆ، نەگونجاو، ٢. دوژمن، بەدکار.

**بەدفەڕ:** نەگبەت کەسی خراپ، چارەڕەش.

**بەدکار:** خراپکار، گاریس، گەنەکار، ناخار، ناپەسەند، بەدڕەفتار، پیاوخراپ.

**بەرحەق:** ف.-ع. حەقبەدەست، خاوەنحەق.

**بەردەن:** بردووە.

**بەردشان:** بردیان.

**بەرسیس بەرسیسا:** قەشەیەکی بەنی ئیسرائیلی بووە، ماوی ٦٠ ساڵ گۆشەگیری و خوداپەرستیی کردووە، لە سەردەمی پیریدا ئافرەتێك هەڵی دەخڵەتێنێت و منداڵێکی لێی دەبێت. بە دەستی خۆی منداڵەکە دەکوژێت و حەشاری دەدات، بەم هۆیەوە ئاخرشەڕ دەبێت.

**بەرشە:** هەڵبێ، خۆت دەرکە.

**بەرشین:** دەرچوون.

**بەرف:** ف. بەفر.

**بەرق:** ع. کارەبا، چەخماخە، هەورەبرووسکە، هەورەبزیسکە.

**بەست:** بەستنی شت.

**بەعزێ:** ع. برێك، بەشێك، پشکێ، هەندێك.

**بەگلەران:** ت. پیاوی گەورە و بەدەستەڵات. بەگەکان، بەگلەرایەتیکردنی بەگەکان.

**بەڵخ:** شارێکە دەکەوێتە ئەفغانستانی ئێستا.

**بەندەگان:** بەندەکان، کۆیلەکان.

**بەو شا:** سوێند.

**بەوار:** بۆ خوارەوە، سەرەوخوار.

بەواندە: ئەوەندە، شتێکی دیاریکراو.

**بەی بەیدا:** دوو مانای هەیە، ئەگەر بڵێین بەی: واتا داری بەی، ئەگەر بە بەیدا (بیداء) لێکی بدەینەوە، ئەوا واتای بیابان، دەشت، چۆڵەوانییەکی پان و بەرینی هەیە. مانای هاتنیش دەدات. بەو، ئەو، دێ، دێت.

**بەیۆ:** بێت.

**بەیان:** بەیانی زوو، سپێدە، وتن، وتم، سوح، شێوەی قسەکردن، کۆی وشەی "بەی"ە.

**بەیداخ:** ئاڵا.

**بەیزا:** ع. هێلکەیی، جەغزئاسای درێژۆکە وەك هێلکە، سپی، سپێتی.

**بەیع:** ع. سەودا، مامەڵە، سەندن و فرۆشتن، کار و ڕەوتی کڕین.

**بەین:** ع. نێوان.

**بڕندە:** بەبڕشت، تێژ، تیژ، تون، بەئازار.

**بزورگ:** ف. گەورە، ناوی یەکێکە لە ئاوازەکانی مۆسیقا.

**بسان:** بسێن، کرِیار.

**بشۆ:** برۆ.

**بشان:** برۆن، رۆیشتن بە کۆمەڵ، بە دەستە رۆیشتن، بە کۆمەڵ رۆیشتن.

**بگرەوان:** بگرین، بگریەن، فەرمانی گریان (کۆ).

**بگنۆ:** بکەوێ، ڕوو بدا.

**بکەرۆ:** بکا، بیکات.

**بلَند:** بەرز، ئاسۆ.

**بلوور:** یۆنانییە. تەورك، جۆرێك شووشەی بێگەرد و گرێ و ئەستوور.

**بنێۆ:** بینیت، دابینێ.

**بۆ:** وەرە، بۆن، بێن.

**بۆ باغ:** هەمووی بۆ باخ بێت، هەمووی ببێتە دارستان، دەشێ بۆیاغ بێت، بە مانای ڕەنگ و سبووخ.

**بۆسا:** ماچی کرد.

**بۆش:** بۆنی، بۆن.

**بواچان:** بڵێن.

**بوخارا:** شارێکی گەورەیە لە ئاسیای ناوەڕاستدا، شاری ئیمامی بوخارییە.

**بوراق:** ع. باڵندەیەکە خودای گەورە لە ئاسمانەوە بۆ موحەممەدی (د.خ.) ناردە خوارەوە لە کاتی ڕۆیشتنی بۆ ئاسمان لە سەفەری ئیسرا و میعراجدا.

**بورج:** یۆنانییە. بورج، ئەستێرەی موشتەری.

**بوگرێزۆن:** هەڵبێم.

**بووڵ:** ع. خۆڵەکەوە، خۆڵەمێش.

**بوڵەندی:** بەرزبوونەوە.

**بێ پەردە و حیجاب:** خودای گەورە لە موسوڵمانانی ناو بەهەشت دەپرسێت: نیعمەتێك ماوە لە نیعمەتەکانم پێتانم نەبەخشیبێت؟ خەڵکیش دەڵێن: هیچ نەماوە پێی نەگەین، خوداش دەفەرمووێت:

سەر بەرزیکەنەوە و من ببینن، پەردە و حیجاب لەسەر خۆی لادەدات و خۆی نیشانی بەهەشتییەکان دەدات.

**بێشومار:** بێهەژمار، یەکجار فرە، لەژمارەبەدەر، بێحیساب.

**بیا:** ببوایە.

**بینایی:** رووناکیی چاو، رۆشنیی چاو، سۆ، سۆمایی، سۆما، هەتەر.

**بێدار:** بەئاگا، نەخوتوو.

**بیرکەندە:** بیرهەڵکەندوو، کەسێك بیر هەڵ بکەنێت، هۆش لەلا نەماو.

**بێشۆ:** لەڕادەبەدەر، بێئەندازە.

**بێغ:** بن، بنەچە.

**بیکر:** دەست لێنەدراو، کچ.

**بێوە:** ئێوە، بێوەژن.

**بینەیت:** کۆی وشەی بینە، هەناسە، هەناسەکانت.

## پیتی پ

**پابۆس:** پێ ماچ کردن، پاڕانەوە لە کەسێك بۆ ئەوەی کارێك ئەنجام بدات.

**پاتاو:** جۆرە پۆشاکێکی چەرمین، یان قوماش بووە کە وەك گۆرەوی وابووە، لە ڕابوردوودا خەڵکی لە پێیان پێچاوە.

**پاپل:** وردەلکی دار، پاوپل.

**پار:** ساڵی پار، ساڵی ڕابوردوو.

**پارە:** پارچە، لەت کەرت.

**پاسەبان:** پارێزەر، نیگابان، ئێشکگر، کێشکچی، پاسەوان، چاودێر.

**پاسەن:** وایە.

**پاشەم:** دەوروبەری خۆی.

**پاکیزە:** پاك و بێگەرد، تەمیس، خاوێن، بێگەرد، بێخەوش، پاك، پاکژ، پاکتاو، پوختە.

**پایە:** ١. پلە، ئەستوون، پاچکە، کۆڵەکە، بناغە، بنەڕەت. ٢. مەرتەبە، پلەوپایە. ٣. پایەگا و تاستی کەسێك لە گرۆیەکدا. ٤. جۆرێك لە ڕووەك و گیا.

**پەتیارە:** بەڵا، ناشیرین، سەڵیتە، شێتۆکە، ئەقڵسووک.

**پەرباز:** باڵندەیەکە پەرش و پۆ دەردەکات بۆ پاڵ گرتنەوە.

**پەرداز:** ف. ١. هاشوور، هێڵی زۆری هاوڕێز کـە لـە نەخشەکێشی، یـان کەندەکاریـدا بـۆ سـێبەردان و دیاریکردنی ئاستەنگی جیاواز بەکار دێت. ٢. ڕاپەڕین، ٣. لابەر، خۆ بـە هەرمانێکـەوە خـەریککردن. ٤. ڕازێن، تەورزێن، ڕێژ، ڕازێنەر، ڕێکخەر.

**پەرکەندە:** پەخش، پرژوبڵاو، پەرووباڵ کەندنەوەی باڵندە.

**پەروا:** ترس، سڵ، سام، دڵەلەرزە.

**پەرێ:** بۆ.

**پەست:** تووڕە، کەواتە، دوا.

**پەسەندیدە:** پەسەندکراو، هەڵبژێردراو.

**پەلاس:** پارچەی زبر، تیکەی شتی کۆن، پلاس، نمالی، چەپاڵ، وەڕ، تانە و تەشەر.

**پەنا:** لەلا، تەنیشت، پشتیوان، پەنها، هاوار، گۆشە.

**پەناگۆ:** لە بن گوێی، لە تەنیشت گۆشی، بە نهێنی شتێك گوتن.

**پەنەش:** پێت، پێی.

**پەند:** ئامۆژگاری.

**پەهلەوان:** پاڵەوان، نەبەز، لێهاتوو، بەقووەت، زۆردار، قارەمان.

**پەیرەو:** شوێنکەوتە، لایەنگر.

**پەیکان:** پارچە ئاسنێکی نووکتیژە بەسەر تیرەوە یان بەسەر نێزەوە دەکرێت، تیر، پێکان.

**پژاو:** پرشوبڵاو.

**پۆشاك:** جلوبەرگ کەلوپەل.

**پول:** پارە.

**پێشان:** پێشتر، بەرلەوە.

**پێشەوا:** ڕابەر، سەرکردە، گەورە، سەرۆك.

**پێچ:** لوول، بەیەکداچوو.

**پێچومرد:** پێچخواردوو، پێکداچوو.

**پێوار:** نادیار، شەو، گووم، لەبەرچاو ونبوون.

## پیتی ت

**تا سەر:** تاکو کۆتایی.

**تائیفە:** ع. تایەفە، پەل، بەشێك لە خێڵ یا هۆز، قەوم و قیلە، خزم و خێش.

**تاج و تۆمار:** تاج و قەباڵەی شاهی.

**تاجیل:** ع. ١. (تعجیل) پەلە: خێرا ئاما بە تاجیل قایم گرت گۆشم. ٢. (تأجیل) دواخستن.

**تالار:** ع. تەلار، باڵەخانە.

**تاو:** تین و گەرمایی، کاتێکی کەم، تا، ڕاکردن بە توندی.

**تەتار:** گەڕۆك، ناوی قەومێکی تورکە.

**تەجەللا:** ع. خۆنوێنی، خوویایی، تیشکدانەوە، ڕۆشنبوونەوە.

**تەحسیل:** ع. ڕەوت و کاری خوێندن، فێرە زانست، بەدەستهێنانی زانست.

**تەدبیر:** ع. ڕاوێژ، چارەسەر.

**تەرز:** تەرح، جۆر، شێوە.

**تەرس:** ترس.

**تەرکیب:** ع. ئاوازدانان، پێکهێنان، تێکەڵاویی چەند ڕەنگ یا کەرەستەی دیکە.

**تەریدە:** ڕێگر، جەردە.

**تەسهیل:** ع. حەواندنەوە، ئاسانکاری، ساناکاری.

**تەشاب:** ع. لەیەکچوون، وەکیەکبوون.

**تەشنە:** توشنە، تینوو، ئاڵۆز، بارودۆخی خراپ.

**تەعالا:** ع. گەورە وبڵند.

**تەعزیر:** ع. ١. پەلپگرتن، بەهانەگرتن، بیانووهێنانەوە. ٢. کار و ڕەوتی تەمێکردنی تاوانبار لەسەر تاوانێك کە لە شەرعدا سزای بۆ نەبڕاوەتەوە.

**تەعلیم:** ع. پەروەردە.

**تەقصیر:** ع. کەموکورتی، کەمتەرخەمی، گونە، کۆتایی، درێغی.

**تەلا:** ع. ئاڵتوون، زێڕ.

**تەلاش:** ت. هەوڵ، کۆشش، تێکۆشان.

**تەلعەت:** ع. دیمەن، ڕوخساری جوان.

**تەڵەبکار:** ع-ف. داواچی، داواکار، خاوەنقەرز، لاوەکەر.

**تەلیسم:** یۆنانی. نوشتە و جادوو، دەمبەست، چاچۆڵە.

**تەناف بازی:** یاریکردن بە تەناف، یاریکردن بەسەر تەنافەوە.

**تەنگ:** دژی ئاواڵە و ئاوەلا.

**تەوبیخ:** ع. سەرکۆنە.

**تەوحید:** ع. باوەڕکردن بە تەنهایی خوا، خودا بەیەکزانین.

**تەورزین:** تەوەرزێن، یەکێکە لە کەرەستەکانی شەڕ، لە کۆندا بەکاریان هێناوە.

**تەوسیف:** ع. کار و ڕەوتی گێڕانەوە، گەڕانەوە، ناساندن، پێداهاتن، چۆنێتیی گوتنەوەی شتێك، تەعریف، پێداهەڵدان.

**تەوفیق:** ع. سەرکەوتوویی، دەستکەوت، وەدەستهێنان، هیدایەتدان، یارمەتیدان.

**تەییار:** ئامادە.

**ترازەندە:** لێکترازان، جیابوونەوە.

**تریشقە:** بزیسکە.

**تۆف:** تۆفان، باوبۆران.

**توحفە:** ع. سندوقی بچووکی شت تێدا هەڵگرتن، دیاری.

**توغیان:** ع. ۱. دۆخ یان چۆنێتیی لادان لە ڕێبازی سەرەکی یان دابینکراو، هەڵدان، هەڵکفان، گلان، سەرکردن، ۲. شۆڕش، ڕاپەڕین، هەڵسان، ۳. جام، دەفر، مەبەست لە دەفری دەستی سواڵکەرە.

**توفەیل:** خۆفیداکردن، خۆ بەقوربانکردنی کەسێك.

**تیجار:** ع. بازرگان، ئەجارە.

**تیرئەنداز:** تیرهاوێژ.

**تێز:** تیژ.

## پیتی ج

**جام:** شووشه، شیشه، کاسه، جێگا.

**جامه:** کراس، بەرگ.

**جاهل:** ع. نەخوێندەوار، ناحاڵی، کافر، لەدینەدەرچوو، نەزان.

**جە:** لە.

**جەب:** شارێکە لە نزیکی زەنگیباردا لە سەرزەوینی بەرپەر کە بە سەرزەمینی زەڕافەش ناوبانگە.

**جەبلەکێش:** لە نێو شەخەڵ و دارستان کێشکراو، شوێنی دیاریکراو.

**جەد:** ع. ۱. کورتکراوەی جهەدە، واتە: بێحەد، لەڕادەبەدەر، بێتاوان، بێهۆ، بێمەبەست، ۲. باپیرە.

**جەزبە:** ع. حاڵلێهاتوویی دەروێشانە، هێزی دەروونی و ئاکارێک کە دەبێتە هۆی کارتێکەری بەسەر کەسانی ترەوە.

**جەستە:** لاشە، بەدەن، گیان.

**جەعد:** ع. لوول.

**جەمین:** تەوێڵ، ناوچەوان.

**جەور:** ع. ستەم، زوڵم، لە ڕێگەی ڕاست لادان.

**جەوزا:** ع. ۱. سێیەمین بورجە لە دوانزە بورجی ساڵ و بەرانبەر بە جۆزەردانە. ۲. دارێکە بەرەکەی دەکرێتە دەرمان. ۳. وێنەیەکی ئاسمانییە کە بە شێوەی دوو مرۆڤی لفەدوانە دێتە بەر چاو.

**جەیش:** ع. سوپا، لەشکر.

**جوور:** ۱. جۆر، چەشن، شێوە، وێنە، شێوە، شێواز، ڕەوش. ۲. ستەم. ۳. ساز، باش، ڕێکوپێک، تەکوز. ٤. تەبا، جووت، دروستکەر.

**جۆیار:** ئەوەی بەدوای کەسێك، یان شتێکدا بگەڕێ.

**جیاز:** لە (جهاز)ی عەرەبییەوە وەرگیراوە. کەلوپەلی نێردراو لەگەڵ بووکدا بۆ ماڵی زاوا.

## پیتی چ

**چاپوك:** گورجوگۆڵ، چالاك، چەلەنگ، تیژ.

**چارشێو:** سەرپۆش، بلامل، فۆتە.

**چاهەنی:** چاکی، باشی.

**چەرخنا:** چەرخاندی، سوورپێدا.

**چەخماخە:** بزیسکە، ئەستێ.

**چەردە:** کار، چار، هوول، هوولە، ڕەنگی پێست، ڕەشتاڵە، ئەسمەر.

**چەرکەس:** وڵاتێکە لە خۆرئاوای قەفقاز کە حەمدوڵڵای مستۆفی بە چەرکز یان چەرکستان ناوی بردووە، هۆزێکی سپیپێستن و لە قەراخی زەریای ڕەش و باکووری قەفقازدا دەژین.

**چەریدە:** ف. لەوەڕاو.

**چەم:** چار.

**چەمەرە:** شین و زاری، کۆستکەوتن، ئاوازێکی گریاناوییە.

**چەمەن:** چیمەن، مێرگ.

**چەنەم:** لێم.

**چەوگە:** لەوێ، لەو شوێنە.

**چنان:** بەو چەشنە، هەروەکو، ئاوەها، وا، وەها.

**چین چین:** لا لەسەر لا، جانەوەری خاڵدار، شتێك چین لەسەر چین دابنرێت.

**چین کەندە:** سافکردنی شوێنێك کە بەرزونزمیی زۆرە.

**چیهرە:** چار، ڕووخسار.

## پیتی ح

**حاجیبان:** ع. کۆی وشەی (حاجب)ە. ١. برۆکان، ٢. دەرکەوان، دەربان، ٣. لەمپەر، بەرگر، کۆسپ، بەرهەڵست، گەپل، ڕتم، دارەست.

**حاشییە:** ع. پەراوێز، لێوار لە خوارەوە، دەستوپێوەند، دارودەستە.

**حامل الاحکام:** ع. فەرمانڕەوای سەرزەمین.

**حامیلان:** ع. کۆی حاملە. هەڵگرەکان، هەڵگران، هێنەر کەسێك شت هەڵ بگرێت، چۆنێتیی پێبوون، ڕاگوێز.

**حەبس:** ع. زیندان، بەند، بەندیخانە، گرتووخانە.

**حەد:** ع. ١. سنوور، کەوشەن. ٢. ڕادە، پەرەسە، لان، لا، ئەندازە. ٣. جزیای گوناهێك کـە چـۆنیەتییەکەی دیاری کراوە.

**حەربە:** ع. ١. خەنجەری بچووك، ڕم، کەرەستەی شەڕ. ٢. بەهانە، بیانوو، بیانك.

**حەسار:** حەوشە، دیواری ماڵ، دەورە و داو، بەندی.

**حەساو:** ع. لە (حساب)ی عەرەبییەوە وەرگیراوە. ژماردن، قەبووڵ.

**حسب الحکم:** ع. بەپێی بڕیار، مەبەست لە بڕیارەکانی خودای گەورەیە.

**حور العین:** ع. ئافرەتانی بەهەشت، خودای گەورە لە قورئاندا بە (حور العین) ناویان دەبات.

**حوققە:** ع. ئاواز، فێڵباز، دەفری بچووکی ئاوخواردنەوە، جێگای داوودەرمان.

**حیلم:** ع. میهرەبانی، ئارام، لەسەرخۆیی، لێبوردن، دووربینی.

## پیتی خ

**خاپوور:** ڕمیاو، ڕووخاو، لەبەریەك هەڵوەشاو.

**خار:** دڕك، نووکی تیژی بەرد، شین و گریان، دڕوو، چقڵ، هەر بنەگیایەکی دڕکدار.

**خارا:** ف. ١. جۆرە کووتاڵێکی ئاورێشمیی ڕەقە، ٢. بۆ کار ئامـادەبوو. ٣. بـەردی زۆر سـەخت. ٤. بـەردی خارا، گرانێت.

**خاراج:** ع. کۆی وشەی (خرج)ە. باج و پیتاك، بەتاڵاندان.

**خارج:** ع. ١. دەرەوە، لاوەکی.

**خاسە:** ع. ١. چاکە، باشە. ٢. تایبەتمەندی، گەوشین. ٣. تایبەت، تایبەتی، گەوشت.

**خاستەر:** چاکتر، باشتر.

**خاڵ:** ع. نیشانە، ئەو نیشانەیە کە خۆی یا بە دەستکردنی مـرۆڤ لەسـەر بـەدەن و گیـانی مـرۆڤ بـەدیار دەکەوێت یان دروست دەکرێت، وەکو خاڵی چەناگە و خاڵی سەر لێو.

**خامۆش:** کوژانەوە، خەمۆش، کوژاوە، مەجازی: مردوو، مەردە.

**خاو:** هێواش، لەسەرخۆ، هێمن، پێچەوانەی کرژ.

**خاوە:** قەرەبووی مامەڵە، پەشیمانی، لقی تازە.

**خەتا:** تاوانبار.

**خەتم:** ع. ١. یەکجار خوێندنەوەی قورئان بە تەواوەتی، بەم کارە دەڵێن: خەتمی قورئان. ٢. دوایی، دمایی، تەواو، کۆتایی، پرسانە، پرسە، سەرەخۆشی.

**خەدەنگ:** ف. ١. تیر. ٢. دارێکی پتەو و گورخ کە تیر و ڕمی لێ دروست دەکەن. ٣. تیرێك کە لە چێوی ئەو دارە دروست کراوە. ٤. ڕسق، بانبانك، گیانەوەرێکە لە تیرەی سمۆرە و هەندێك بچووکترە. ٥. ڕاست و پتەو، ڕاست و ڕەختە، ڕێك.

**خەرقە:** ع. ١. بەرگ. ٢. کەڵپۆس، باڵاپۆشی، دەروێش.

**خەرمووره:** جۆرە مووروویەکی گەورەیە، لە قوڕ دروست دەکرێت.

**خەستە:** ف. ١. ماندوو، شەکەت، هیلاك. ٢. بێزار، ڕەنجاو، پەشێو.

**خەشم:** تووڕەیی، قار، ڕق، قەڵسی، غەزەب.

**خەمینان:** خەمباران.

**خەنە:** سوورمە، خەنەی دەستی ژنان، خەندە، پێکەنین.

**خەیات:** ع. بەرگدروو.

**خزر ڕەهدار:** خدری خاوەنڕێگا، مەبەست لە پێغەمبەر خدرە.

**خوتەن:** ناوچەیەکە لە تورکستانی سەروو.

**خوڕۆش:** هاوار، هەراوهووریا، قاڵ، قیڕە، ناڵەی بەرز، مەجازی: گرم، گرمە، نەعرەتە، هەرا و هەنگامە.

**خورد:** خواردن، خۆراك.

**خوردەگیر:** ف. ڕەخنەگر، بەهانەگر.

**خونکار:** خوێنڕێژ، پیاوکوژ، فەرمانڕەوای گەورە، پادشا.

**خیتاب:** ع. وتار، ڕووی دەم، ئاخاوتن لە هەمبەر یەکێکەوە.

**خیر الانام:** ع. مەبەست لە موحەممەد پێغەمبەرە د. خ.

**خیرەسەر:** ف. سەرلێشێواو، سەرکێش، ملنەدەر، شڵەژاو.

**خیلاف:** ع. پێچەوانە.

## پیتی د

**دابەشا:** دابەش، بەشکردن.

**دارەین:** کینایەیە بۆ دنیا و ئاخیرەت.

**داغما:** داغ بۆ دیاریکردن کە زیاتر لە نێو ئاژەڵداراندا باوە.

**دایە:** دایك، دایەن، دایان، دای.

**دەر:** دەرگا، بدە، فەرمانی چاوگی "دان".

**دەردین:** دەرداو، دەردەدار.

**دەرلاد:** دەستبەجێ.

**دەریچە:** ۱. دەرییچە، ڕۆچنە لە دەرگا و پەنجەرەدا. ۲. کوناوەجە، کوناوانجە.

**دەستاخ:** دوستاخ، بەندکراو، دیلکراو، بەندیخانە، بەند.

**دەستە:** کۆمەڵ.

**دەسگا:** دەزگا، دەستگا، ماك، کەسانێ کە بە هاوگری و هاوکاریی یەکتری بە یەکەوە کارێك یان کارگەیەك بەڕێوە دەبەن. دامودەزگا.

**دەسماڵ:** دەسڕ.

**دەماغ:** مێشك، لووت، زەوق، دەماخ.

**دەهەن:** ف. دەم، زار.

**دەهەندە:** ۱. بەخشندە، ئەوەی کە شتێك دەدات، یان دەبەخشێت.

**دەوەندە:** هەڵهاتوو، ڕاکەر، کەسێك کە خێرا ڕا دەکات.

**دەیجوور:** ع. شەوەزەنگ، تاریکەشەو، شەفتاری، شەوی تاریك و ئەنگوستەچاو.

**دڵپەرێش:** دڵپەرت، دڵشکاو، دڵ بۆ ئەو.

**دڵنەواز:** دڵلاوین، دڵداریدەر، دڵنەوا، دڵخۆشی دەرەوە.

**دۆش:** سەرشان، کۆڵ، شان، دوش، ناوشان، قەلاندۆش، ناوملان.

**دوود:** دووکەڵ.

**دێبا:** ۱. جۆرێك قوماشی ئاورێشم، قوماشی ئەورێشمی ڕەنگامە، گوڵدار. ۲. دێوا، دیوا.

**دێز:** ڕەنگی ڕەش، ڕەشی ئاماڵ بۆر.

**دیل:** ئەسیر، بەند.

**دێوبەند:** دوو وشەی لێکدراوە دێو+بەنـد. جـۆرە دوعایەکـە، بـۆ بـەرگیری لـە جـن و دێـو دەخوێنرێـت. بەدیلگرتنی دێو.

## پیتی ڕ

**ڕاس:** ڕاست.

**ڕاقیف:** ع. بەرز، ڕاوەستاو، بەرامبەر.

**ڕاگوزەر:** لێکدراوی دوو وشەی ڕاهـ + گوزەر، ڕێگەی هاتووچۆ.

**ڕاهان:** کۆی وشەی "ڕاهـ" ، ڕێگەکان.

**ڕاهدار:** پارێزەری ڕێگەوبان، ڕێگەوان، ڕێوان، ڕەخدار.

**ڕای نیهان:** لێکدراوی دوو وشەی ڕاهـ + نیهان، ڕێگای سڕی.

**ڕایی:** تێپەڕبوون بە ڕێگادا کەوتنە سەر ڕێگا بۆ ڕۆیشتن.

**ڕەجل:** ع. مەرد، پیاوی گەورە.

**ڕەدیف:** ع. سەربازی یەدەك، ئەو کەسەی لە دوای کەسـێکی تـرەوە سـواری وڵاخ دەبێـت، دوابـەدوای یـەك چنراو، ڕیز، لە پاڵ یەك، یان لە دووی یەك.

**ڕەسم:** ع. وێنە، ڕەوشت، نەریت.

**ڕەشید:** ع. لێهاتوو، پێگەیشتوو.

**ڕەشیدی:** ع. لێهاتوویی.

**ڕەعیەت:** ع. میللەت.

**ڕەفرەف:** ع. ناوی ئەو ئامرازەیە کە پێغەمبەر موحەممەد (د. خ.) کاتێك لە شەوی میعراجـدا لـە سـواری بوراق دابەزیوە، سواری بووە.

**ڕەفت:** ف. ڕۆیشت، چوو، ڕەوت، کار و ڕەوتی ڕۆیشتن.

**ڕەقەم:** ع. ژمارە، نووسراو.

**ڕەم کردن:** ١. ڕەو کردن، کۆچ کردن، تـۆران، ڕاکـردن، ڕاکردنـی بـە کۆمـەڵی ئـاژەڵی کێـوی. ٢. لادان، خۆلێلادان، بێزکردنەوە لە شتێك. ٣. ڕەوییای، بڕەوە، ڕەویان، ڕەوین.

**ڕەند:** زیرەك، وریا، جوان، شۆخ و شەنگ.

**رەها:** ١. بەرەڵڵا، ڕایی، ڕاهی، ویڵ، بێ چاودێر، بێسەرپەرشت. ٢. دەرباز، دەرباس. ٣. قوتار، ڕزگار.

**ڕەهزەن:** ڕێگر، جەردە.

**ڕەوا:** ١. بەجێ، شیاو، قەبووڵ، لەجێ. ٢. وەرگیراو، پەژیراو، پەسەندکراو.

**ڕەواق:** ع. ١. ڕەنگاڵ، ئەو شیلەیەی لەناو شانەی هەنگوین هەڵدەچۆڕێت. ٢. بەرهێوان، بەر هەیوان، باڵەخانە.

**ڕەوزەی ڕیزوان:** ع. باخچەیەکە لە باخچەکانی بەهەشت.

**ڕەونەق:** ع. جوانی، قۆوی، شۆخی، شەنگی.

**ڕۆم:** وڵاتی ڕۆمییەکان، ئاناتۆڵی.

**ڕۆمات:** کۆی وشەی ڕۆم.

**روح الامین:** ع. ئاماژەیە بە محەمەد پێغەمبەر، لە ناو کافرانیشدا بە مرۆڤێکی پاك و ڕاستگۆ زانراوە و گوتوویانە هەرگیز درۆ و خیانەتمان لێ نەدیوە.

**روکبە:** ع. ئەژنۆ، زرانی، چۆك، زەنگۆڵ.

**روکن:** ع. سەرسووچ، بەشێك لە بنچینەکانی دین.

**ڕومان:** ع. هەنار.

**ڕووشان:** برینداربوونی سەرچڵ، ڕوویان، ڕووی ئەوان، دیمەنی ئەوان.

**ڕووگەردان:** مەجازی: ڕوو وەرچەخێن، ڕوو وەرگێڕ.

**ڕییا:** ع. سوو، خستنەڕووی چاکە و باسکردنی بۆ خۆدەرخستن و بەگەورەزانین لەلای خەڵك.

**ڕێخ:** چەو، زیخ.

**ڕێزە:** پارچەپارچەبوو، وردە، ڕازاندنەوە، قەشەنگ، تۆزقاڵ، تۆسقاڵ، وردیلە، زۆر کەم.

**ڕێزی:** ١. ڕیزی، سەرە، یەك لە دوای یەك. ٢. وردی، وردیلەیی، بار یان چۆناوچۆنێتیی وردبوون. ٣. ڕێژی، ڕشتن.

**ڕێس:** ١. ڕستن. ٢. برس، ڕێسەر.

**ڕیسالە:** ع. پەیام، کتێبی نووسراوەی بچووك.

**ڕێش:** ١. بریندار، زامار، برین، زامدار، ئازراو، زەخمار، گەزنگاز.

